# دیمەنی مەرگ

## وە دوای مەرگ چی ڕوو دەدا

دانانی: محمد اسلام

وەرگێڕاوی بە کوردی:

محمد شەڵماشی

٢٠١٤ /هەولێر

# دیمەنی مەرگ

## وە دوای مەرگ چی ڕوو دەدا

دانانی: محمد اسلام

وەرگێڕاوی بە کوردی:

محمد شەڵماشی

# دیمەنی مەرگ


○ ناوی نووسەر : محمد اسلام

○ وەرگێڕانی : محمد شەڵماشی

○ پیاچونەوەی: ڕەئوف مەحمودی

○ تایپ: مەریوان مەنتك

○ دیزاینی ناوەوەوبەرگ: خەلیل هیدایەت مام شێخ ٤٩٢٤٢٦٣

○ نرخ: (٥٠٠٠) دینار

○ لە کتێبخانەی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (١٢١)ی سالّی ٢٠١٠دراوەتیّ

○ نۆرەی چاپ : چاپی دووەم

○ شوێنی چاپ : چاپخانەی ڕۆژهەلاّت-هەولێر ٤٦٢٩٥٣١

بەڕێوەبەری هونەری دەزگا

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾

پێشەکی دانەر:

## ئاگاداری

هەموو ستایشێك بۆ خواوەندێ کە بە هۆی مەرگەوە لە گەردەنی ستەمکارانو زاڵمە گەورەکانی داو، پشتی پاشایانی شکاندو، ئومێدی خاوەن گەنجینەکانی وەك بڵقی سەر ئاو لێ کرد. هەموو ئەوانە کەسانێ بوون کە تەنانەت باسی مردنیشیان پێ ناخۆش بوو، بەڵام کاتێ کە کاتی مردنیان هات، ئەوانی خستە چاڵەوە، لە کاخی سەر لە ئاسمانەوە بردنیە ژێر زەوی‌و، لەسەر دۆشەکی نەرم بۆ سەر خۆڵی گەرمو لەبەر کارەباو چراوە بۆ تاریکی قەبر.

ئەوانەی لەگەڵ غوڵامو کەنیزەکان خەریکی ڕابواردن بوون، درانە دەست کرمی ژێر خاكو خاك ئەوانی خواردو خاکی بەسەردا کردنو بە جێگای مەجلیس ئارایی دوچاری وەحشەتی تەنیایی بوون. ئایا لە ژووری ئەو خانووە قایمانەدا توانیان لەبەرامبەر مەرگدا دیفاع لە خۆیان بکەن؟ یان بۆ هەڵاتن ڕێگایەك بدۆزنەوە؟

کەواتە گەورەیی بۆ ئەو خوایە کە لە قەهرو غەزەبیدا کەس شەریکی نیەو ئەبەدی‌و بێ وێنەیە. جا چونکە هەموو کەس مردنی لە پێشەو دەبێ ببێتەوە بە خاكو هاوڕێی کرمی گۆڕو ڕووبەڕووی نەکیرو مونکەر بوەستێ‌و ماوەیەکی زۆر لە ژێر خاکدا وەمێنێ‌و ئینجا تەماشای دیمەنی وەحشەتناکی قیامەت بکاو لەبەر ئەوەی نازانێ کە داخۆ دەی بەن بۆ بەهەشت یان دۆزەخ، دەبێ هەمیشە یادی مردن بکاتەوەو ئاگای لە خۆی بێ.

## دیمەنی مەرگ

دۆستانم! ژیانی دنیا هەرچەند زۆریش بێ، ئاخری کۆتایی دێ‌و ڕۆژێك دێ لەدەست بچێ، بەلاَم ژیانی دواڕۆژ قەت دوایی نایەو نازو نیعمەتی ئەبەدی یە. جا ئەوەی تۆزێ عەقڵی بێ دەبێ لەو دوو شتە یەکیان هەڵبژێرێ، تا بتوانێ هەمیشە لەگەڵی بێ، بەلاَم زۆر بێ عەقلیەکەوە دوا شتی تەمەن کورت بکەوێ. جا چونکە پەردە بەسەر عەقڵماندا دراوە، چاومان بڕیوەتە ژووری چاوەڕوانی ئێستگای دنیاوە، هەرچەند مانەوەمان هەر ئەوەندەیە تا قەتاری مەرگ دێ‌و سوار دەبین‌و بەرەو مەقسەد دەکەوینە ڕێ.

جا لە فرسەتێکی وا کورتدا، ئەگەر ڕێبوار خەریکی پێویستی شتی سەفەرەکەی بێ کەلەوەتەنەکەی پێیان موحتاجە، ئەوە بە بێ شك قازانجیەتی، بەلاَم ئەگەر بە پێچەوانە، لەو کات‌و فرسەتەدا خەریکی گەڕان‌و کڕینی ئاوێنەو نەخشەی جوان بێ بۆ ژووری چاوەڕوانی ئیستگایەکەو شتەکانی کۆنەکاتەوە، ئەگەر قەتاری وەڕێ کەوت شتەکانیشی بەجێ دەمێنێ‌و ماڵەکەشی دەڕوا.

خوای تەعالا دەفەرمووێ: خاوەن ئیمانەکان! وریابن ماڵ‌و منداڵ‌و سەروەتی دنیا خواتان لەبیر نەباتەوە، ئەوەی لە خوا غافڵ بێ لە دوا ڕۆژ زەرەر دەکا. چاکە بەو ماڵەوە بکەن کە خوا داویەتی بە ئێوە، لە پێش ئەوەدا ئەجەلتان بێ‌و بڵێن: ئەی خوای ئێمە! بۆ چەند ڕۆژێکی دی مۆڵەتمان نادەیت تا چاکە بکەین‌و بە پیاو چاك لە قەڵەم بدرێین؟ لە کاتی وەختی ئەجەلدا خوا مۆڵەتی کەس ناداو ئاگای لە هەموو کردەوەیەکی ئێوەیە. عەلاَقەی زۆر بە ماڵ‌و منداڵەوە ئینسان لە خوا پەرستی دوور دەخاتەوە.

جا وریابە نەبادا لە ناکاوێك ماڵ‌و منداڵ لە دەست بدەی ئیمڕۆ تا فرسەت لە دەست دایە چیت پێ باشە بیکە، خۆت حازرو ئامادە بکە، چونکە نازانی داخۆ خۆشەویستەکەت کەی بانگت دەکا؟ ئەگەر خۆت بۆ مولاقات حازر نەکەیت‌و لەناکاو بانگت کا؟ چۆن دەتوانی گورج خۆت ئامادە بکەی؟ وریابە،

## دیمەنی مەرگ

نەبادە ئەو کاتە دەستە پاچە بکەوی‌و مولاقاتی خۆشەویستەکەت لەدەست بدەی .

دۆستان‌و گەوران و برایان! خوا ڕەحمتان پێ بکا. لەخەوی غەفڵەت ڕاپەڕن، لەپێش ئەوەدا بانگ بکرێ کە فلان کەس نەخۆش کەوت‌و حاڵی زۆر خراپەو کێ بە دکتوری باش دەزانی؟ بچن دکتورێکی ماهیری بۆ بێنن. دکتور بێننە سەری‌و ئومێدی چاك بوونەوەیان نەبێ‌و لە پاشان بڵێن: دەی هەوێ وەسیەت بکا، تەماشا زمانی لاڵ بووە، ئەوە نیە دەنگی بە باشی دەرنایە، ئێستا کەس بە باشی ناناسێ، هەناسەی سوار بووە، بە زەحمەت هەناسە هەڵدێنێتەوە، دەردەکەی گرانترەو بڕۆی تەپیون. لەو کاتەدایە کە تۆ هەست بە دوا ڕۆژی دەکەی، دەبینی زمانی لاڵ بووە، ناتوانێ قسە بکا، براو کەس‌و کاری لەسەر سەری ڕاوەستاون دەگرین.

جارێك کوڕەکەی‌و جارێك ژنەکەی دەچێتە پێشەوە بە بێ دەنگی، لەوکاتەدا وردە وردە ڕۆح لە ئەندامەکانی جیا دەبێتەوەو پەرواز دەکا بۆ ئاسمان‌و، ئەوانی لە دەورەنی دەکەونە پەلە، بۆ کفن‌و دفن‌و ئەوەی هاتبوو بۆ لای، لە دوای کەمێك گریان بێ دەنگ دەبن‌و دوژمنەکانی کەیف خۆش دەبن. زۆر ناخایەنێ میرات گرەکانی دەست دەکەن بە دابەش کردنی ماڵەکەیی‌و، ئەویش دوچاری جەزای کردەوەی خۆی دەبێ، جا ئەوەیە حەقیقەتی ژیانی ئینسان، بەڵام قەزیەی مەرگ زۆر موشکیلەیە، کەچی ئێمە زۆر لەمەرگ غافڵین‌و بە هۆی گرفتاری خۆمانەوە قەت یادی مەرگ ناکەینەوە، ئەگەر یادیشی بکەینەوە زۆر بە سادەیی یادی دەکەینەوە. جا زۆر پێویستە کە جارجار دانیشین‌و لە بەر خۆمانەوە بە باشی بیر لە مردن بکەینەوەو وا بزانین کە لە بەرامبەرمانەوە ڕاوەستاوە. جا بۆ ئەو مەبەستە دەبێ بیر لە کەس‌و کاری خۆمان‌و ئەو دۆست‌و برادەرانە بکەینەوە کە وەفاتیان

کردووەو چۆنمان کفنو دفن کردنو بە شانی خۆمان بردمانن تەسلیم بە خاکمان کردن.

وێنەی جوانو ڕوتبەو مەقامیان بێنینەوە بەر چاو، تەماشا بکەین چۆن خاك ڕەنگو ڕوخساری گۆڕیونو لاشەی لەبەر یەك بردوون، چۆن منداڵیان بوونەتە هەتیوو ژنیان بونەتە بێوە ژنو کەسو کاریان وەگریان خستووەو تەنیا ماڵ و بەرگو لیباسەکەیان بەجێ ماوە. دەبێ قەت ئەوە لە یاد نەکەین کە ڕۆژێك ئێمەش تووشی ئەو سەرنویشتە دەبین.

کاتێ ئەوان زیندووبوون چۆن لە مەجلیسی دۆستانیاندا قاقا پێ دەکەنینو ئێستا لەناو گۆڕدا چۆن بێ دەنگ ڕاکشاون. چۆن غەرقی خۆشی دنیا بوونو ئێستا بوونەوە بە خاك، چۆن مەرگیان فەرامۆش کردبوو ئیمڕۆ چۆن بەدوای مەرگەوە بوون، چۆن مەستی شەڕابی گەنجی بوونو ئیمڕۆ ئەندامەکانیان ڕزیون. مارو دووپشك زمانیان دەخواو لاشەیان بۆتە خۆراکی کرمان. چۆن قاقا پێ دەکەنینو ئێستا دانیان هەڵوەریون. چەند جوانیان بیر دەکردەوەو بۆ ژیانی خۆشی ساڵانی داهاتوویان چۆنیان هەوڵ دەدا، لە کاتێکدا کە مەرگ هەڕەشەی لێ دەکردن. ڕۆژی مەرگ نزیك بوو، بەڵام ئەوان نەیان دەزانی کە ئەوشۆ ئاخر شەوی ژیانیانە. حاڵی ئێمەش ڕاست وەك حاڵی ئەوانە.

ئێمەش ئیمڕۆ خەریکی وەدەست هێنانی پێویستی ژیانی ئایندەین، لە کاتێکدا نازانین کە بەیانی چ بەڵایەکمان بەسەر دێ؟ هیچ ئینسانێك ئاگای لە وەختی مردنی خۆی نیەو بۆ سەد ساڵی تر وەسائیلی تر ئامادەدەکا. لە کاتێکدا نازانێ تاوێکی دی چی ڕوو دەدا. جا ئێستا لەپێش دەست پێکردن بە خوێندنەوەی پوختەی تەرجەمەی کتێبی ((منظرە مرگ)) دوعا دەکەم کە خوای گەورە بە لووتفو کەرەمی خۆی، ئێمە کە هەمیشە غەرقی گوناە و خەریکی کاری دونیایین، یارمەتیمان بدا بۆ گەڕانەوە بۆ لای خۆیو

تۆفیقمان بدا بۆ نەفرەتو دووری لە تەماعی زۆری دنیاو لە بەڵاو موسیبەت بە دوورمان کاو ماڵو منداڵمان ساڵح کاو لە شەڕی شەیتانو بەڵای ناگەهان بمان پارێزێو نەبینە هۆی دڵ ئازاردانی کەسو بە موسڵمانی بژینو بە ئیمانەوە بمرینو عەمەل بە باسەکانی ئەو کتێبەمان بە نسیب بکا.

وصلى الله على سيدنا محمد واله وصحبه وسلم

موحتاجی دوعا خواجه محمد اسلام

## دەرسی یەکەم

### دیمەنی مەرگ

یەکێ لە هاوڕیکانی پێغەمبەر ﷺ دەڵی: جارێك حەزرەت ﷺ فەرمووی: پێت خۆشە حەقیقەتی دنیات نیشان بدەم؟ عەرزم کرد بەڵێ بفەرموو: بردمی بۆ دەرەوەی شاری (مەدینە) بۆ لای سەرانگوێلکێك کە پڕبوو لە کەللە سەری مردووان و پیسی و کەسافەتی زۆرو، لەتکە پەڕۆو ئێسقانە کەوتوو.

ئینجا فەررمووی: ئەوە کاسەی سەری کەسانێکە کە وەك زیندووەکانی ئێستا دوچاری تەماعی دنیا بوون. ئەوایش ئەو ئارەزووانەیان بوون کە ئێستا ئێوە لە دڵتان دان. کەچی ئیمڕۆ کاسەی سەریان بە ڕووتی کەوتووە، چەرمەکەی پێوە نەماوەو لە پاش چەند ڕۆژی تر دەبێتە خۆڵەمێش. ئەو کەسافەت و پیسیە، ئەو خواردەمەنیە ڕەنگاوڕەنگانەن کە ئەوان زۆر بە ئارەزووەوە دەیان خواردن، بەڵام ئێستا خەڵك لەبەر بۆگەنیان ڕادەکا، ئەو خواردنە تام خۆشەی کە لە دوورەوە خەڵکی بۆ لای خۆی ڕای دەکێشا، ئیمڕۆ خەڵك لەبەر بۆنی ناخۆشی ڕادەکا. ئەو پارچە پەڕۆیانە، ئەو بەرگ و لیباسە جوانانەن کە لەدوای ماوەیەك لەبەرکردن فڕێیان داون و ئیمڕۆ ((با)) بەملاو ئەولایاندا دەدا. ئەو ئێسقانانە ئێسقانی ئەو گیان لەبەرانەن کە سواریان دەبوون و فەخریان پێوەدەکردن. دەبێ بەچاو پێکەوتنی ئەو شتانەو بە بەسەرهاتی ئەوان پەندو عیبرەت وەرگرین و بۆخۆمان بگرین.

ئەو ئەسحابە دەفەرمووێ: بەچاو پێکەوتنی ئەو دیمەنە زۆر گریام لە حەدیسێکی دیدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: زاهیرەن دنیا زۆر سەوزو شیرینەو خوای گەورە ئێوەی کردووە بە جێ نشینی ڕابردووەکانتان، تابزانێ چۆن لە دنیادا ڕەفتار دەکەن. فەرمووی: کاتێ دەرگای سەرکەوتن

بەڕووی بەنی ئیسرائیلیەکان کرایەوە، شێتی جوانیو ئاشقی ژنانوماڵو سەروەت بوون خوایان لەبیر چووەوە. جا خۆشەویستەکانم! کەمێك بیربکەنەوەو تەماشا بکەن، ئایا ئیمڕۆ وەکو بەنی ئیسرائیلیەکان دوچاری داوی ژن پەرستی نەبووینو خوامان فەرامۆش نەکردووە.

## حیکایەتی کوڕی هارونە ڕەشید

هارونە ڕەشید کوڕێکی تەمەن شازدە ساڵانەی بوو، زۆر دەچوو بۆ مەجلسی زاهیدو پیاوچاکانو وەك ئەو کاتە باوبوو دەچۆ گۆڕستانو ڕووی دەکردە مردووەکانو دەی گوت: وەنەبێ ئێوە لەپیش ئێمەدا هەر لەدنیادا بووبن؟ بەڵکو ئێوە خاوەنی دنیا بوون، بەڵام لە دنیادا مۆڵەت نەدران کارەکانتان تەواو بکەنو هاتنە گۆڕستان. ئای خۆزگە دەم زانی چ بەڵایەکو بەسەر هاتووەو چیان لێ پرسیون؟ بەزۆری ئەو شیعرەی دەخوێندەوە کە دەڵێ: جەنازە هەموو ڕۆژێك دەم ترسێنێو بەدەنگی ئەو ئافرەتانە کە بۆ مردووان دەگرین غەمبار دەبم.

ڕۆژێك چووە مەجلیسی باوکی لە کاتێکدا کە هەموو وەزیرو ئەمیرەکان لە دەوری بوونو کوڕەکە لیباسی عادەتیو مێزەرێکی بە سەرەوەبوو. وەزیرو ئەمیرەکان لەبەینی خۆیان گوتیان: حەرەکاتی ناشرینی ئەو کوڕە شێتە ئەمیری موسوڵمانانی لە پێش چاوی پاشاکانی دنیا ناشیرین کردووەو ئەگەر تەنبێ بکرێ ڕەنگە ئەو وەزعە تەرك کا. کاتێ هارونە ڕەشید گوێی لەو قسەیە بوو، بە کوڕەکەی گوت: کوڕم! تۆ منت لە پێش چاوی خەڵك بچووك کردۆتەوە. کوڕەکە وەڵامی نەدایەوە، بەڵام ڕووی کردە ئەو باڵندە کە لەوێ بوو گوتی: تۆ ئەو خوایەی کە تۆی خەڵق کردووە، وەرە سەر دەستم وەنیشە. دەڵێ باڵندەکە هەڵفڕیو هات لەسەر دەستی نیشتەوە. گوتی باشە بچۆوە جێگای خۆت. چوەوە جێگاکەی. لە پاشان عەرزی بابی کرد گوتی: بابەگیان! ڕاستی ئەوەیە، ئەو پەیوەندیەی کە تۆ بە دنیاوە هەتە منی لە لای

خوا ڕیسوا کردووە. جالەبەر ئەوە دەمەویٚ کە لەتۆ جیاوەبم. ئەوەی گوتو هەستا هاتە دەرەوە. تەنیا وەڕیٚ کەوتو قورئانێکی پیٚ بوو. بەلاٚم لەو سەروبەندەدا دایکی ئەنگوستیلەیەکی بەنرخی دابوویە، تاهەر کاتیٚ پێویستی بە پارە بیٚ بیفرۆشیٚو خەرجیکا. کوڕەکە لە بەغداوە چوو بۆ (بەسرە) دەستی کرد بە کارکردن، بەلاٚم لەیەك حەفتەدا هەر ڕۆژی شەممە کاری دەکردو بەکرێی ئەوڕۆژە تا شەممەکەی دی رایدەبوارد، ڕۆژی حەوتەم دەچۆوەسەر کارو لە دانگێك زیاتر وەری نەدەگرتو بەو دانگە ڕای دەبوارد. ئەبوو عامیری بەسری دەفەرمووێ: دیواری خانووەکەم ڕوخابوو، هاتم وەستایەك پەیدا بکەم. تەماشام کرد کوڕێکی ڕووخۆش دانیشتووە قورئان دەخوێنیٚو زەمبیلەیەکی لە تەنیشت خۆی داناوە. گوتم: کوڕەکە کار دەکە؟ گوتی: بۆ کار ناکەم؟ ئینسان بۆیە هاتۆتە سەر دنیا کار بکا، بفەرموو چ ئەمرێکت هەیە؟ چ کارێکت لەمن دەویٚ؟ گوتم: دەمەویٚ کاری بەننایيم بۆ بکەی. گوتی: ئاخر من لە دانگێك زیاتر کریٚ وەرناگرمو لەکاتی نوێژیشدا کارناکەم، چونکە دەبیٚ بچم بۆ نوێژ، دەڵیٚ: هەردوو شەرتەکەم قبولٚ کردو بردم بۆسەر کارەکە. ئێوارە تەماشام کرد بەئەندازەی دە نەفەری کارکردووە. ویستم دوو درهەمی کریٚ بدەمیٚ، بەلاٚم لە حەقی خۆی زیاتری وەرنەگرت. دانگێکی وەرگرتو ڕۆیشت.

ڕۆژی دوای چووم زۆری لیٚ گەڕام نەم دیەوە. لە خەڵکم پرسی کە کوڕێکی لەو حاڵەو لەو ڕەنگە کارگەر بوو نازانن لە کوێیە؟ گوتیان: ئەو کوڕە هەر ڕۆژی شەممە کار دەکا،شەممە نەبی ناتوانی کە ببینی. دەڵیٚ: چونکە ئەو، ئەو کارە باشەی کردبوو، پێم خۆش بوو کارەکە هەر بەو بکەم. جا لەبەر ئەوە یەك حەفتە کارەکەم ڕاگرت. بەیانی ڕۆژی شەممە چووم قورئانی دەخوێند سەلامم کردو گوتم: کار دەکەی؟ دووبارە بەدوو شەرتەکەی پێشوو حازربوو کاربکاو منیش قبوڵم کردو هات دەستی کرد بە کار.

چونکە شەممەکەی پێشوو زۆرم لا عەجایب بوو کە بەقەد دە کەس کاری کردبوو، چووم خۆم لێ گرتو ویستم بە دزیەوە بزانم چۆن کاردەکا. تەماشام کرد ئەو هەر قورەکەی ڕوو دەکرد، بەردەکان بۆخۆیان جێگای خۆیان دەگرت. لێم یەقین بوو کە وەلی یە، چونکە هەر وەلی لە غەیبەوە یارمەتی دەدرێ. ئێوارە ویستم سێ درهەمی بدەمێ وەری نەگرتو گوتی: من چ لەو پارەیە بکەم؟ دانگێکی وەرگرتو ڕۆیشت؟

دووبارە حەفتەیەکی دی ڕاوەستامو شەممەیەکی دی چووم لەوێ نەبوو، پرسیارم کرد پیاوێك گوتی: ئەوە سێ ڕۆژە نەخۆشەو لەبن فلاّن دارا کەوتووە، شتێکم دا بەکابرا لەگەڵم بێ نیشانم بدا.

کاتێ کابرا بردمی تەماشام کرد بێ هۆش کەوتووەو خشتێکی لە ژێر سەری خۆی داناوە. سەلامم لێ کرد بێ هۆش بوو وەلاّمی نەدایەوە. دووبارە سەلامم کرد ئەو دەفعە چاوی هەڵێناو ناسیمی. سەرم لەسەر خشتەکە هەڵگرتو لەسەر ڕانی خۆم دانا. سەری واوە هێناو گوتی: دۆستی من! نازو نیعمەتی دنیا بە فریوت نەبا، تەمەن تەواو دەبیو ئەو هەموو نیعمەتە لەبەین دەچن، هەرکاتێ جەنازەیەکت بردە سەر قەبران وابیر بکەرەوە کە ڕۆژێکیش ئاوا جەنازەی تۆ هەڵدەگیرێ.

لە پاشان گوتی: ئەبوو عامیر! ئەگەر مردم بمشۆو لیباسەکەم بکە بە کفن. گوتم: عەزیزم! چ عەیبێکی هەیە بۆ کفنەکەت پارچەیەکی تازە بێنم؟ گوتی: هەقی زیندووان بە لیباسی تازەوە لە هی مردووان زۆرترە، کفن کۆن بێ یان تازە فەرق ناکا، چونکە هەردووکیان دەڕزن، تەنیا کردەوە دەمینێتەوە. گوتی: لەدوای ئەوەی کە مردم مێزەرەکەو ئەو ئافتاوەیە لەباتی کرێ بدە بە گۆڕهەڵکەنو ئەو قورئانو ئەنگوستیلەش بەرە بۆ هاڕوونە ڕەشیدو بڵێ: ئەوە کوڕێکی نەناسراو بە منی سپاردووە بە تۆیان بگەیەنمو بڵێ، دەی

## دیمەنی مەرگ

گوت: وریابێ مەبادا لە حاڵی غافڵەتدا دوچاری مەرگ ببێ. ئەوەی گوت‌و ڕوحی فڕی بۆ ئاسمان. ئەوکاتە زانیم کە ئەو کوڕە شازادە بوو.

لەپاش مردنی وەسیەتەکەم بەجێ گەیاندو مێزەرو ئافتاوەکەم دان بە گۆڕهەڵکەن‌و قورئان‌و ئەنگوستیلەکەشم بردن بۆ بەغدا. کاتێ لە کۆشکی هاڕونە ڕەشید نزیك بوومەوە لەشکر دەهاتە دەرەوە لە سەر سەکۆیەکی بڵند ڕاوەستام، لە پێشدا لەشکرێکی هەزار نەفەری هاتە دەرەوە. لەشکر لەدوای لەشکر هات تا دە دەستە هاتن‌و هاروونە ڕەشید لەگەڵ لەشکری ئاخری بوو.

هاوارم کرد گوتم: ئەی ئەمیری موسوڵمانان! تۆ ئەو خزمایەتیەی کەڵەگەڵ پێغەمبەرتدا هەیە تۆزێك ڕاوەستە، کە گوێی لە دەنگم بوو تەماشایەکی کردم‌و زوو چوومە پێشەوە عەرزم کرد قوربان! کوڕێکی نەناسراو وەسیەتی کرد کە ئەو دوو ئەمانەتیەت بە خزمەت بگەیێنم. کاتێ هاڕوونە ڕەشید چاوی بە قورئان‌و ئەنگوستیلەکە کەوت، هەناسەیەکی هەڵکێشاو سەری بەردایەوەو بێ ئیختیار فرمێسکی هەڵوەراندن. بە خزمەت چییەکی گوت: ئەو پیاوە لەگەڵ خۆت بەرەو کاتی گەڕانەوە کە داوام کرد بۆم بنێرە.کە گەڕایەوە بە خزمەت کارەکەی گوت: پەردەکان دادەوەو کابرام بۆ بێنە، هەرچەند بە چاوپێکەوتنی ناڕەحەت تر دەبم. ئەبوو عامیر دەڵێ: پەردەدار هات بۆ لام‌و گوتی: ئەمیری موسوڵمانان داوات دەکات‌و ئاگاداربە ئەمیر زۆر نا ڕەحەتە، لەباتی دەکەلیمە پێنج کەلیمە زیاتر مەڵێ، ئەوەی گوت‌و لەگەڵ خۆی بردمی بۆ لای ئەمیر، ئەمیر تەنیابوو گوتی: تۆزێك وەرە پێشەوە، چووم لە لای دانیشتم: گوتی: تۆ کوڕەکەم دەناسی؟ عەرزم کرد بەڵێ: قوربان دەم ناسی، گوتی: چی دەکرد؟ گوتم: بەننایی دەکرد. گوتی: تۆش کارت پێ دەکرد؟ گوتم: بەڵێ: قوربان. گوتی: لەوە نەدەترسای کە ئەو خزمی پێغەمبەر بوو؟ عەرزم کرد ئەی ئەمیری موسوڵمانان! یەکەم لە

بارەگای خواو دووەم لە جەنابت داوای عەفوو دەکەم، باوەڕ بفەرموو ئەوکاتە نەم دەزانی کێیە، لەپاش وەفاتی ناسیم، فەرمووی تۆ بەدەستی خۆت شتت؟ گوتم: بەڵێ قوربان. فەرمووی: دەستت بدە دەستم. دەستمی لەسەر سنگی داناو ئەو شیعرانەی خوێندەوە کە دەڵێ:

ڕێبوارێك کە لەدووری دڵم دەبێ بەئاوو فرمێسکم بە چاوان دێنە خواریێ. ئەوکەسەی کە مەنزڵی لەمن دوورە، بەڵام غەمی لەدڵم نزیکە. بێ گومان یادی مەرگ خۆشترین ژیان لە ئینسان ناخۆش دەکا. هەرچەندە وێنەی ئەو ڕێبوارە وەکو مانگ لەسەر لاشەی وابوو، بەڵام چووە ناوگۆڕەوە. لەپاشان بڕیاریدا کە بچێ بۆسەر گۆڕەکەی، ئەبوو عامیر لەخزمەتیدا هات، کاتێ گەیشتە سەر گۆڕەکەی ئەو شیعرانەی بە گریانەوە خوێندەوە کە دەڵێ:

ڕێبوارێکی قەت ناگەڕێیتەوە، حەیف بە منداڵی مەرگ تۆی بە پەلە ڕفاند، ئای کە تۆ نوری چاوو خۆشی دڵم بووی. تۆ جامی شەڕابی مەرگت وەها نۆشی، نەك هەرباوکە پیرەکەت، بەڵکو هیچ شارستانیو جەنگەڵییێکی تر ئاوای نانۆشێ. کەواتە حەمد بۆ خوای تاکو تەنیا، ئەوە هەمووی بە ئیرادەی ئەوە.

ئەبوو عامیر دەڵێ: شەوی دووایی لەپاش نوێژی خەوتنان تازە خەوم لێ کەوتبوو، لەخەومدا چاوم بە گومەزێك کەوت بە هەرچوار دەوری خۆیدا نووری دەهاوێشت لەناو ئەو هەورە نوورانیانەدا کوڕەکە بانگی کردمو گوتی: ئەبوو عامیر! خوا پاداشتی بەخێرت بداتەوە لە جەزای ئەو کفنو دفنو وەسیەت بەجێ هێنانەی مندا، دەڵێ: لێم پرسی گوتم: عەزیزم:! چت بەسەر هات؟ گوتی: من هاتوومەتە خزمەت ئاغایەك زۆر میهرەبانەو زۆرم لێ ڕازییەو ، ئەوەی داویەتی بەمن تا ئێستا نەکەس دیویەتی نە بە خەیاڵدا هاتووە. جا بینا لەسەر ڕیوایەتی (عبداللە)ی کوری مەسعود ﷺ لە

تەوراتدا هاتووە کە خوای تەعالا بۆ ئەو کەسانە کە بەشەو خەریکی خوا پەرستین شتیوای ئامادەکردووە کە تا ئێستا چاو شتی وای نەدیووەو گوێ نەی بیستووەو بە خەیاڵی کەسدا نەهاتووەو نە مەلائیکەی نزیك لە خوا، نە پێغەمبەران پێیان نەزانیوە. لە قورئانیشدا ئەوە وایە. لە سورەی (سجدە)دا دەفەرمووێ ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾ السجدة: ١٧ هیچ نەفسێك نازانێ لە خەزانەی غەیبی خوا چی بۆ دانراوە.

لەپاشان کورەکە گوتی: خوای تەعالا سوێندی خواردەوەو فەرموویەتی: هەر کەسێك وەك تۆ دنیا بەجێ بێڵێ، چیم داوە بەتۆ دەیدەم بەویش. خاوەنی کتێبی (روض) دەڵێ: لە ڕێگایەکی تریشەوە ئەو حیکایەتەم پێ گەیوە، لەوێدا ئەوەش دەڵێ: دەڵێ یەکێك لەبارەی ئەو کورەیەوە لە هاروونە ڕەشیدی پرسی، هاروونە ڕەشید گوتی: لە پێش ئەوەدا کە ببمە خەلیفە ئەو کورە لە دایك ببوو، زۆر بە ئەدەب بوو قورئان و عیلمەکانی خوێندبوو، کاتێ من بووم بە خەلیفە منی بەجێ هێشت و ڕۆیشت لە خۆشی دنیای من هیچی بە نسیب نەبوو، لە کاتی ڕۆیشتنیدا من بە دایکیم گوت: ئەو ئەنگوستیلەیەی بداتێ، یاقووتەکەی زۆر بە قیمەت بوو، بەلام ئەویشی خەرج نەکردو بۆ منی ناردۆتەوە، ئەو کورە زۆر گوێ ڕایەڵی دایکی بوو.

## دەرسی دووەم
## فەرمایشتی پێغەمبەر لەبارەی مەرگەوە

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ئەوکەسە عاقڵە کەجڵەوی نەفسی بەرنەداو خەریکی ئەوکارانە بێ کە لە پاش مردنی سوودیان لێ بکا. چونکە ئەوەی بە زۆری خەریکی دنیا بێ مردنی لە بیر دەچێتەوەو لەو بارەشەوە خوای گەورە لە سورەتی (جمعه)دا فەرموویەتی: بەوکەسانە بڵێن، کە لە مەرگ ڕادەکەن و لە بیر خۆی دەبەنەوە، مەرگ غافڵ گیریان دەکا، ئەو کاتەی دەتان بەن بۆ لای ئەو خوایە کە ئاگای لە هەموو ئاشکرا و پەنهانێکەو ئەوەی کردووتانە بە چاوتاندا دەداتەوە.

عولەمای دین فەرموویانە: خەڵك لەبارەی مەرگدا دەبن بە چوار تاقم. تاقمێکیان خەریکی ڕابواردن و لەززەتی دنیان و باسی مردنیان زۆر پێ ناخۆشە، چونکە لەوە دەترسن بە باسی مردن ئەو خۆشییە لەدەست بدەن. قەت یادی مردن ناکەنەوە، ئەگەر یادیشی بکەنەوە بە خەراپی باسی دەکەن، چونکە خەیاڵی لە دەست دانی دنیا ناڕەحتیان دەکا.

تاقمی دووەم یادی خوا دەکەنەوە، بەڵام لە پلەی سەرەتایی دان. بەیادی مەرگ لە خوا دەترسن بە لە خوا ترسانەکەیان تۆبە دەکەن. لە مەرگ دەترسن بەڵام لەبەر ئەوەنا کە دنیایان لەکیس دەچێ، بەڵکو لەبەر ئەوەی کەباش دانەمەزراون، پێیان خۆش نیە زوو بمرن تا بتوانن حاڵی خۆیان باشتر بکەن. ئەوانە ئەگەر مردنیشیان پێ خۆش بێ قەیدێ ناکا.وەبەر ئەو کۆمەڵە ناکەون

کە پێغەمبەر ﷺ لەبارەی ئەواندا فەرموویەتی: ئەوەی مولاقاتی خوای پێ خۆش نەبێ خواش مولاقاتی ئەوی پێ خۆش نیە. ئەو تاقمە مولاقاتی خوایان پێ ناخۆش نیە، بەڵکو لەبەر کەمی کردەوەی چاکیان لە خوا

دەترسن. وەکو کەسێك وان کە لە پێش مولاقات لەگەڵ دۆستەکەیدا دەی هەوێ خۆی ئامادەبکا تا دڵی خۆشەویستەکەی وەدەست بێنێ. بەڵێ: پێویستە بۆ گەیشتن بە خۆشەویست هەمیشە خەریکی خۆ ئامادەکردن بن. دەنا وەك تاقمی یەکەم غەرقی دنیا پەرستی دەبن.

تاقمی سێیەم خوا دەناسن و تەوبەیان قایمەو مردنیان پێ خۆشەو لە تاوانی دەمرن، چونکە دەزانن کاتی مولاقات لەگەڵ خۆشەویستەکەیان لەهەموو کاتێ خۆشترە. وەکو عاشقێك کە قەت وەعدەی ویسال فەرامۆش ناکا. ئەو تاقمە هەمیشە چاوەڕوانی مەرگن و پێیان ناخۆشە درەنگ بمرن، بۆ ئەوەی زوو لەو (دارالمحنت)ە ڕزگاربن. بە ڕیوایەتێك دەڵێن: کاتێ(حذیفە)ی یەمانی ﵁ لە حاڵی گیان کێشاندا بوو فەرمووی: خۆشەویست کاتێ هات کە زۆرم کار پێ بوو، ئەوەی لە مولاقاتی خۆشەویستی پەشێمان وە بە ئارەزووی خۆی ناگا. ئەی خوایە! تۆ دەزانی کە من هەمیشە دەست کورتی لە دەوڵەمەندی و نەخۆشی لە سەلامەتی و مردنم لە ژیان پێ خۆشتر بووە، کەواتە با زوو بمرم تا زووتر بە خزمەتت بگەم.

تاقمی چوارەم کە لە هەمووان باشترن، ئەو کەسانەن کە لە بەرامبەر ڕەزای خوا هیچ داوایەکیان نیەو بە ئارەزووی خۆیان نە مەرگیان خۆش دەوێ، نە ئارەزووی ژیانیشیان هەیەو، بەو پەڕی عیشقەوە باوەشیان بۆ تەسلیم و ڕەزا گرتوەتەوە. خولاسە یادی مەرگ هۆی ئەجرو سەوابە، چونکە ئەوەی خەریکی دنیاش بێ، بەیادی مەرگ تۆزێ لە دنیا پەرستی سڵ دەکاتەوە. جا لەبەر ئەوەیە کە حەزرەت ﷺ فەرموویەتی: یادی مەرگ بکەنەوە، چونکە ترسی مەرگ مانعی لەززەتی دنیایەو بە یادی مەرگ خۆشی دنیا لە دڵی خۆتاندا کەمەوە کەن تا بگەڕێنەوە بۆ لای خوا. لە حەدیسێکی دی دا فەرموویەتی: ئەگەر گیانداران بەقەد ئێوە لەبارەی مەرگەوە ئاگادار بوونایە،

زۆر کز دەبوون و حەیوانێکی قەڵەوتان بۆ سەربڕین و خواردن دەست نەدەکەوت. حەزرەتی عایشە(رضی الله عنها) لە پێغەمبەری ﷺ پرسی گوتی: ئایا کەس هەیە بێ ئەوەی گیانی خۆی لە ڕێگای خواوە ببەخشێ بچێتە ڕێزی شەهیدانەوە؟ حەزرەت ﷺ فەرمووی: بەڵێ: هەر کەسێك لە شەوو ڕۆژێکدا بیست جار یادی مەرگ بکاتەوە دەتوانێ داخڵی ڕیزی شەهیدان بێ.

سەبەب و هۆی ئەو هەموو گەورەیی باسی مردنەش ئەوەیە کە زۆری باسی مەرگ بێ عەلاقەیی ئینسان بە دنیا نیشان دەداو خۆی بۆ دوا ڕۆژ ئامادە دەکا. بەڵام یاد نەکردنەوەی مەرگ ئینسان غەرقی ڕابواردنی دنیا دەکا.

عەتای خوراسانی دەڵێ: جارێك پێغەمبەر ﷺ بە لای کۆمەڵێکدا ڕۆیشت بە دەنگی بەرز پێ دەکەنین. حەزرەت ﷺ فەرمووی: لە دانیشتنەکانتاندا دەبێ باسی ئەو شتەش بکەن کە خۆشیتان لێ تاڵ دەکا. عەرزیان کرد ئەی ڕەسوڵی خوا! ئەوەی خۆشیان تاڵ دەکا چییە؟ فەرمووی: مەرگە.

فەرمووی: ئەگەر بتان زانیبایە لە دوای مەرگ چتان بەسەر دێ، نەقەد خواردنتان بە ئارەزوو دەخوارد، نە قەد لەززەتان لە ئاو خواردنەوە دەکرد. ڕووی کردە ئەسحابەیەك و فەرمووی: زۆر یادی مەرگ بکەوە تا عەلاقەت بە شتی ترەوە کەمەوەبێ. لە حەدیسێکی تردا دەفەرمووێ: یادی مردن لە یاد مەکەن، چونکە ئەوەی یادی مردن زۆر بکاتەوە دڵی زیندووەو مەرگی ئاسان دەبێ. یەکێ لە ئەسحاب عەرزی کرد ئەی ڕەسوڵی خوا! من مەرگم خۆش ناوێ چی بکەم؟ حەرزەت ﷺ فەرمووی: هیچ سەروەتێکت هەیە؟ گوتی: بەڵێ: هەمە. فەرمووی: لە پێش خۆتدا بەڕێی بکە واتە لە ڕێگەی خوا

خەرجی بکە، چونکە بەهۆی سەروەتەوە ئینسان دڵ بە دنیا دەبەستێ، ئەگەر لە پێش خۆیدا بەرێی بکا پێی خۆش دەبێ وەدوای بکەوێ. بەڵام تا سەروەتەکەی وەمێنێ پێی خۆشە هەر لە لای بێ. لە ڕیوایەتێکدا هاتووە کاتێ شەو درەنگ دەبوو حەزرەت ﷺ دەی فەرموو: خەڵکینە! یادی خوا بکەنەوە، چونکە نزیکە سووری ئیسرافیل دەنگی لێوە بێ و زەلزەلەی ڕۆژی قیامەت ڕوو بداو لەگەڵ ئەو هەموو بەدبەختیە مەرگ بگاتە سەرتان.

عومەری کوڕی (عەبدولعزیز) ﵁ عادەتی وابوو هەموو شەوێك زانای بانگ دەکردن باسی مەرگ و قیامەت بکەن، دەستی دەکرد بە گریانێك دەتگوت جەنازەی لەپێش چاو دانراوە ئیبراهیمی تەمیمی ﵁ دەڵێ: دوو شت منی لە هەموو خۆشییەکی دنیا کردووە، یەکیان مەرگەو ئەویتریان ترسی بە خزمەت خوا گەیشتنە لە ڕۆژی قیامەتدا. حەزرەتی کەعب ﵁ دەفەرمووێ: ئەوەی مەرگ بناسێ هەموو موسیبەتێکی بەلاوە ئاسان دەبێ. ((اشعث)) ﵁ دەڵێ: هەرکاتێ بە خزمەت حەسەنی بەسری ﵁ دەگەیشتین باسی دوا ڕۆژو دۆزەخی دەکرد. ئافرەتێك هاتە خزمەتی حەزرەتی عایشە شکایەتی لە دڵ ڕەقی و بەدبەختی خۆی کرد حەزرەتی عایشە فەرمووی: تا زۆرتر یادی مەرگ بکەیتەوە دڵت نەرمتر دەبێ. لە پاش ماوەیەك ئافرەتەکە هاتەوە خزمەت حەزرەتی عایشەو زۆر سوپاس گوزاری کردو گوتی: بەهۆی یادی مەرگەوە ئەو دڵ ڕەقی یەم نەماوە.

## فەرمانی خوا لەبارەی مەرگی ئینساندا

خوای گەورە لە شەوێك لە شەوەكانی ساڵدا جا شەوی بەرات بێ، یا شەوی ((لیلە القدر)) بێ، دەستوور دەدا بە مەلائیکەی ئاسمانەكان بە هەرچی لەو ساڵەدا ڕوویدا، بە تایبەتی لیستی ئەوكەسانە كە لەو ساڵەدا دەمرن یا لە دایك دەبن. زۆری وایە خەریكی ئیشو كاری خۆیەتیو ئاگای لەوە نیە لە ئاسمانەوە حوكمی گرتنی یا مردنو ئیعدام كردنی دەرچووەو بە واسیتەش ناتوانێ دەقیقەیەكی لێ زیادو كەم بكا.

((ابن عباس)) رضي الله عنه لە تەفسیری سورەی ((دخان)) دا فەرموویەتی: هەرچی لەوساڵەدا ڕوویدا لە شەوی((لیلەالقدر)) دا لە ((لوح المحفوظ)ە وەنەقڵ دەكرێ، كە فلانی كوڕی فلان ئەوساڵ ڕزقی ئەوەندەیە، فلان كەس لەوەندەی ساڵدا دەمرێ، لە فلان كاتدا فلان منداڵ لە دایك دەبێ، ئەوەندە باران دەبارێ، فلان كەس دەچێ بۆ حەج. ((ابن عباس)) لە ڕیوایەتێكی دیدا دەڵێ: تۆ ئینسانی وادەبینی كە لە بازاڕدا دێتو دەچێ، ناویشی لە لیستی مردووانی ئەوساڵەدایە.

ئەبو نەضر دەڵێ: لەو شەوەدا هەموو كارێكی ئەو ساڵە تەسلیم بە مەلائیكەتەكان دەكرێ، چاكەو خراپە، ڕۆزیو مەرگ، هەرزانیو گرانی.

عەكرمە رضي الله عنه دەڵێ: لەشەوی بەراتدا هەموو كارو فرمانی ئەوساڵە دیاری دەكرێو زیاد وكەمی تێدا ناكرێ. لە حەدیسێكی كەدا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: لە یەكی مانگی شەعبانەوە تا شەعبانێكی تر مەرگی تەواوی ئەو كەسانەی كە قرار وابێ لەو ساڵەدا بمرن دیاری دەكرێ، تەنانەت جاری وا هەیە یەكێ خەریكی ژن هێنانە، یا ئافرەتێ خەریكی شوو كردنە، یا منداڵ بوونە، كەچی لە ئاسمانەكان ناوی لە لیستی مردووەكاندایە.

## دیمەنی مەرگ

حـەزرەتی عایـشە رضـی اللە عنهـا دەفـەرمووێ: پێغەمبـەر ﷺ لـە مـانگی شەعباندا زۆر بە ڕۆژوو دەبوو، لەبەر ئەوەی لەو مانگەدا ئەوەی لەو ساڵەدا بمرێ دیاری دەکرێ. جاری وایە ئیواهەیە تازە خـەریکی ژن هێنانە، یا خۆ ئامـادەکردن بـۆ حەجەو نـاوی لە لیستی مردووانـدا نووسـراوە. حـەزرەتی عایشە دەفەرمووێ: عەرزم کرد بۆ لەو مانگەدا زۆر بەڕۆژو دەبی؟ فەرمووی: لەومانگەدا ناوی مردووی ئەوساڵە دەنووسرێ جا پێم خۆشـە لەوکاتـەدا کـە ناوم دەنووسرێ بەڕۆژووبم. دووبـارە بە ڕیوایـەتێك دەڵێن لە شـەوی نیوەی شـەعباندا خـوای تـەعالا نـاوی ئـەو کەسـانەی لـەو ساڵەدا دەمـرن دەدا بـە ئیزرائیل.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر ڕۆژێك ڕۆژ هەڵدێ بە زمانی حاڵ دەڵێ: هەر خێرێك كەدەتان هەوێ بیکەن بیکەن، چونکە تازە ئەو ڕۆژە ناگەڕێتـەوە. دوو فریشتە لە ئاسمان بانگ دەکەن. یەکیان دەڵێ: ئەی ئەو کەسـەی ڕووت لـە خێرە مژدانەمان بدەیەو بڕۆ بۆ پێشەوە. ئەوی تریان دەڵێ: ئەی ئەو کەسـەی کە ڕووت لە خراپەیە دەست هەڵگرەو خۆت بە هیلاك مەدە. دووانـی تـر بانگ دەکەن، یەکیان دەڵێ: ئـەی خـوای گـەورە! ئـەوەی لە ڕێگـای تـۆدا خێـر دەکا پاداشتی بدەوەو ئەوەی تر دەڵێ: ئەی خوای گەورە! ئەوەی سەروەتەکەی لە ڕێگای تۆدا خەرج ناکا فەقیری بکە.

ئیمـامی غـەزالی ﵁ دەفـەرمووێ: ئەگـەر ئینـسانێکی فـەقیر قـەت تووشـی ئافـەتێك، موسـیبەتێك، ڕەنجێـك، دەردوبەلایـەك، نەخۆشـی و بریندارییـەك، تـرس و لـەرزێك نـەبووبێ، دووبـارە ناخۆشـی مـەرگ و تـرس و گیـان کێـشان، شتێکە کـە هـەموو خۆشیەك لـە بیر دەباتـەوەو، دەبـێ خـۆی بـۆ ئامـادە بکـا، بەتایبەتی کە نازانێ کـەی دەگاتـە سـەرت؟ حـەکیمێك گوتوویەتی: جڵـەومان بەدەسـت یـەکی تـرە، نازانـدرێ کـەی ڕای دەکێـشێ؟ لووقمـانی حـەکیم بـە

## دیمەنی مەرگ

کوڕەکەی گوت: کاتی مەرگ نادیاریە، لە پێش ئەوەدا بێ غافڵ گیرت کا خۆت بۆ بەخێرهاتنی ئامادە بکە. ئەگەر یەکێك لە کۆڕێکی ڕابواردنی خۆشدا خەبەری پێ بدەن کە پیاوی حکومەت بەدوایدا دەگەڕێ و لەسەر کردەوەیەکی خراپی پێنج قامچی لێ دەدا خۆشیەکەی لێ تاڵ دەبێ. یا ئەگەر هەر ئەوەندە بزانێ کە ئەمری گرتنی ئەوی پێیەو لە ماوەی یەك دوو ڕۆژی تردا دەی گرێ، خۆشی لا نامێنێ و خەوی لێ حەرام دەبێ. بەڵام زۆر جێگای سەرسوڕمانە کە ئەو کەسە دەزانێ ئیزڕائیل بەرەنگاری دەبێ و ئەزیەتی گیان کێشان هەزار ئەوەندەی قامچی پیاوی حوکومەت ناخۆشترە، کەچی قەد یادی ناکاتەوە، ئایا ئەوە ئەو پەڕی جەهل و تەکەبوور نیە؟

حەقیقەت ئەوەیە کە ئەو کەسە دەزانێ گیاندان چەند ناخۆشە کە ڕووبەڕووی دەبێ، کەسی تر ناتوانێ هەستی پێ بکا، دیارە بە چاو لێ بوونی گیاندانی یەکی تر تا ئەندازەیەك دەزانی چەند ناخۆشە. چەرمێك کە گیانی تێدا نەبێ بیبڕی ئازاری نیە، بەڵام ئەگەر زیندووبێ بیبڕی، یا سوژنێکی تێ ڕۆکەی ئەزیەتی زۆر دەبێ، کەواتە دیارە ئەو ئەندامەی کە بریندار دەبێ، یا دەسوتێ، یا دەی بڕن، لەبەر ئەوەیە هەموو گیانی ئینسان دەخاتە ژانەوە کە پەیوەندی بە لەشەوەیە و لەشیش عەلاقەی بە گیانەوەیە. جا لەبەر ئەوەی ئەو ئەندامە عەلاقەی بە ئەندامەکانی ترەوە هەیە، ڕۆح عەزابی پێ دەگا چونکە هەر ئەندامەی بەشێکی لە ڕۆح تێدایە جا بزانە کە ئەندامێك تووشی ئەزیەت دەبێ لەبەر ئەوەی کەمێکی لە ڕۆح تێدایە ڕۆح چەند نارەحەت دەبێ، ئەی ئەگەر ڕۆح بە هۆی مردنەوەلە تەواوی ئەندامەکان لە ڕەگ و ڕیشە بێتە دەرێ ئەزیەتی چەند دەبێ؟ پەنا بە خوا!

ڕۆح لەبەر ئەندامێك بچێتە دەرێ ئەو ئەندامە سارد دەبێتەوە، بۆیە لەپێش هەموو ئەندامێکدا قاچەکانی سارد دەبنەوە، چونکە گیان کێشان لەوێوە دەست پێ دەکا و لە دەمەوە تەواو دەبێ و کاتێ گەیشتە قوڕگ چاوی

نابینن. جا لەبەر ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ لە دوعایەکدا دەفەرمووێ: ئەی خوایە! گیان کێشانم ئاسان بکە. وەهەر لەبەر ئەوەیە ئەنبیاو ئەولیای گەورە زۆر لە مەرگ ترساون.

حەزرەتی عیسا علیە سلام بە حەواریەکانی گوت: لە بارەگای خوا بۆم وەپارێن گیانم ئاسان بکێشێ، چونکە ترسی مەرگ منی نزیك کردۆتەوە، دەڵێن: کۆمەڵێك لە زاهیدەکانی بەنی ئیسرائیل تووشی گۆڕستانێك بوون گوتیان: با لەبەر خوا وەپارێین یەکێك لەو مردووانەمان بۆ زیندووە کا تا پرسیاری لێ بکەین داخۆ کاتی مردن چی بەسەر هاتووە؟ دوعایان کردو یەکێك زیندوو بووەوە ناوچەوانی نیشانەی سوجدەی زۆر پێوەبوو گوتی: چیم لێ دەپرسن؟ ئەوە پەنجاساڵە مردوم ئێستاش هەست بە ئەزیەتی گیانکێشان دەکەم.

جارێك حەزرەتی عەلی ﵁ خەڵکی هەڵدەنا بۆ غەزا فەرمووی: ئەگەر لە غەزا شەهید بن لە ماڵەوە بمرن سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە، ئازاری مەرگ لە ئازاری هەزار برینی شیر ناخۆشترە

ئەوزاعی دەفەرمووێ: بیستومانە کە مردوو تا ڕۆژی حەشر هەست بە ئەزیەتی گیان کێشان دەکا.

شەددادی کوڕی ئەوس ﵁ دەڵێ: نا ڕەحەتی مەرگ لە ناڕەحەتی تەواوی دنیاو قیامەت ناخۆشترە، لەوە ناخۆشترە بە موشار دات بێنن، یان بە مقاست ئەندامێکت ببڕن، یا لەناو مەنجەڵێکدا بتکوڵێنن. ئەگەر مردووێك زیندوو بکرایەوەو باسی گیان کێشانی بکردایە کەس بە خۆشی نەدەژیاو کەس بە خەیاڵی ڕاحەت نەدەنووست. دەڵێن: کاتێ حەزرەتی مووسا علیە سلام وەفاتی فەرموو خوای گەورە فەرمووی: مردن چۆن بوو؟ عەرزی کرد

ئـەی خـوای گـەورە! وام دەزانـی چـۆلەکەیەك بـە زینـدوویی لـەناو ئـاگردا دەبـرژێنن، نـە گیانیـشی دەردەچـێ‌و نـە دەتـوانێ بفـڕێ. بـە ڕیوایـەتیکی تـر دەڵێن: وەك پێستی مەڕێك بە زیندووی داڕنن لام وابوو.

حەزرەتی عایشە رضی الله عنها دەفەرمووێ: لەکاتی وەفاتیدا حەزرەت ﷺ کاسە ئاوێکیـان لـە لای دانـابوو دەسـتی موبـارەکی دەخـستە نـاو ئاوەکـەو بەسـەر ڕووی خۆیـدا دێنـاو دەیفـەرموو خوایـە لـە ناڕەحـەتی گیـان کێـشاندا یارمەتیم بدە. حەزرەتی عومەر رضي الله عنه بە کەعبی گوت: باسـی مـەرگم بـۆ بکـە، عەرزی کرد قوربان! ئەگەر دارێکی دڕکاوی لە ئینسان ڕۆکەن‌و ڕای کێشنەوە چەندی ئەزیەت هەیە، ئەزیـەتی گیـان کێشان لـەوە زیـاترە. تـا ئێـرە باسـی بەندی گیان کێشان بوو.

## دیمەنی مەرگ

### دەرسی سێهەم:

ئینجا باسی بەندی دووەم دەکەین کە چاو پێکەوتنی ئیزڕائیلو دارو دەستەکەیەتی. کاتێ مەلائیکەی قابیزی ئەرواح دەچن گیانی کافر و گوناهکارێک بکێشن خۆیان دەبەنە سەر شکڵ وێنەیەکی وا سامناك ئازاترین ئینسان خۆی بۆ تەماشایان ڕاناگرێ.

دەڵێن حەزرەتی ئیبراهیم علیە سلام بە ئیزڕائیلی گوت: بەوشکلەوە کە گیانی بەدکارانی پێ دەکێشی خۆتم نیشانبدە. عەرزی کرد قوربان! خۆت بۆ ڕاناگیرێ، فەرمووی: خۆم ڕادەگرم. ئیزڕائیل گوتی: زۆرباشە ڕووی خۆت وەرگێڕە. حەزرەتی ئیبراهیم ڕووی لەولاوە کرد، لە پاشان ئیزڕائیل گوتی بڕوانە. حەزرەتی ئیبراهیم تەماشای کرد زەلامێکی ڕەشی لیباس تۆزاوی دەتگوت دێوە لە بەردەمی ڕاوەستاوە، مووی لەشی لە لیباسەکەی ڕاهاتوونەتە دەرێو بۆنی دەمی زۆر ناخۆشەو، بڵێسەی ئاگری لە کونە لووتان دەردەپەڕێ . بەچاو پێکەوتنی بێ هۆش کەوت، لە پاشان کە وەهۆش هاتەوە ئیزڕائیل هاتبووەوە سەر شکڵی خۆی. حەزرەتی ئیبراهیم فەرمووی: بۆ پیاوی خراپ چاوپێکەوتنی ئیزڕائیل بەو شکڵە بەسە بۆمردنی بەڵام بە پێچەوانەی پیاو خراپان، کاتێ حەزرەتی ئیبراهیم گوتی: ئەی بە چ شکڵێك گیانی پیاو چاکان دەکێشی؟ گوتی: ڕوو وەرگێڕە، کە ئاوڕی دایەوە تەماشای کرد کوڕێکی گەنجی جوانی لیباس پاكو خاوێن ڕاوەستاوە، کە چاوی پێکەوت فەرمووی: ئەگەر پیاوی موسڵمان لە کاتی سەرەمەرگدا هیچی دڵ خۆشکەر نەبینێ چاو پێکەوتنی ئیزڕائیلی لەسەر ئەو شکڵە جوانە بەسە بۆ دڵخۆشی.

## بەسەرهاتی پاشایەك

ڕۆژێـك پاشـایەك ویـستی سـەرێك لـە ولأتەكـەی بـدات و بزانـێ حـاڵی ڕەعیەتەكانی چۆنە. بەرگی پاشایەتی داواكرد دەستێكیان بۆ هێنا بە دڵـی نەبوو،دەسـتێكی تریـان بـۆ هێنـا ئەویـشی بـەدڵ نـەبوو. خولاسـە لـەپاش گـۆڕینی چـەند دەسـت ، دەسـتێكی لەبـەركرد. جـا داوای ئەسـپی كـرد، ئەسپێكی عەرەبیان بۆ هێنا بەدڵی نەبوو، دوو سێ ئەسپیان گۆڕی هیچی بـەدڵ نـەبوون. تـەواوی ئەسـپەكانی تەوێلـەی كۆشـكی سـەركۆماریان بـۆ دەركـردە دەرەوە لـەناو هەمووانـد یـەكی هەڵبـژاردو بـە سـەد نـازو نیـازەوە سووار بوو. بەهۆی لە خشتە بردنی لە لایەن شەیتانەوە، ئەوەندە لەخۆی بـایی ببـوو، تەماشـایەكی ئـەو هـەموو وەزیـرو وزەراو دەسـتو پێوەنـدو غولأمو سەربازە پیادە ڕۆیانەی نەدەكرد. لەوكاتەدا پیاوێكی بەرگ و لیباس شڕی كۆنی ڕزیو، هاتە بەردەمی سەلامی كرد، پاشا موبالاتی پێ نەكرد.

ناچار كابرا بەناخۆشی جڵەوی ئەسپەكەی گرت، پاشا تووڕەبوو، گوتی: بێ ئەدەب جڵەوی بەردە، كابرا گوتی: كارم پێتە، پاشا گوتی: باشە سەبر بگرە كە دابەزیم كارەكەتم پـێ بڵـێ گـوتی: نـەخێر دەبـێ هـەر ئێستا پێت بڵێم. ئەوەی گوتو بەزۆرە ملێ جڵەوەكەی لەدەست پاشا دەرهێنا. پاشا گوتی: باشە بڵـێ بزانم. كـابرا گـوتی: مـن قـابیزی ئـەرواحم هـاتووم گیانـت بكێشم. كاتێ پاشا ئەوەی بیست ڕەنگی گۆڕاو زمانی لـەنگ بـوو گـوتی: زۆر باشـە ، بەلأم مۆڵەتم بدە، تـا بچمەوەو ئەوەی زۆر پێویستە بیكـەمو ماڵ ئـاوایی لە كـەسو كـارم بكـەم. ئیزڕائیـل گـوتی: هـەرگیز مۆڵـەت نـادرێی تـازە نـاتوانی ماڵو سەروەتەكەت ببینـی. ئەوەی گوتو گیـانی كیشاو وەك دارێكـی وشك بەلاداهات.

لە پاشان ئیزڕائیل چوو بۆ لای موسڵمانێك زۆر پیـاوی چاك بـوو، خـۆی بـۆ سەفەر ئامادەكردبوو، چوو سەلامی لێ كردو كابرا لەوەلأمدا گوتی: ((وعلیكم

## دیمەنی مەرگ

السلام) لەپاشان ئیزرائیل گوتی: دەمەوێ قسەیەکت بە گوێدا بچرپێنم، و گوتی من ئیزرائیلم، کابرا گوتی: بەخێر هاتی زۆر موبارەکە هاتنی ئەوکەسە کە زۆر دەمێکە دوورە، ئارەزووی مولاقاتی تۆم لە هەموو ئەو دۆستانە زۆرتر بوو کە لێم دوورن.

ئیزرائیل گوتی: ئەوکارەی کە لەماڵەوە بۆی دەچویە دەرێ زوو ئەنجامی بدە. کابرا گوتی: هیچ کارێکم لە مولاقاتی دۆستی حەقیقی بەلاوە گرنگتر نیە. ئیزرائیل گوتی: زۆباشە، بەڵام بفەرموو لە چ حاڵەتێکدا پێت خۆشە گیانت بکێشم؟ کابرا گوتی: کەیفی خۆتە من لەو بارەوە قسەم نیە، ئیزرائیل گوتی: وا دەستوور بەمن دراوە کە بە مەیلی تۆ ڕەفتار بکەم، کابرا گوتی: ئەگەر وایە لێم گەڕێ با دەست نوێژ بگرمو دوو ڕکات نوێژ بکەمو لەکاتی سوجدەدا گیانم بکێشە لەکاتی سوجدەدا تەیری ڕوحی لە قەفەسی بەدەندا هێنایە دەرەوەو هەڵفڕی.

## حیکایەتی کابرایەکی پارە زۆر

کابرایەك سەروەتو دارایـیەکی زۆری پێکەوەنابوو، هیچ نەمابوو لەدنیادا کە نەی بێ، قەسرێکی زۆر گەورەی دروست کرد، دوو دەروازەی گەورەی بوو، چەند دەرکەوانی بۆ دانا، کاتێ تەواو بوو، دەعوەتێکی شاهانەی بۆ خزمو دۆستو برادەران ساز کرد، لە دەعوەتەکەدا زۆر بە دەعیەوە قاچی لەسەر قاچی دانابوو، میوانەکان خەریکی نانخواردن بوون، ئەو لەبەر خۆیەوە دەی گوت لەهەموو جۆرە شتێك ئەوەندەم زەخیرە کردووە پێویست ناکا چەند ساڵی تریش هیچ بکەم. ئەو لەو فکرو خەیاڵەدا بوو، گەدایەك کە لیباسێکی دڕاوی لەبەردابوو، زەمبیلێکی گەورەی لەمل کردبوو، هات بە توندی لە دەروازەی دا، غولام و دەستو پێوەند گورج هاتن گوتیان: ئەوە کێیە وا بێ ئەدەب لە دەرگا دەدا؟ لێیان پرسی چ خەبەرە؟ گەداکە گوتی:

ئاغاکەتانم بۆ بنێرن، گوتیان، ئاغا چۆن دێ بۆ لای گەدایەکی وەك تۆ؟ گەداکە وتی: چۆن نایێ دەبێ هەربێ، چوونەوە ئەو گفتۆگۆیەیان بۆ گێڕایەوە، ئاغا گوتی: هیچ قسەتان پێ نەگوت؟

لەوکاتەدا گەداکە زۆر بەتوندی لە دەروازەی دایەوەو غولامەکان بە غاردان چوونەوە لای، گەداکە گوتی: بڕۆن بە ئاغاکەتان بڵێن من قابیزی ئەرواحم، کە ئەوەیان لە گەدا بیست هۆشیان لا نەماو چوون بۆ ئاغایان گێڕایەوە، ئاغا کە ئەوەی بیست دەستەو پاچە کەوت و بە داماویەوە گوتی: بچن پێی بڵێن: با لەجیاتی من بە یەکی تر ڕازی بێ. لەوکاتەدا گەداکە وەژووری کەوت و گوتی: چ دەکەی بکە، من بێ گیان کێشانی تۆ لەو ژوورە ناتوانم بچمە دەرەوە. ئاغا ناردی هەموو پارەکەیان بۆ هێناو رووی کردە پارەکەو گوتی: لەعنەتی خوات لێ بێ من بە هۆی تۆوە لە خوا پەرستی دوورکەوتمەوەو ئەوەندەت مۆڵەت نەدام تاوێك بە خەیاڵێکی ڕەحەتەوە یادی خوا بکەمەوە.

خواوەندی گەورە بە ئەمرو ئیرادەی خۆی ماڵەکەی وەزمان خست و گوتی: بۆ لەعنەت لەمن دەکەی؟ تۆ بە هۆی منەوە دەچویتە مەجلیسی ئەو پاشایانە، کە پیاوی چاك چونکە پارەدار نەبوو دەردەکرا، بەهۆی منەوە بوو کە لەگەڵ ئەو ئافرەتە ناسکانەدا ڕات دەبوارد، بەهۆی منەوە بوو وەك پاشایان ژیانت دەبردە سەر، هەر وەك منت لەکاری خراپەدا خەرج دەکرد. ئەگەر چاکەشت پێوە بکردمایە هەر ڕازی دەبووم لەو گفتوگۆیەدا بوون ئیزرائیل گیانی کێشا.

## حیکایەتی زاڵمێك

وەهەبی کوڕی منبە دەڵێ: جارێك ئیزرائیل گیانی زاڵمێکی کێشا کە لە دنیادا کەس لەو زاڵمتر نەبوو، کاتێ کە گەڕایەوە بۆ ئاسمان فریشتەی ئاسمان پرسیاریان لێ کردئەرێ تۆ گیانی هەموو کەس دەکێشی قەت وابوو بەزەیت بەکەسدا بێتەوە؟ گوتی: لە هەموو کەس زیاتر دڵم بە ئافرەتێك

## دیمەنی مەرگ

سووتا کە بە تەنیا لەناو دارستانێکدا بوو، هەرکە منداڵەکەی بوو ئەمرم پێ کرا کە گیانی بکێشم. دڵیشم زۆر بە منداڵەکەی سووتا، چونکە نەمدەزانی لەو جەنگەڵەدا کە ئەو منداڵە بێ دایکە نەبێ کەسی لێ نیە، چ بەڵایەکی بەسەر دێ؟ فریشتەکان گوتیان: ئەو زاڵمەی کە ئێستا گیانت کێشا ئەو منداڵە بوو کە دڵت بۆ دەسووتا. ئیزڕائیل واقی وڕماو گوتی: ئەی خوای گەورە! هەر تۆ پاکو میهرەبانیو هەرچی ئارەزووت بێ دەیکەی.

### فەرمایشتی شێخ حەسەنی بەسری لەبارەی مەرگەوە

شێخ حەسەنی بەسری رحمة الله دەفەرمووێ: کاتێ یەکێك دەمرێو کەسوکاری دەست دەکەن بە گریان ئیزڕائیل دێتە بەردەرگاو دەڵێ: من رزقی ئەوم نەخواردووە، من تەمەنی ئەوم کەم نەکردۆتەوە، بڕیاریش وایە چەند جاری تر بێمە ئەو ماڵە تا هەمووتان دەمرن.

دەفەرمووێ: قەسەم بەخوا ئەگەر بە چاوی خۆیان ئیزڕائیل ببیننو گوێیان لە قسەکانی بێ مردووەکەیان لە بیر دەچێتەوەو بیر لە حاڵی خۆیان دەکەنەوە.

### باسی زاڵمێکی بەنی ئیسرائیل

یەزیدی ڕەقاشی ﷺ دەڵێ: یەکێ لە زاڵمەکانی بەنی ئیسرائیلی لەگەڵ ژنەکەی خەریکی ڕابوواردن بوو، لە ناکاوێك پیاوێکی نەناسراو وەژوورکەوت، کابرا زۆر تووڕ بوو پەلاماری داو گوتی: کابرا! تۆ کێیتو کێ ئیجازەی دایت بێیتە ژوورەوە؟ کابرای نەناسراو گوتی: خاوەنی ئەم ماڵە ئیجازەی دام بێمە ژوورەوە؟ لەویش زیاتر کەس ناتوانێ ڕێگا لە من بگرێ، نە بۆلای پاشایان ئیجازەم دەوێ نە لە زاڵمانیش دەترسمو نەکاتێ بۆ لای ئینسانی مەغروور هیچ شتێك دەتوانێ بەرگریم لێ بکا.

بە بیستنی ئەو جۆرە قسانە کابرای زاڵم ترساو لەرزی‌و بەلادا هات، لەپاشان بە داماویيەوە گوتی: کەواتە تۆ ئیزرائیلی؟ گوتی: بەڵێ ڕاستە من هەوم، خاوەن ماڵەکە گوتی:تکایە ئەوەندەم مۆڵەت بدە تا وەسیەت دەکەم، ئیزرائیل گوتی: تازە ماوەی تێ پەڕیوە بەداخەوە تەمەنت تەواوبوو، هەناسەکانت ئاخریانەو کاتت کۆتایی هاتووەو چوکترین فرسەتت بۆ نەماوەتەوە. خاوەن ماڵ پرسی بۆ کوێم دەبەن؟ فریشتەی مەرگ گوتی: دەتبەم بۆ لای ئەو کردەوانەت کە لە پێش تۆدا ڕۆیشتوون. هەر جۆرە خانوێکت بۆ ئەو دنیا درووست کردبێ ئەو جۆرە خانووەت پێ دەگا. گوتی: ئاخر من هیچ کردەوەیەکی چاکم نەکردووەو هیچ خانوێکم بۆ ئەو دنیا درووست نەکردووە، ئیزرائیل گوتی: کەواتە دەتبەم بۆ ﴿ كَلَّآ إِنَّهَا لَظَىٰ ﴿١٥﴾ نَزَّاعَةً لِّلشَّوَىٰ ﴿١٦﴾ ﴾ المعارج: ١٥ - ١٦ . لە پاشان گیانی کێشاو شیوەن‌و گریان بەرزبووەوە، یەکێ دەگریاو یەکێ دەی ناڵاند. جا ئە و یەزیدی ڕقاشی یە دەفەرموێ: ئەگەر خەڵك بیان زانیایە کە ئەو مردووە چی بەسەر دێ زیاتری بۆ دەگریان.

## باسی مردنی ئەهل الله

حەزرەتی سەفیانی سەوری رضي الله دەفەرمووێ: کاتێ ئیزرائیل دەماری لێدانی دڵی ئینسان دەگرێ، چاوی بە مۆڵەق دەوەستێ‌و زمانی لاڵ دەبێ‌و دنیا فەرامۆش دەکاو ، ئەگەر سەرخۆشی گیان کێشان نەبووایە لە تاوی دەردی خۆی پەلاماری دەوروبەری دەدا. بە چەند ڕیوایەتی تر دەڵێن: کاتێ ئینسان لە کاتی گیان کێشاندا ئاخر هەناسە هەڵدەکێشێ شەیتان زۆر هەوڵ دەدا لە ڕێگای ڕاست لای دا. بە ڕیوایەتێکی تر دەڵێن: لە کاتی گیان

## دیمەنی مەرگ

**کێشانی ئینسانی نوێژکەردا ئیزرائیل شەیتانی لێ دوور دەخاتەوەو دەری دەکا.**

حەزرەتی موجاهید ﷺ دەفەرمووێ: لەکاتی مردنی ئینسانندا ڕەنگی هاوڕێکانی دنیای لێ دەنیشێ، ئەگەر لە دنیادا لەگەڵ پیاوچاکان بوو بێ، ڕەنگی پیاوچاکان‌و ئەگەر لەگەڵ پیاو خراپان بووبێ ڕەنگی پیاو خراپانی نیشان دەدەن.

یەزیدی کوڕی شەجەرەی سەحابیش ئەوەی فەرمووە: پیاوێکی عابید بەناوی ڕەبیعی کوڕی بزە لە شاری بەسرە بوو، دەفەرمووێ: پیاوێك لە گیان داندا بوو، کاتێ خەڵك پێیان دەگوت: بڵێ ((لا اله الاالله)) دەستی دەکرد بە قسەی پەرت‌و بڵاو، بۆ وێنە دەی گوت: لەو دەرگایەوە ڕۆیشتن، خۆت شەڕاب وەخۆ، دەرخواردی منیشی بدە. هەروەها پیاوێك لە ئەهواز لە کاتی سەرەمەرگیدا دەیان گوت: شادە بێنە دەستی دەکرد بە قسەی بێ مانا، دە تمەن، پازدە تمەن، دوازدە تمەن.

بەڵام بە پێچەوانەی ئەوانە ئەو کەسانەی لە دنیایدا یادی مەرگ دەکەنەوە و خۆی بۆ ئامادە دەکەن‌و لە ژیانیاندا کاری باش دەکەن، مەرگیان وەك حەزرەت ﷺ فەرموویەتی: خەڵاتێکە دەیاندرێتێ. کاتێ بیلالی حەبەشی ﷺ خەریکی گیاندان بوو خێزانەکەی دەی گوت: حەیف لێم دوور وەکەویەوە، بیلال لە وەڵامدا گوتی: چەند خۆشحاڵم کە بەیانی بە خزمەت پێغەمبەرو ئەسحاب‌و دۆست‌و برادەران دەگەم، دەی گوت: ئای ئەو بیرکردنەوە بۆ من چەند خۆشە.

حەزرەتی مەعازی کوڕی جەبەل ﷺ لە کاتی سەرەمەرگیدا فەرمووی: ئەی خوایە! دەزانی کە من پێم خۆشە زۆر لە دنیادا وەمێنم، بەڵام بۆ ئەوەنا کە دنیام زۆر خۆش دەوێ‌و لەبەر ئەوەش نیە کە سەرچاوەو باغ‌و باغات وەدەست بێنم، بەڵکو لەبەر ئەوەی تا لە هاویناندا لەززەت لە تینویەتی ڕۆژوو بەرم‌و کاتی خۆم لە زەحمەتی دینداریدا بەرمەسەروو بچمە مەجلیس‌و کۆڕی زکری تۆوە.

کاتێ حەزرەتی سەلمانی فارسی ﷺ خەریکی گیاندان بوو دەستی کرد بە گریان، یەکێ عەرزی کرد کەی جێگای گریانە کە لە پاش مەرگ بە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دەگەی؟ خۆ پێغەمبەر ﷺ زۆرت لێ ڕازی بوو، فەرمووی: خۆ من لە ترسی مەرگ ناگریم‌و بۆ دنیاش ناگریم، بەڵکو بۆ ئەوە دەگریم کە کاتی خۆی وعدەمان بە حەزرەت ﷺ دابوو کە هەر یەکە بە ئەندازەی ڕێبوارێك ئیستیفادە لە دنیا بکەین‌و نەم توانی ئەو وەعدە بەرمە سەر، کاتێ وەفاتی کرد ماڵەکەیان خەملاند بایی شتێك لە دە درهەم زیاتر بوو، ئەوەندە بوو سەروەتەکەی کە لەبەر زۆریانی دەگریا، لە پاشان داوای لە خێزانەکەی کرد گوتی: تۆزێك میسکی بۆن خۆش بێنەو بە جێگاکەمی وەرکە، چونکە ئەوانەی ئێستا دێن بۆ لام ئینسان‌و ئەجیننە نین فریشتەن.

هەروەها کاتی((عبدالله)) ی کوڕی موبارەك ﷺ نزیك بوو وەفات بکا، پێ کەنی‌و فەرمووی: دەبێ بۆ وەدەست هێنانی ئەو جۆرە شتانە خەڵك هەوڵ بدا، دیاربوو خەڵات‌و خۆشی دواڕۆژیان نیشاندابوو ڕووی کردە نەسری غولامی و فەرمووی: سەرم لەسەر زەوی دانێ. غولامەکەی دەستی کرد بە گریان‌و فەرمووی: بۆ دەگری؟ نەسر گوتی: بۆ ئەوەی دەگریم تۆ ژیانت زۆر خۆش بوو کەچی ئێستا دەبینم وەك گەدایان سەر وەزەوی دەکەیت‌و

دەمـری، فـەرمووی: بـیٚ دەنـگ بـە، مـن لـە خـوام داواکردبـوو کـە وەکـو دەوڵەمەندان بژیم و وەکو گەدایان بمرم.

عەتای کوڕی یەسار دەڵیٚ: کابرایەك لە گیـان دانـدا بـوو، لـەو کاتـەی شـەیتان چوو بۆ لای و گوتی: لـە دەسـتم دەرچـووی هیـچم بـۆ دەگـەڵ نـەکرای، کـابرا وەڵامـی دایـەوە گـوتی: لـەوبارەوە تـا ئێـستاش لێـت ئـەمین نـیم. جـەریر ﷺ دەڵیٚ: کاتیٚ شێخ جونەیدی بەغدادی ﷺ وەفاتی دەکرد، لە خزمەتیـدا بـووم. لەوکاتـەدا قورئـانی دەخوێنـد ، یـەکیٚ عـەرزی کـرد قوربـان! کـاتی گیاندان کەی وەختی قورئان خوێندنـە؟ فـەرمووی: ئێستاکە نزیـك دەفتـەری ئەعمالم دادەخریٚ بۆ قورئان خوێندن چ کاتیٚ لە ئێستا باشترە؟

یـەکیٚ عـەرزی شـێخ جونەیـدی ﷺ کـردو گـوتی: قوربـان! حـەزرەتی شـێخ ئەبوو سەعیدی خەڕراز لەکاتی سەرەمەرگدا زەوقێکی عـەجایبی هـەبوو هـۆی چی بوو؟ فەرمووی: ئەگەر لەو حاڵەتەدا ڕوحی بفڕیبایە هەر دوور نەبوو.

لەکاتی وەفاتی شێخ ذوالنونی میسری ﷺ یەکیٚ عەرزی کرد دەتەویٚ هیچ بفـەرمووی؟ ئەگـەر فەرمایـشتێکت هەیـە بفـەرموو: فـەرمووی: تـەنیا ئـەوەم دەویٚ کە لە پێش مردنمدا خوا بناسم.

کابرایـەك دەڵـیٚ: جارێـك جارێـك لـە خزمـەت شـێخ ممـشادی دینـەوەری دانیشتبووم گەدایەك هات و گوتی: یا شێخ! لێرە جێگایـەکی پـاك و تـەمیزی لێیـە ئەگـەر یـەکێك بتـوانیٚ لـەویٚ بمـریٚ؟ شـێخ ئیـشارەی کـرد بـۆ لای سەرچـاوەی ئاوێـك و گەداکـە چـوو دەسـت نوێـژی گـرت و دەسـتی کـرد بـە نوێژو، لە پاشان بەرەو قیبلە ڕاکشاو وەفاتی کرد.

فاتمەی خوشکی شێخ ئەبوو عەلی ڕوودباری دەڵیٚ: کاتیٚ کاکم خەریك بوو لە ((دارالفنا)) بڕوا بۆ ((دار البقا)) سەری لە باوەشی مندا بوو، چاوی هـەڵێناو

گوتی: دەرگای ئاسمانەکان کراونەتەوەو بەهەشت ڕازاوەتەوەو گوێندەیەك دەڵێ: ئەی ئەبوو عەلی هەر چەند تۆ لەوەت زیاتر داوا نەکردووە، بەڵام ئێمە تۆمان لەو مەقامەش بەرەو ژوورتر گەیاند، ئینجا دوو شیعری خوێندەوە کە واتاکەیان ئەوەبوو، قەسەم بە هەقی تۆ من هیچ کاتێ لە تۆ بەولاوە بە موحیببەت تەماشای کەسم نەکردووە، بەڵام دەبینم تۆ بە چاوی بیمارت و بە گۆنای شەرم و حەیاوە من بێ قەرار دەکەی.

## باسی بت پەرستێك

((عبدالواحد))ی کوڕی زەید کە یەکێك بوو لە گەورە پیاوانی موشایەخانی تەریقەی چەشتییە دەفەرمووێ: جارێك بە سواری کەشتی دەڕۆیشتین، تۆفان کەشتیەکەی بردە جەزیرەیەك، پیاوێکمان دی بتێکی دەپەرست، لێمان پرسی تۆ کێ دەپەرستی؟ ئیشارەی کرد بۆ لای بتەکە، گوتمان: خوایەکت بەدەستی خۆت درووست کردووە، بەڵام خوای ئێمە بۆخۆی ئەو جۆرە شتانە درووست دەکاو ئەوەی ئینسان بەدەستی خۆی درووستی بکا بۆ خوا نابێ. کابرا پرسی ئێوە کێ دەپەرستن؟ گوتمان: ئێمە ئەو خوایە دەپەرستین کە عەرشی لە سەرەوەی ئاسمانەکانەوەکورەی زەوی لە ژێر قەبزی قودرەتی ئەو دایەو لە هەموو کەس گەورەترە، گوتی: ئێوە چۆنتان ناسی؟ گوتمان: بەهۆی ئەو پێغەمبەرە میهرەبانەوە کە خوا بۆی ناردوین و هەموو شتێکی بۆ بەیان کردین ناسیمان، گوتی: ئەو پێغەمبەرە لە کوێیە؟ گوتمان: کاتێ پەیامی خۆی بە ئێمە ڕاگەیاندو وەزیفەی خۆی ئەنجامدا، خوای گەورە بانگی کردەوە بۆ لای خۆی تا پاداشتی ئەو ڕەنج و زەحمەتەی بداتەوە گوتی: ئەو پێغەمبەرە هیچی بە یادگار بۆ بەجێ هێشتوون؟ گوتمان: بەڵێ: کەلامی خوای بۆ ڕێنمایی بۆبەجێ هێشتوین . گوتی: ئەو کەلامەم نیشان بدەن، قورئانمان هێناو لە پێشمان دانا. گوتی من خوێندەوار نیم

هێندێکی لێ وەخوێنن. سوورەتێکمان بۆ خوێندەوە تا سوورەتەکە تەواوبوو گوێی گرت و گوتی: حەقی خاوەنی ئەو کەلامە ئەوەیە بێ ئەمری نەکرێ و لە پاشان بوو بە یەکێك لە ئاڵقە لە گوێکانی ئیسلام و ئوسول و ئەحکامی دین و چەند سورەی قورئانمان فێر کرد، شەو خەریك بووین لەپاش نوێژ بخەوین، گوتی: ئایا خواکەتان لە پاش نوێژ دەخەوێ؟ گوتمان: خوای ئێمە نە دەخەوێ و نە وەنەوز دەدا، گوتی: ئای ئێوە چەند نا لایقن، خواکەتان ناخەوێ کەچی ئێوە دەخەون، زۆرمان لا عەجایب بوو، کاتێ ویستمان ئەو جەزیرە بەجێ بێڵین: گوتی: لەگەڵ خۆتانم بەرن. تا باسی دینتان زیاتر لێ فێربم، لەسەر داوای خۆی لەسەرمان پێویستە بیر لە ئەسپابی ژیانی بکەینەوە. لەناوخۆماندا پارەیەکمان کۆکردەوە کاتێ بۆمان برد گوتی: ئەوە چیە؟ گوتمان: هێندێك پارەیە بۆ پێویستی خۆت خەرجی کە. گوتی: (لا اله الا الله)) ئێوە ڕێگایەکتان نیشانی من دا کەچی بۆخۆتان پێیدا ناڕۆن. من لەو جەزیرەیەدا بتم دەپەرست، خوام نەدەپەرست و نەمدەناسی، بەو حاڵەش خوا منی بەهیلاك نەدا جا ئێستا کە دەی پەرستم و دەی ناسم چۆنم بە هیلاك دەبا؟ لە پاش سێ ڕۆژ زانیمان کە لە گیاندان دایە، چووین بۆ لای و گوتمان: چیت پێویستەبڵێ: گوتی: ئەو خوایەی کە بۆ ڕێنمایی من ئێوەی نارد بۆ ئەو جەزیرەیە ئیحتیاجی ڕەفع کردووم.

شێخ ((عبدالواحد)) دەفەرمووێ: خەو تینی بۆ هێنام هەر لەوێ خەوم لێ کەوت، لە خەودا باخێکم دی زۆر خۆش بوو، لەناوباغەکەدا گونبەزێك بوو لەناو گونبەزەکەدا تەختێك دانرابوو، لەسەر ئەو تەختە کچێکی زۆر جوان دانیشتبوو دەی گوت: خوایە! زوو بینێرە زۆرم ئارەزوو لێ یە. کەوەخەبەر هاتم وەفاتی فەرمووبوو. گورج کفن و دفنمان کرد، دووبارە شەو لە خەومدا ئەو باغ و تەخت و کچەکەم دیەوە، تەماشام کرد لە لای کچەکە دانیشتووەو ئەو ئایەتانەی سورەی ((رعد))ی دەخوێنێتەوە کە دەفەرمووێ ﴿ جَنَّتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا

﴿وَمَن صَلَحَ مِنْ ءَابَآئِهِمْ وَأَزْوَٰجِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ ۖ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ ﴿٢٣﴾ سَلَٰمٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْ ۚ فَنِعْمَ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٤﴾﴾ الرعد: ٢٣ - ٢٤

ئەوەیە لووتف‌و میهرەبانی خوا لەگەڵ کەسێکدا کە تەواوی تەمەنی خۆی لە بت پەرستیدا بردبووە سەرو لەکاتی ئاخری تەمەنیدا بەهۆی تۆفانەوە، کەشتی ئەو کۆمەڵەی بۆنارده ئەو جەزیرەیەو کردیە دەوڵەمەندی قیامەتی.

اللهم لا مانع لما اعطيت ولا معطي لما منعت.

## دەرسی چوارەم:
## باسی کەنیزەکێك

جارێك مالیکی کوڕی دینار ﷺ بە بازاڕێکی شاری بەسرادا دەڕویشت و چاوی بە کەنیزەکێك کەوت، بە لەنجەو لارێکەوە دەڕۆیشت کە تایبەتی بوو بە کەنیزەکی پاشایانەوە، لەگەڵ خەدەم و حەشەمدا دەڕۆیی. کاتێ مالیکی کوڕی دینار چاوی پێکەوت گوتی: ئەی کەنیزەك! خاوەنەکەت نات فرۆشێ؟ کەنیزەکەکە کە ئەو پرسیارەی بیست لە پێشدا تێك چوو، لە پاشان گوتی: ئەوە چیت گوت؟ دا دووبارە بی لێوە؟ گوتی: ئایا خاوەنەکەت دەتفرۆشێ؟ کەنیزەکەکە گوتی:ئەگەر خاوەنەکەم بمفرۆشێ بە گەدایەکی وەك تۆ دەکڕێم؟ فەرمووی: بەڵێ دەتوانم لە تۆش باشتر بکڕم. کەنیزەکە کە ئەوەی بیست پێی کەنی و دەستووری دا بە خزمەتکارەکانی گوتی: ئەو گەدایە بگرن و لەگەڵ خۆتان بیبەن تا هێندێکی گاڵتە پێ بکەین، گرتیان و بردیان کاتێك کەنیزەك هاتەوە ئەو گفتوگۆیەی بۆ خاوەنەکەی گێڕایەوە دەستی کرد بە پێکەنین و گوتی: بانگی کەن، کاتێ هێنایان بۆ لای کابرا سام و هەیبەتێکی زۆر عەجایب هاتە سەر دڵی و گوتی: تۆ چیت دەوێ؟ مالیك فەرمووی: ئەو کەنیزەکەم پێ بفرۆشە. کابرا گوتی: جا تۆ دەتوانی قیمەتەکەی بدەی؟ فەرمووی بەڵ: چونکە بە نەزەری من دوو دەنکە خورمای ڕزیویش ناهێنێ، دەستیان کرد بە پێکەنین و کابرا گوتی: چۆن ئەوەندەت بۆ داناوە؟ مالیك فەرمووی: لەبەر ئەوەی عەیبی زۆرە.کابرا گوتی: چ عەیبێکی هەیە؟ فەرمووی: ئەگەر عەتر لەخۆی نەدا بۆنی ناخۆشە، ئەگەر دانەکانی نەشوا بۆنی دەمی پیسە. ئەگەر خەنە لەسەری نەگرێ و نەی شوا مووەکانی بڵاودەبنەوەو پڕدەبن لە ئەسپێ. ئەگەر نەختێکی تر پیر ببێ دەبێتەپیرەژن و خۆشت ناوێ. بەبێ ئەوەش دەکەوێتە حەیزەوەو دەچێتە سەر قەزای

حاجەتو جۆرە کەسافەتێکی لێ جیا دەبێتەوە، وەك ئاوی دەمی و ئاوی لووتیو تفو ئەمانە. یا غەمبار دەبێو ناڕەحەت دەبێ.

ئەوەندەش خود پەسندە. هەر لەبەر دڵی خۆی تۆی خۆش دەوێ، ئەگەر چوکترین خەراپەیەکت لێ ببینێ هیچ موحیببەتی نامێنێ، زۆر بێ وەفایە، کەم وایە لەسەر قەولی خۆی وەمێنێ. بەدرۆ تۆی خۆش دەوێ، بەیانی لەدوای تۆ ئەگەر لە تەنیشت یەکی تریش دانیشێ ئەوە بە قوربانو بە سەدەقەی ئەو دەبێ. بەڵام من بە پێچەوانە، کەنیزەکی سەد ئەوەندەی ئەوم چاکتر هەیەو زۆریش لەو هەرزانترە. لەگەڵ ئەوەشدا کە لە کافوورو مسك دروست کراوەو لیباسی نوورانیو مرواری داری پۆشیوە. ئەگەر ئاوی دەمی بکەیتە ناو ئاوی سوێرەوە شیرینی دەکا. ئەگەر قسە لەگەڵ مردوو بکا زیندوو دەبێتەوە، ئەگەر باسکی لەبەرامبەر ڕۆژدا ڕاگرێ ڕۆژ تاریك دەکا. ئەگەر بچێتە ژوورێکی تاریکەوە ڕووناك دەبێتەوە. ئەگەر خۆی وەڕازێنێ دنیا بۆن خۆش دەکا. ئەو کەنیزەکە لەناو باغی میسكو زەعفەران پەروەردە کراوە. لەناو لەخی یاقووتو مەرجاندا یاری کردووە. قەسرەکەی لە ناو خێمەی پڕ لە ئەنواعی نیعمەت دایە. لە ئاوی تەسنیم کە جۆگەیەکە لە جۆگەکانی بەهەشت ئاو دەخواتەوە. قەت وەعدە بە خیلاف ناکاو خۆشەویستی بەردەوامە. جا ئێستا ئێوە بڵێن: لەو دووانە کامیان بە قیمەت ترە؟ هەمووانیان گوتیان: ئەوەی تۆ دەڵێی ئەوە ئەو باشترە. مالیك فەرمووی: دەی هەرکەسێك هەر کاتێ نرخەکەی پێ بوو دەتوانێ بیکڕێ. گوتیان : نرخەکەی چەندەو چیە؟ فەرمووی: بۆ کڕینی ئەو شتە باشە نرخێکی زۆر کەم پێویستە، ئەویش ئەوەیە کە شەوانە کەمێك بە تەنیا بیو بۆ ڕەزای خوا دوو ڕکات سوننەتی تەهەجوود بکەیو لەکاتی نان خواردندا یادی دەست کورتو هەژاران بکەیتەوەو بۆ ڕەزای خوا سەرفی نەزەر لە ئارەزووی نەفس بکەیتو دارێك، بەردێك، لەسەر ڕێگا لابەیتو لە ژیانی دنیا قەناعەتت ببێ و بە جێگای ئەوەی بیر لە دنیای فانی بکەیتەوە بیر لە

دواڕۆژی باقی بکەوە ، ئەگەر ئاوا ڕەفتار بکەی هەم لە دنیادا بە ئابڕوومەندی دەژیو هەم لە دوواڕۆژدا دەبیتە خاوەن مەقامی بەرزو لە باغی بەهەشتا بەنازو نیعمەت لە خزمەت خوا دەبی.

ئاغاکە ڕووی کردە کەنیزەکەی‌و گوتی: گوێت لە قسەکانی ئەو شێخە بوو؟ ئەو قسانە ڕاستن؟ گوتی: بەڵێ زۆر ڕاستن‌و خێرو سەعادەتیان پێوەیە. ئاغاکە گوتی: زۆر باشە، ئێستا تۆ ئازادی‌و ئەوەندە ماڵەش بۆ تۆ بێ. لە پاشان ڕووی کردە هەموو غولامەکانی‌و گوتی: هەمووتان ئازاد بن‌و هەریەکە ئەوەندە ماڵەش بۆ ئێوەو باقی ماڵەکە لە ڕێگای خوادا وەقف بێ. لە پاشان ئەو بەرگ‌و لیباسە چاکەی لەبەری دابوو دای ناو کردی بە خێرو لە پەردەی ماڵەوە لیباسی درووست کردو لەبەری کرد. کاتێ کەنیزەکە ئەوەی لە ئاغاکە چاو پێکەوت گوتی: ئەی ئاغای من لە پاش تۆ ئەو ژیانەش بۆ من خۆش نیە. ئەوەی گوت‌و لیباسێکی زبری لەبەرکردو هەرچی لیباسێکی جوان‌و سەروەتێکی بوو هەمووی کردە خێرو و لەگەڵ ئاغاکەی وەرێ کەوتن‌و ڕوویان کردە خوا پەرستی تا وەفاتیان کرد.

جەعفەری کوڕە سولەیمان دەڵێ: جارێك لە شاری (بەسرە) لەگەڵ مالیکی کوڕی دینار دەگەڕاین بە لای خانوێکی زۆر گەورەدا ڕۆیشتین دروستیان دەکرد، کوڕێکی گەنجی تازە پێگەیشتوو دانیشتبوو ئەمری بەسەر وەستاو عەمەلەکاندا دەکردو بەسەر کارەکە ڕا دەگەیشت ، کاتێ مالیکی کوڕی دینار چاوی پێ کەوت فەرمووی: چەند کوڕێکی ڕوو خۆشەو تووشی چ کارێك بووەو بەو خانووەوە چەند هیلاکە. زۆرم دڵ پێ دەسوتێ دەم هەوێ لای خوا دوعای بۆ بکەم لەو کارە ڕزگاری بکاو ببێتە بەندەیەکی ڕاستەقینەی خوا . چەند خۆش دەبێ، بچیتە ڕیزی گەنجەکانی بەهەشتەوە.

فەرمووی: وەرە جەعفەر با بچین بۆ لای. دەڵێ: چوین بۆ لای‌و سەلامان کردو وەلامی داینەوە. هەرچەند مالیکی دەناسی، بەلام زوو لەبەری

هەڵنەستاو پاش ماوەیەك هەستایە سەر پێ‌و گوتی: زۆر بەخێر بێی چۆنە تەشریفت هاتووە بۆ ئێرە؟ مالیك فەرمووی: ئەو خانووە چەندی تێ دەچێ؟ گوتی: سەدهەزار درهەم. مالیك فەرمووی: ئەگەر ئەو پارە بدەی بە من بەڵێنت دەدەمێ خانووێکی سەد قات لەوە خۆشترت لە بەهەشت بدەمێ‌و چەندین خزمەتکارو دەست‌و پێوەندی تیا بێ‌و خەیمەو گونبەزی ڕازاوە بە گەوهەرو یاقووتی سوور بێ. خانوێك کە لەباتی گڵ‌و قوڕ بە میسك‌و زەعفەران سواغ درابێ‌و نەقەت کۆن ببێ. نەبڕزێ، خانوێك کە وەستاو بەنناى خۆمان دروستی نەکردبێ، بەڵکو خوای گەورە بە ئەمری خۆی دروستی کردبێ. کوڕەکە گوتی: ئیمشەو مۆڵەتم بدە با بیری لێ بکەمەوەو بەیانی تەشریفت بێتەوە تا عەرزت بکەم.

مالیکی کوڕی دینار گەڕایەوە، ئەو شەوە تا بەیانی هەر لە خەیاڵی کوڕەکەدابوو. لە نیوەشەودا زۆر بەدڵ دوعای بۆ کردو بەیانی زوو چوینەوە بۆ لای، تەماشامان کرد لەبەر دەرگا چاوەڕوانی مەیە، کە چاوی بە مالیك کەوت زۆر خۆش حاڵ بوو، مالیك فەرمووی: بیروڕات چۆنە؟ کوڕەکە گوتی: من موافیقم، ئومێدیشم وایە کە جەنابت لەسەر قەولی خۆت مابی.

مالیك فەرمووی: من لەسەر قەولی خۆمم. کوڕەکە چەند کیسە پارەو قەڵەم و دەواتی هێناو لە پێش مالیکی دانان، مالیك قەڵەمەی هەڵگرت‌و لەسەر کاغەزێك نووسی بەناوی خوا. ئەوە ئەو بەڵگە نامەیە لە بەینی فلانی کوڕی فلان‌و مالیکی کوڕی دیناردا، کە بە پێی ئەو بەڵگەنامەیە مالیك قەسرێکی زۆر لە قەسرەکەی خۆی چاکترو خۆشتر لە خزمەت خوادا لە بەهەشت فرۆشت بە فلان کەس بەسەد هەزار درهەم. پارەکەی وەرگرت‌و کاغەزەکەی دایەو هاتینەوە.

جەعفەر دەڵێ: لە بەیانیدا تا ئێوارە هەموو پارەکەی کردە خێرو بەشی نان‌و کەبابێکمان بۆ نەمایەوە. هێشتا چل ڕۆژ تێ نەپەڕی بوو مالیك تازە لە

## دیمەنی مەرگ

نوێـژی بـەیانی ببـوەوە لـە میحرابەکەیـدا چـاوی بـە کاغـەزێك کـەوت. کـە تەماشـای کـرد ئـەو کاغـەزەبوو کـە بۆ کوڕەکـەی نووسـی بوو، لـە پشتەوەی نووسـرابوو ئـەوە ئـەو حەواڵەیـە کـە مـالیکی کـوڕی دینـار دابـووی بـە فـلاّن کـەس. ئـەو قەسـرەیە کـە دابـووت بـە فلاّنـی کـوڕی فـلاّن. نووسـرابوو حـەفتا بەرامبەری ئەوەمان چاکترو باشتر داوە بەو کوڕە

کاتێ مالیك ئەو کاغەزەی خوێندەوە زۆری لا عەجایب بوو. لەپاشـان چووین بۆمـاڵی کوڕەکـە، تەماشـامان کـرد پـەرۆی ڕەشـیان بـە نیـشانەی تازیـە هەڵواسیبو، دەنگی ناڵـەو شیوەن دەهات، پرسیارمان کردگوتیـان: لـە نیـوە شـەودا کوڕەکـە وەفـاتی کـردووە. پرسـیمان کـێ کفـن‌و دفنـی کـردووەو شتویەتی کابرایەکیان بانگ کردو لەبارەی شتن‌و کفن‌و دفنیەوە پرسیارمان لێ کرد گوتی: بەڵێ: لە پێش مردندا پارچە کاغەزێکی دامێ و گـوتی: ئەگەر کفنت کردم ئەو پارچە کاغەزە بخە ناو کفنەکەمەوە.

گـوتی: لەبـەر ئـەوە کـاتێ شـتم پارچـە کاغەزەکـەم خـستە نـاو کفنەکەیـەوە. مالیك پارچە کاغەزەکەی مزگـەوتی لـە باخـەڵ دەرهێنـاو گـوتی: ئـەوە نـەبوو؟ کـابرا گـوتی: قەسـەم بەوکەسـەی کـە ئـەوی مرانـد ئـەوە ئـەو کاغەزەیـە کـە خستمە ناو کفنەکەیەوە.

کـوڕێکی گـەنجی دی کـە ئـەو حاڵـەی دی هەسـتایە سـەر پـێ‌و وتـی: مـن دوسـەدهەزار درەم دەدەم وەعدەیـەکی ئـاواش بدە بە مـن، مالیـك فـەرمووی: تازە ئـەوە ڕابووردو نـاکرێ، ئـەوەی خوا ئارەزوو بکا هـەر ئەوەیـە، لەپاشان مالیك کە یادی ئەو کوڕەی دەکردەوە دەگریاو دوعای بۆ دەکرد.

پیاوانی خوا لەگەڵ زۆر ڕووداوی وا ڕووبەڕوو دەبن، ئەگەر لـەکاتی جەزبـەو عیشقیـشدا بـێ ئیختیـار شـتێك بـدرکێنن خـوای گـەورە دڵیـان ناشـکێنی.

هـەروەکو پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرمووێ: زۆر کەسـی وا هەیـە بـە زاهیر پرچـی

پەرێشان و ڕەنگ تۆزاوییەو خەڵك لەبەر دەرگا دەریان دەکاو موبالاتیان پێ ناکەن، بەڵام لە واقیعدا ئەوانە ئەگەر لەسەر شتێك سوێند بخۆن و داوا لە خوا بکەن خوا بێ دڵیان ناکا.

محەمەدی کوڕی سەمماك دەفەرمووێ: یەکێك لە پیاوە دەسەڵات دارەکانی بەنی ئومەییە بەناوی مووسای کوڕی محەمەدی کوڕی سولەیمانی هاشمی زۆر بە نازو نیعمەت پەروەردە ببوو، هەمیشە خەریکی ئارەزوو بازی بوولەبارەی بەرگ و لیباس و خواردن و خواردنەوەو یاری و قوماردا زۆر زیادە ڕەوی دەکرد، غەمی نەدەخواردو بیری لە هیچ نەدەکردەوە، خۆشی زۆر جوان خاس بوو، ساڵی سێ سەدو سێ هەزاردیناری واریدات بوو، هەمووی لە هەوەس بازیدا خەرج دەکرد، خانوێکی بوو پەنجەرەی لەسەر بازاربوو، لەوێوە تەماشای خەڵکی دەکردوو پەنجەرەی تریش بۆ ناو باغەکەی دەکرانەوەو بۆنی گوڵ و گوڵزاری هەڵدەمژی.

لە ناو خانووەکەیدا ژوورێکی لە ددانی فیل درووست کردبوو بە بزماری ئاڵتوون دایکوتابوو، پشتەماڵێکی ڕازاوە بە مرواری تێدا ڕاخستبوو لەسەری دانیشتبوو. عەمامەیەکی ڕەنگاوڕەنگی لەسەر بوو، دۆست و برادەری لێ کۆدەبوونەوەو زۆر به ئەدەبەوە خزمەت کارەکانی لەسەر سەری دەستەو نەزەر دەوەستان لەدەرەوەش چەند ئافرەتێکی ڕەققاسەی دانابوو، هەرکاتێ ئارەزووی بکردابایە تەماشایەکی دەکردن و لێکڕا دەستیان دەکرد بە ڕەقس و سەماو گۆرانی و شەوانە تا خەوی دەهات ئاوای ڕادەبوارد. کاتێ بە ئارەق خواردنەوە سەرخۆش دەبوو ئاگای لەخۆ نەدەماو خەڵکی دەورو بەری دەڕۆیشتن، ئافرەتێکی دەبردە لای خۆی و تا بەیانی لەگەڵی ڕادەبوارد.

دووبارە بەیانی کە هەڵدەستا خەریکی نەردێن و شەترەنج بازە دەبوو، لە مەجلیسی ئەودا قەت باسی غەم و خەفەت و مردن نەدەکرا، هەر یاری و پێکەنین بوو، هەر ڕۆژە بۆنێکی خۆشترو دەستە گوڵێکی تازە تریان بۆ دێنا

## دیمەنی مەرگ

بیستو حەوت ساڵ ئاوا ڕاببوارد، شەوێك وەك هەموو شەوەكانی تر لە جێگاكەی خۆی دانیشتبوو لەناكاو گوێی لە ئاوازێك بوو، هەر چەند لەگەڵ دەنگی گۆیندەكانی ئەو زۆری فەرق بوو، بەڵام دەنگەكە بەلایەوە زۆر سەرنج ڕاكێش بوو، بە گوێ لێ بوونی بێ هۆش كەوت لە پاشان گۆیندەكانی بێ دەنگ كردو سەری لە پەنجەرە هێنایە دەرێو گوێی لە دەنگەكە ڕاگرت. دەنگەكەش جاری وابوو دەبیستراو جاری وابوو نەدەهات، بە خزمەت كارەكانی گوت: بچن خاوەنی ئەو دەنگەم بۆ بێنن. لەو كاتەشدا شەڕابیان دەگێڕا.

كاتێ چوون تەماشایان كرد ئەو دەنگە لە مزگەوتێكەوە دێ. كە ڕوانیان گەنجێكی زەردو زەعیفو مل باریك بە لێوی وشكو سكی برسییەوە لیباسێكی تەسكی لەبەردایە قورئان دەخوێنێ، بێ دەنگ گرتیانو بردیان بۆ لای ئاغاكەیانو گوتیان: قوربان! ئەوە خاوەنی دەنگەكەیە كە فەرمووت بۆم بێنن. لەو كاتەدا شەڕابی دەخواردەوەگوتی: ئەوە كێیە گوتیان: ئاغا! ئەوە ئەو كەسەیە كە گوێت لە دەنگی بوو، گوتی: لە كوێ هێناتان؟ گوتیان لە مزگەوت قورئانی دەخوێند. ڕووی كردە كوڕەكەو گوتی: چیت دەخوێند؟ كوڕەكە لە پێشدا((اعوذبالله)) ی گوتو لە پاشان چەند ئایەتی لە سوورەتی ((المطففين)) و سوڕەی (الواقعة)) ی بۆ خوێندەوە كە بە كوردی ماناكەیان ئەوەیە. دەفەرمووێ: بەڕاستی ئینسانە باشەكان لە نازو نیعمەتی بەهەشت دانو لە سەر كورسی دادەنیشنو سەیری بەهەشت دەكەنو خۆشیو لەززەتی نیعمەتی بەهەشتیان بەناو چاوانەوە دەبینیو پێیان دەخۆنەوە لە شەڕابی ناو بلورێك كە بە میسك مۆركراوەو زۆر بۆن خۆشە. دەبا ئەوانەی دەیان هەوێ لەو شەڕابە بخۆنەوە موسابەقە لەسەر كردەوەی چاك بكەن تا لەوشەرابەمان دەرخواردبدەن كە ئاوی حەوزی كەوسەری تێكەڵ كراوە، كە بەتایبەتی نزیكانی خوای گەورە ئاوی لێ دەخۆنەوە.

ئینجا کورە دەروێشەکە گوتی: ئەی فریودراو! ئەو کۆشکەی تۆ ئەو هەیوانەی تۆ، وەك ئی بەهەشت نین، چونکە کورسی بەهەشت لە زێڕو جەواهێر درووست کراوەو فەرشی گەورەیان لەسەر راخراوە کە قەراغەکەیان ئاوریشمی سەوزو پاڵیان لەسەر پشتی سەوزو ڕاخەری گرانبەها داوەتەوە. پیاوی دۆستی خوا لەسەر ئەو کورسیانە تەماشای ئەو جۆگە ئاوە دەکا کە بەناو دوو باغدا دەڕۆن.

لەناو ئەو باغانەدا دوو جۆگە هەڵدەقوڵێن و جاری دەبن. هەر دارێکی میوەی ئەو دوو باغە دوو بەر دەگرێ، تامی هەر بەرێکی لەگەڵ ئەوەی تر جیاوازە ئەو میوانە نەقەت خەڵاس دەبن و نەکەس بەرگری لە چنینیان دەکا. پیاوانی خوا لە بەهەشتا جێگایان بەرزەو زۆر خۆش دەژین، کورسی بەرزو پەرداغی شەڕاب و پشتی گران بەهاو فەرشی بەنرخیان بۆ ڕاخراوە، لەبەر سێبەرو لە قەراغ سەرچاوان ژیان دەبەنە سەر.

ئەوەیە ئەو بەهەشتەی کە وەعدە دراوە بیدەن بە پەرهیزکاران کە جۆگەی بە بەردەمدا دەڕواو میوەو سێبەری دایمیە. ئەوەیە ئەنجامی خواناسان.

بەڵام ئەنجامی کافرو بێ دینان ئەوەیە، کە هەمیشە لە عەزابی دۆزەخ دا دەبن و قەت لەسەریان سووك نابێ و هەمیشە نائومێدن. بەڕاستی گوناهکاران لە گومڕایی و ئاگری سوتێنەردا دەسوتێن. ئەو ڕۆژەی کە ڕایان دەکێشن بۆ دۆزەخ پێیان دەڵێن: دەی بیچێژن تامی ئاگری دۆزەخ. لەو ڕۆژەدا دەبنە ئاگرو ئاوی داغ و دووکەڵی ڕەش. دەڵێن: بریا کوڕو ژن و براو خزم و کەس و کاریان لەباتی خۆمان وەرگرتایەو لەو ئاگرە ڕزگارمان ببوایە، بەڵام ڕزگاریان نابێ، چونکە ئاگری دۆزەخ زمان دەکێشێ و گۆشت و پێست لێ دەکاتەوەو ئەوەی پشتی کردبێتە حەق و ڕووی لە خوا پەرستی وەرگێڕابێ و ماڵ و سەروەتی دنیای کۆکردبێتەوە، بۆ لای خۆی ڕادەکێشی و ئەو جۆرە

کەسانە وەبەر لۆمەو عەزاب دەکەون‌و قەت لە قەهرو غەزەبی خوا ڕزگاریان نابێ.

کاتێ ئەو ئاغایە گوێی لەو قسانەی ئەو کوڕە دەروێشە بوو، هەستایە سەر پێ و کوڕە دەروێشەکەی دەباوەش گرت‌و دەستی کرد بە گریان. لە پاشان خەڵکەکەی ئێزن داو کوڕەکەی بردە حەوشەو لەسەر لبادێك دانیشت‌و یادی ڕابردووی دەکردەوەو دەگریا و کوڕەکە ئامۆژگاری دەکرد تا ڕۆژ بووەوە، بەیانی زوو لەسەر دەستی کوڕەکە تەوبەی کردو پەیمانی بەست جارێکی دی گوناه نەکاو لە پاشان لەلای کۆمەڵێك خەڵکی تر دووبارە تەوبەی کردو چوو لە مزگەوت دەستی کرد بە عیبادەت‌و خزمەت کارەکانی ئازاد کردو هەرچی ئی خەڵك بوو دایەوەو چی بووی کردی بەخێرو بڕیاری دا لیباسی پەلاس لەبەرکاو نانی جۆ بخوا!.

ڕۆژ بە ڕۆژوو بوو، بەشەو نوێژی دەکرد، پیاوە گەورەکان دەهاتن بۆ زیارەتی، ئەوەندەی ڕیازەت دەکێشا خەڵك داوای لێ دەکرد تۆزێك کەمی بکاتەوەو بەزەیی بە خۆیدا بێتەوەو دەیان گوت: خوا ڕەحیمە، بەلام ئەو لە ولامدا دەی گوت: بۆ خۆم باشتر دەزانم زۆرم بێ ئەمری خوا کردووە.

بە پێی پەتی‌و بە گریانەوە بەرەو ((مەککە)) بۆ حەج وەڕێ کەوت. تەنیا کاسەو کیسێکی پێ بوو چوو حەجی کردو لە (مەککە) مایەوە تا وەفاتی کرد. لەماوەی مانەوەی لە حەرەم، شەوانە دەچوو لەبن دیواری کەعبەدا ڕادەوەستاو دەگریاو دەی گوت: ئەی خوای من! چەند جار بێ ئەمری تۆم کرد، چەندم گوناهی گەورە کرد، هەموو چاکەیەکم بەبادا ڕۆیشت‌و خەراپەکانم مانەوە. لە ڕۆژی دیداردا بە هیلاك دەچم. بەداخەوە ئەو ڕۆژەی نامەی عەمەلم دەدەنەوە دەست لەبەر ئەوەی پڕە لە گوناه لە خزمەت تۆدا شەرمەندەو ڕیسوا دەبم. لەبەر ئەوەی تۆ ئەو هەموو نازو نیعمەتەت دا بە من‌و من خەراپەم دەکردو ئاگات لە هەموو خەراپەیەکم بوو غەزەبم لێ

دەگری. لەو ڕۆژەدا نە جێگای خۆ شاردنەوەو نە پێی فیرارم هەیە، لە تۆ بەولاوە پەنا بۆ کێ بەرم؟ تۆ نەبی بە هیوای ڕەحمی کێ بم؟ ئەی خوای من؟ من لایەقی ئەوەم نیە کە داوای بەهەشتت لێ بکەم. تەنیا داوای ئەوەت لێ دەکەم لە گوناهم خۆش بی؟

فانك اهل التقوى واهل المغفرة

## دەرسی پێنجەم

## حیکایەت

مالیکی کوڕی دینار ﵁ دەفەرمووێ: جارێك دەچووم بۆ حەج، لە ڕێگادا تووشی گەنجێك بووم بە پێیان دەڕۆیشت، نە ولاغی پێ بوو نە خەرجی ڕێگاو نە ئاوی خواردنەوە. سەلامم لێ کردو وەڵامی دامەوە، گوتم: ئەی جەوان لە کوێوە دێی؟ گوتی: لە لای خواوە. گوتم: ئەی بۆ کوێ دەچی؟ گوتی: بۆ لای خوا. گوتم: توێشوی ڕێگات کوا؟ گوتی: لەسەر خوایە. گوتم: ئەو ڕێگا دوورە بە بێ نان و ئاو تەواو نابێ دەبێ شتێکت پێ بێ، گوتی: کە وەڕێ کەوتم پێنج حەرفم لەگەڵ خۆم لە باتی توێشوی ڕێگا لەگەڵ خۆم هێنان.

پرسیم کام پێنج حەرفە؟ گوتی: خوای تەعالا فەرموویەتی ﴿ کهیعص ﴾ پرسیم ئەوە چ مانایەکی هەیە؟ گوتی: پیتی (کاف) یەعنی کافی، کیفایەت کوننده، پیتی ((ها)) یەعنی هادی واتا هیدایەت دەهندە، پیتی ((یا)) یەعنی یاری دەهندە، پیتی ((عەین)) یەعنی زاناو داننده، پیتی ((ص)) یەعنی صادق و ڕاستگۆ. گوتی: جا کەسێك هاوڕێی کیفایەت کوننده و هیدایەت دەهندەو یاری دەهندەو زاناو داننده و پەنا دەهندە بێ دەبێ ناڕەحەت بێ و لە هیچ بترسێ؟ ئایا پێویستە ئەو کەسە نان و ئاو لەگەڵ خۆی بەرێ بۆ سەفەر؟ مالیك دەفەرمووێ: کاتێ ئەو قسانم لێ بیست کراسەکی خۆمم دایەو قبوڵی نەکردو گوتی: ئەی پیرەمێرد پیاو ڕووت بێ باشترە لەوەی کراسی یەکی دی لەبەرکا. لە پاش مردن حیسابی ماڵی حەلاڵی دنیامان لەگەڵ دەکرێ و دەبێ عەزابی شتی حەرامیش بچێژین.

کاتێ شەو داهات ڕووی کردە ئاسمان و گوتی: ئەی ئەو کەسەی کە بە فەرمانبەرداری بەندەکان خۆشحاڵ دەبی و لە گوناه کردنیشیان زەرەر

ناکەی! شتێکم پێ ببەخشە کە دبێتە هۆی پێ خۆشحاڵیم کە ئیتاعەی تۆیەو لە شتێکم عەفوو بکە کە لەو عەفووەدا هیچ زەرەر ناکەی کە گوناهەکانی منە. لە پاشان کاتێ خەڵك ئیحرامی بەستو دەستیان کردبە (لبیك) گوتن: ئەو دەنگی نەدەکرد، گوتم: بۆ ((لبیك))ناڵێی؟ گوتی دەترسم ئەگەر بیڵێم : لە وەڵامدا بڵێن ((لا لبیك ولا سعدیك)) ئەو کاتە خاکی کوێ بکەم بەسەرمدا؟ ئەوەی گوت ورۆیشتو لە ڕێگادا نەم دییەوە.

ئاخری لە ((منا)) چاوم پێکەوت شیعری دەخوێندەوەو دەی گوت: ئەو خۆشەویستەی کە دەی هەوێ خوێنم بڕێژێ، چ لە حەرەمدا یا لە دەرەوەی حەرەم، خوێنم بەوی حەڵاڵە، بەخوا ئەگەر ڕۆحم بزانێ کە پەیوەندی بە کێ وەیە لە خۆشیان خۆی لە بیر دەچۆوە، ئەی ئەو کەسەی کە لۆمەم دەکەی! لەبەر ئەوەی عاشقی ئەوم لۆمەم مەکە. ئەو کەسەی کە من دەیبینم تۆ بت دیایە قەت قسەت نەدەکرد. ئەو خەڵکەی تەوافی کەعبە دەکەن ئەگەر بەدەوری خوادا بگەڕابانایە کاریان بە ماڵی خوا نەدەبوو. لە کاتی جێژنی قوربانیدا خەڵك مەڕو بزن دەکەنە قوربانی، بەڵام خۆشەویستەکەم داوای لێ کردووم گیانی خۆم بکەم بە قوربانی. خەڵك ئادابی حەجی بەجێ هێنا، بەڵام ئادابی حەجی من ویسالی دۆستە، ئەو دەتوانێ ڕۆحم ئارام بکاتەوە. لە پاشان دوعای کردو گوتی: خوایە! خەڵك بە هۆی قوربانی گیان لەبەرانەوە لە تۆ نزیك دەبنەوە، بەڵام من گیان نەبێ هیچم نیە بیکەم بە قوربانی، لێم قبوڵ کە. نەعرەتەیەکی لێداو گیانی دا بە حازریان. لە پاشان دەنگێك لە غەیبەوە هاتو گوتی: ئەوە دۆستی خوایە، ئەوە کوشتەی خوایە، مالیك دەڵێ: کفنو دفنمان کرد، شەو لە خەومدا دیم لێم پرسی چیت بەسەر هات؟ گوتی: ئەوەی بەسەر شەهیدەکانی غەزای بەدر هاتبوو.

## حیکایەت

پیـاوێکی گـەورە دەفـەرمووێ: بـۆ سـەفەری حـەج وەرێ کـەوتم، لـە کـاتی گەرمای هاویـنداو بـای سـەمووومی دەهـات. ڕۆژێك بە ڕێکـەوت لـە کاروان بە جێ مامو خەوم لێ کەوت، کاتێ لـەناکاو چـاوم هـەڵێنان لـەو بیابانە چـاوم بە کابرایەك کەوت، زۆر بە پەلە چووم بۆ لای، کوڕێکی منداڵ کار بوو، موو لە ڕیـشی نـەهاتبوو، دەتگـوت ڕۆژە لـە ناوەڕاسـتی ئاسمانـدا، ئاسـاری نـازو نیعمـەتی بـە نـاو چـەوانەوە دیـاربوو. سـەلامم لێ کـرد، لـە وڵامـدا گـوتی: ((وعلیکم السلام)) ئەی ئیبراهیم! زۆرم لا عـەجایب بوو نـاوی زانـیم، خـۆم بۆ ڕانەگیرا پرسیم کوڕە ئاغا؟ تۆ قەت منـت نـەدیوە چۆنت ناسیم؟ گوتی: ئەی ئیبراهیم لەو کاتەوە خوام ناسیوە قەت بێ خەبەر نـەبوومو لـەو کاتەشـەوە بە خزمەتی گەیوم قەت لێی دوور نەکەوتوومەوە، گوتم: بەو گەرمایە بۆ هاتووی بۆ ئەو لێڕەوارە،؟ گوتی: ئەی ئیبراهیم! لەگەڵ ئەو نـەبێ ئولفەتم بە کەسـەوە نەبووەو ئەو نەبێ کەسم دۆستو هاوڕێ نیە. گـوتم: وەسـیلەی ژیانـت چیە؟ گـوتی: ژیـانم لەسـەر خۆشەویـستەکەمە. گـوتم: بەخوا دەترسـم بەهۆی ئـەو قـسانەی کـە باسـم کـردن بـە هـیلاك بـچی، لـە کاتێکـدا فرمێـسك وەك دانـەی مرواری بەسەر گۆنایدا دەهاتە خوارێ ئەو شیعرانەی خوێندەوەکە دەڵێ: من کە لەو لێڕەوارەدا بۆ لای خۆشەویستەکەم دەچمو ئیمانم هەیە، کێ دەتـوانێ لـەو لێـڕەوارە بمترسـێنێ. عیـشق تینـی بـۆ هێنـاوم ئـارەزووی دیـدار ڕام دەپەڕێنێ.

دۆستی خوا قەت لەکەس ناترسێ. ئەگەر برسی بم یادی خوا تێرم دەکا. بە هۆی حەمدو سەنای خواوە تینویەتیم دەشکێ. ئەگەر بە دەگمەنیش لاواز ببم هێـزی عیشق لە حیجـازەوە دەم بـا بـۆ خوڕاسـان. گـوتی: تـۆ بە هـۆی منداڵیمەوە بە بچوکم دەزانی، تکایە لۆمەم مەکە، چونکە ئـەوەی دەبوو ببێ بـوو، گـوتم: تـو خـوا ڕاستم پـێ بڵـێ: تەمەنت چەندە؟ گـوتی: سـوێندت بـە

کەسێك دام  کە زۆر لام موحتەرەمە، دوازدە ساڵم. لە پاشان گوتی: ئیبراهیم! بۆ چی تەمەنی منت پرسی؟ گوتم: لەبەر ئەوەی قسەکانتم زۆر لا عەجایب بوو.

گوتی: شوکر بۆ خوا کە نیعمەتی زۆری داوە بە من‌و لە زۆر بەندەکانی گەورەتر کردووم. دەڵێ:  بە چاو پێکەوتنی سەرو رووی‌و قسەکانی قامکی خۆم گەزت‌و بە بێ ئیختیار گوتم: ((سبحان الله)) خوا چ سورەتێکی جوانی درووست کردوە؟ ماوەیەك سەری بەردایەوەو لە پاشان سەری بەرزکردەوەو بە جۆرێك سەیری کردم‌و چەند شیعری خوێندەوە: ئەگەر پاداشتم دۆزەخ بێ وەك بە هیلاك بچم وایەو ئەو جوانیەم دەدردێکم  دەرمان ناکاو عەزابی دۆزەخ جوانیەکەم  دەکا بە عەیب‌و فرێی دەداتە ناو دۆزوخەوەو ئەو کاتە خواوەندی جەببار دەفەرمووێ: ئەی خراپترینی بەندەکانی من!  تۆ یەکێکی لەو عەبدانەی بێ ئەمری منیان کردووە، تۆ لە دنیادا بەربەرکانیت لەگەڵ مندا دەکردو  سەرپێچیت لە فەرمانی من دەکرد. ئایا تۆ پەیمانی رۆژی ((ئەلەستت)) فەرامۆش کردبوو؟ یا رۆژی قیامەتت لەبیر خۆت بردبووەوە؟ لەو رۆژەدا وێنەی ئیمانداران وەك مانگ دەبینی‌و خواوەندی گەورە پەردەی نوور لە خۆی دوور دەخاتەوەو بە دیداری خوای گەورە پیاوانی خوا وەها مات دەبن لە خۆشیان هەموو خۆشییەکیان لە بیر دەچێتەوەو پەروەردگار خەڵاتیان دەکاو رەنگ‌و رووێکی گەشیان پێ دەبەخشێ.

لە دوای خوێندنەوەی ئەو شیعرانە گوتی: ئیبراهیم! دەرکراو ئەو کەسەیە کە لە دۆست دوورکەوتبێتەوەو ئەو کەسە بە دۆست دەگا کە لە فەرمانبەرداریدا بەهرەی بردبێ. گوتی: لە یادت نەچێ تۆش لە هاورێکانت بەجێ ماوی. گوتم: بەڵێ: راست دەکەی وایە. بۆ خاتری خوا دوعام بۆ بکە تا بیان گەمێ. رووی کردە ئاسمان‌و لەسەر خۆ شتێکی وت: جا نازانم چۆن بوو خەوم لێ کەوت یان بێ هۆش بووم نازانم، کاتێ هاتمەوە سەرخۆ، تەماشام کرد لەگەڵ

کاروانەکەمو سواری وشترم، گوێم لە هاوڕێکەم بوو گوتی: ئیبراهیم وریا بە نەکەویە خواریٚ؟ کاتیٚ تەماشام کرد کوڕە دیار نیە، نازانم نە ئاسمان هەڵیکێشا، نە ئەرز قوتی دا.لە دوای بڕینی ئەو ڕێگا دوورە کاتیٚ چوینە ((مەککە))و چوومە حەڕەم تەماشام کرد کوڕەکە پەردەی کەعبەی بەدەست گرتبوو دەگریاو ئەو شیعرانەی دەخوێندەوەو دەی گوت: من پەردەی کەعبە دەگرمو زیارەتی ماڵی خوا دەکەم، بەڵام ئەوەی لە دڵم دایە تۆ باشی دەزانی. من بۆ ماڵی خوا بە پێیان هاتوومو ئیستیفادەم لە هیچ وەسیلەیەك نەکردوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە تەمەنم کەمە عاشقی دڵ لە دەست دراوی تۆم. لەوکاتەوە کە نەمدەزانی عیشق چییە بۆ تۆ دەمرم. ئەگەر خەڵك بە هۆی خەتایەکەوە کە لەو ڕێگایە دا لە من ڕووی دابیٚو لۆمەم بکەن قسەم نیە، چونکە دەزانم لە مەدرەسەی عیشقدا تازە واریدم. ئەی خوایە! ئەگەر کاتی مردنم هاتووە عەیبی نیە، چونکە دەتوانم لە شەڕابی وەسڵی تۆ بەهرەمەند ببم. لە پاشان بیٚ ئیختیار سەری وە سوجدەکرد. دەڵیٚ: من هەر تەماشام دەکرد، لە پاشان چووم ڕام وەشاند وەفاتی کردبوو.

زۆر ناڕەحەت بووم چوومەوە لە لە مەنزڵەکەم دوو نەفەرو کفنم لەگەڵ خۆم هێنا لەویٚ نەمابوو، لە حاجیانم پرسی، کەس نەی زانی چی لیٚ هاتوە. گوتم: لەوانەیە خوا لە پێش چاوی خەڵکی شاردبێتەوە چوومەوە خەوم لیٚ کەوت، لە خەوەکەمدا کۆمەڵێکم خەڵك دی ئەو لەپێش هەموویانەوە بوو، لیباسێکی زۆر بە نرخی لەبەر دابوو، نووری لە ناو چەوان دەباری، گەتم: تۆ فلان کوڕی؟ گوتی: بەڵیٚ: گوتم: تۆ نەمردی؟ گوتی: بۆ چی؟ مردم. گوتم: بۆ کفنو دفنت زۆرت لیٚ گەڕام نەم دی یەوە. گوتی: ئەی ئیبراهیم! ئەو کەسەی کە منی لە شاری خۆم دوور خستەوەو عاشقی خۆی کردمو لە خزمو کەسو کاری جودا کردمەوە، کفنو دفنی کردم نەی هێشت پێویستم بە کەسی تر بیٚ.پرسیم: لە دوای مەرگ خوا چۆنی ڕەفتار لەگەڵ کردی ؟

عەرزم کرد خوایە: مەقسوودی من سەر نوێو ئەمیا ئارەزووی دیداری تۆم هەیە. فەرمووی: تۆ بەندەی ڕاستەقینەی منیو چی داوابکەی بێ دڵیت ناکەم. عەرزم کرد دەمەوێ شەفاعەتم بۆ ئەو کەسانە قبوڵ کەی کە هاو عەسری خۆمن. فەرمووی: ئەوا قبوڵم کرد.

ئیبراهیم دەڵێ: لە پاشان بۆ خوا حافیزی دەستی هێناو وەخەبەر هاتم. تا لە حەج بوومەوە زۆرم بیر دەکرد. لە گەڕانەوەدا کاروانیەکان دەیان گوت: ئەی ئیبراهیم! دەستت چەند بۆنێکی خۆشی لێ دێ. دەڵێن: تا وەفاتی کرد ئەو بۆنە خۆشەی لە دەستی هەر دەهات.

## حیکایەت

شێخ ئیبراهیمی خەواس ﵁ دەفەرمووێ: جارێك دەچووم بۆ حەج کۆمەڵێکی زۆر بووین لە ڕێگادا خەیاڵم هاتە سەر ئەوە بە جێیان بێڵمو بە تەنیا بڕۆم، لەبەر ئەوە ڕێگای ئەوانم تەرك کردو بە ڕێگایەکی تردا ڕۆیشتم. سێ شەوو ڕۆژ بەتەنیا ڕۆیشتم بیرم لە خواردنو خواردنەوە نەدەکردەوەو هیچ پێویستی تریشم نەبوو. لەپاش سێ شەوو ڕۆژ، تووشی دارستانێکی زۆر دڵگیرو سەوز بووم، ئەنواعی میوەو گوڵی ڕەنگاو ڕەنگی لێ بوو، سەرچاوەیەك لە ناوەڕاستیدا هەڵدەقوڵی، بەچاو پێکەوتنی مات بوومو وام زانی چوومە بە هەشتێکەوە. لەو فکرو خەیاڵەدابووم چاوم بە جەماعەتێك کەوت وێنەیان وەك ئینسان بوو، باڵا پۆشی پەشمینەیان لەبەر دابوو، پارچەیەکی جوانیان لە پشت بەستبوو. دەورەیان دامو سەلامیان کردو جوابی سەلامەکەم دانەوەو گوتم: ئێوە لە کوێنو من لە کوێم؟ وام زانی ئەوان ئەجیننەن لەو کاتەدا یەکیان گوتی: ئێمە ئیختیلافمان لە مەسەلەیك پەیدا کردووە، ئێمە لەو ئەجینانەین کە لە شەوی بەیعەتی عەقەبەدا گوێمان لە

قورئان خوێندنی پێغەمبەر ﷺ بوو، دەنگی خۆشی پێغەمبەر ﷺ لە هەموو کارێکی دنیایی گێڕایەوەو خوای تەعالا ئەو جێگایەی بۆ ڕازاندینەوە.

گوتم: بەینی ئێرەو ئەو جێگایەی کە لە هاوڕێکانم هەڵبڕاوم چەندە؟ یەکێکیان زەردەخەنەیەکی کردو گوتی: ئەی ئەبو ئیسحاق! هیچ کارێکی خوا بێ حیکمەت نیە، تۆو یەکی تر نەبێ هیچ ئادەمیزادێك تا ئێستا نەهاتۆتە ئێرە، تەنیا کوڕێك هاتۆتە ئێرەو ئەویش لێرە وەفاتی کردووە، ئەوە قەبرەکەیەتی. تەماشای قەبرەکەم کرد لە تەنیشت حەوزێك بوو، دەوری قەبرەکە هەموو گوڵی بۆن خۆش و ڕەنگاو ڕەنگ بوو تا ئەو کاتە ئەو جۆرە گوڵانەم نەدی بوو. ئەجیننەکە گوتی: لێرەوە تا لای کاروانیەکان چەند مانگە ڕێگایە. گوتم: باشە باسی ئەو کوڕەم بۆ بکە. یەکێکیان گوتی: ڕۆژێك لە ڕۆژان ئێمە لە قەراغ ئە حەوزە دانیشتبووین باسی عیشقمان دەکرد، ئەوکاتە لاوێك هات و سەلامی کردو جوابمان دایەوە گوتمان: لە کوێوە هاتوی؟ گوتی: لە شاری نەیشاپوورەوە. گوتمان: چەند ڕۆژە لەوێوە هاتوی.؟ گوتی: حەوت ڕۆژە. گوتمان: بۆ چی لە نەیشاپوور ڕۆیشتی؟ گوتی: لەبەر مەعنای ئەو ئایەتە کە خوای گەورە لە سوڕەی ((زمر))دا فەرموویەتی ﴿ وَأَنِيبُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّكُمۡ وَأَسۡلِمُواْ لَهُۥ مِن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَكُمُ ٱلۡعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿٥٤﴾ ﴾ الزمر: ٥٤
بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگارو سەری تەعزیمی بۆ دانەوێنن لەپێش ئەوەدا تووشی عەزاب بن و کەس فریاتان نەکەوێ. گوتمان: گەڕانەوە چیەو عەزاب چیە؟ کاتێ دەستی کرد بە باسی عەزاب نەعرەتەیەکی لێداو وەفاتی کردو لێرەمان ناشت.

دەفەرمووێ: بە بیستنی ئەو بەسەرهاتە واقم وڕماو و چوومە سەر گۆڕەکەی، تەماشام کرد دەستە گوڵێکی نێرگز لە سەر گۆڕەکەی بوو، لە لەوحێکیش

نووسرابوو((هذا قبر حبیب الله قتیل الغیرة)) ئەوە گۆڕی دۆستی خوایەو کوشتەی غیرەتە. لە گەلای نێرگزەکەش مەعنای گەرانەوە بۆ لای خوا نووسرابوو. بۆم بەیان کردن زۆر پێ خۆشحاڵ بوون و جەزبەیان گرت. کاتێ هاتنەوەسەر خۆ گوتیان: ئیشکالەکەمان حەل بوو، دەفەرمووێ: خەوم لێ کەوت و کاتێ وەخەبەر هاتم لە لای مزگەوتی حەزرەتی عایشە رضی الله عنها بووم لە نزیك ((مەککە)) دەبینم چەپکە گوڵێك لەناو لیباسەکانم دایە تا ساڵێك لام بوو ڕەنگ و بۆنی نەگۆڕابوو.

## حیکایەت

شێخ حەسەنی سەڕڕاج دەفەرمووێ: جارێك دەچووم بۆ حەج، کاتێ تەوافی کەعبەم دەکرد چاوم بە ئافرەتێکی زۆر جوان کەوت دەتگوت: مانگە دەدرەوشێ. بێ ئیختیار گوتم: بەخوا تا ئیمڕۆ ژنی وا جوانم نەدیوە، دیارە ئەو ژنە قەت غەمی نەدیوەو ڕەنجی نەکێشاوە.

کاتێ گوێی لە قسەکانم بوو گوتی: بەخوا زۆر غەمبارم و دڵم برینداره و کەسم نیە شەریکی غەمانم بێ. گوتم: بۆ چیت لێ قەوماوە؟ گوتی: مێردەکەم مەڕێکی سەر بڕی دوو کوڕی بچوکم یاریان دەکرد. منداڵێکی شیرەخۆرەشم بە باوەشەوە بوو. خەریکی گۆشتەکە بووم یەکێ لە دوو کوڕەکە بەوی تر دەڵێ: دەزانی باوکم مەڕەکەی چۆن سەربڕی؟ گوتی: نازانم. گەورەکەیان ئەوی لەخۆی بچوکتری ڕاکێشاو سەری بڕی، لە ترسان ڕای کردو گورگ خواردی. باوکی وەدوای کەوت ئەویش لە تینوان مرد. کوڕە شیرەخۆرەکەم داناو چوومە بەردەرگا چاوەڕوانی مێردەکەم بووم. تا چوومە ژوورەوە منداڵەکە بە گاگۆڵکێ چوو بوو مەنجەڵە ئاوی وەسەر خۆ گێڕابوو کوڵ وکۆی دا مردبوو.کچێکیشم لە ماڵی مێردی بوو کە ئەو خەبەرەی بیست بوو سەکتەی کردو مرد. ئەوەیە بەسەرهاتی من کە ئێستا بە تەنیا ماومەوە.

## دیمەنی مەرگ

گوتم: چۆن خۆت بۆ ئەو هەموو ناڕەحەتیە ڕاگرت؟ گوتی: ئەوەی بیر لە خۆڕاگرتن و خۆ ڕانەگرتن بکاتەوە دەزانێ فەرقیان زۆرە. سەبرو خۆڕاگرتن پاداشتی زۆرەو بێ سەبری بێ سەرئەنجامە. جا ئەو سێ شیعرەی خوێندەوەو ڕۆیشت. گوتی: سەبرم گرت چونکە سەبر باشترین پاڵ پشتە، ئەگەر بێ سەبری فایدەی بوایە بێ سەبر دەبووم، من لەسەر چەند مووسیبەتێك سەبرم گرتوە، ئەگەر ئەو مووسیبەتانە تووشی کێو بوونایە پارچە پارچە دەبوو. بەرگریم لە فرمێسکەکانم کرد تا بە چاومدا نەیێنەتە خوارەوەو هەڵڕژێنە سەر دڵم.

## حیکایەت

زوحاکی کوڕی موزاحیم ﷺ دەیفەرموو: جارێك شەوی جومعە زۆر ڕووناك بوو ویستم بچم بۆ مزگەوتی جامیعەی شاری ((کوفە)) . لە حەوشی مزگەوت لاوێکم دی سەری وە سوجدە کردبوو دەگریا، گوتم: ڕەنگە ئەو کوڕە ئەولیا بێ؟ چوومە نزیکی بزانم دەڵێ چی. دەی گوت: ئەی خوای گەورە! تەنیا ئومێدم بە تۆیە ، خۆزگەم بە حاڵی ئەو کەسە هەر ڕەزای تۆی دەوێ. خۆش بە حاڵی ئەو کەسە کە شەو بە ترسی تۆوە ڕۆژ دەکاتەوەو مووسیبەتی خۆی عەرزی تۆ دەکاو نەخۆشییەکی غەیری نەخۆشی عیشقی تۆی نیەو لە شەوی تاریکدا بە تەنیا داوای یارمەتیت لێ دەکاو تۆش بێ دڵی ناکەی. کاتێ ئەو قسانەی دەکرد فرمێسکی هەڵدەوەراندن. کە ئەوەم لێ دی زۆر بەزەییم پێدا هات و دەستم کرد بە گریان. ئینجا وای قسە دەکرد دەتگوت نوورێکی دیوەو گوێی لە دەنگێکە کە دەڵێ ئەی بەندەی من! من لە لاتم، تۆ لە ژێر چاودێری منداى، ئەوەی دەی لێی ئاگام لێیە، مەلائیکەی من موشتاقی دەنگی تۆن و لە هەموو گوناهەکانت خۆش بووم.

زوحاك دەفەرمووێ: سەلامم لێ کردو وەڵامی دامەوەو گوتم: خوای تەعالا لەو شەوە تاریکەدا بەرەکەتت بەسەردا ببارێنێ‌و ڕەحمەت پێ بکا ئەتۆ کێی؟ گوتی: ئەمن ڕاشیدی کوڕی سولەیمانم. کاتێ ناوەکەم بیست فەوری ناسیم، چونکە زۆر شتم لەبارەیەوە بیستبوو، زۆرم ئارەزووی دیداری بوو، تا ئیمڕۆ خوا کردە بە خزمەتی گەیشتم. داوام لێ کرد بهێڵێ لە خزمەتیدا بم، فەرمووی: ئەوە زۆر زەحمەتە، چونکە ئەوەی لە موناجاتی خالقی لەززەت بەرێ چۆن دەتوانێ ئولفەت بە مەخلوقەوە بگرێ فەرمووی: بەخوا ئەگەر یەکێك لە موشایەخی رابردوو بە لاماندا ڕابرێ: دەڵێ خەڵکی ئێستا باوەڕی بە ڕۆژی قیامەتیش نیە، ئەوەی گوت‌و ون بوو، نازانم چوو بۆ ئاسمان یا چووە ژێر زەمین. زۆرم پەرۆش بوو، لەبەر خوا پاڕامەوە تا نەمردووم جارێکی دی ببینم.

بە ڕێکەوت چووبووم بۆ حەج، تەماشام کرد لە ژێر سێبەری دیواری کەعبە لەناو کۆمەڵێك خەڵك دانیشتووە سوورەی ((انعام))یان دەخوێندەوە، کە چاوی بە من کەوت زەردەخەنەیەکی هاتێ‌و فەرمووی: ئەوە لوتفی عولەمایەو ئەویش تەواو زوعی ئەولیا بوو. ئینجا هەستا دەستی لە ئەستۆ کردم و فەرمووی: تۆ لە خوات داوا کردبوو کە لە پێش مەرگتدا چاوت بە من بکەوێ؟ عەرزم کرد بەڵێ: قوربان! دووعام کردبوو، فەرمووی ((الحمد لله علی ذلك)) عەرزم کرد خوا ڕەحمەت پێ بکا تکات لێ دەکەم ئەوەی ئەو شەوە دیبووت یان بیستبووت بۆم باس بکە. بە بیستنی ئەو قسەی من زۆر بە توندی نەڕاندی لام وابوو پەردەی دڵی دڕاو بێ هۆش کەوت، ئەوانەی لای بوون‌و قورئانیان دەخوێند بڵاوەیان لێ کرد. کاتێ وەهۆش هاتەوە فەرمووی: براکەم! تۆ نازانی لەو کاتەدا کە ئەسرارێکی خوا ئاشکرا بکەن دڵی دۆستانی خوا چەند دەترسێ؟

**دیمەنی مەرگ**

گوتم: باشە ئەوانە کێ بوون کە قورئانیان لە لا دەخویندی؟ فەرمووی: ئەوانە کۆمەڵێك ئەجننە بوون لەبەر ئەوەی دەیان ناسم ڕێزیان لێ دەگرم و هەموو ساڵێك لەگەڵ من دێن بۆ حەج و قورئانم بۆ دەخوێنن. ئەوجا مەرەخەسی کردمو فەرمووی: خوا هۆی مولاقاتمان لە بەهەشت پێکەوە بۆ ساز بکا کە لە بەهەشتا نە لێك جیابوونەوە هەیە، نەزەحمەت، نەڕەنج هەیە، نەغەم، ئەوەی گوت و لە پێش چاوم ون بوو لە پاشان چاوم پێ نەکەوتەوە.

## دەرسی شەش

## حیکایەت

محەمەد حوسەینی بەغدادی رضي الله عنه دەفەرمووێ: جارێك چووبووم بۆ حەج، لەناو بازاڕی ((مەککە)) پیرەمێردێکم دی دەستی کچێکی گرتبوو، هەرچەند کچەکە زۆر کزو ڕەنگ پەڕیو بوو، بەلاّم نوورانی بوو، کابرای پیرە بە دەنگی بەرز دەی گوت: کێیە ئەو کچەم لێ بکڕێ ؟ کێ یە ئەو کچەی خۆش بوێ؟ کێ یە بیست درەم نرخی بداو بەو شەرتەی لای کەس من بە تاوانباری عەیبەکانی دانەنێ. چوومە لای گوتم: نرخەکەم زانی، بەلاّم بزانم عەیبەکانی چین؟ گوتی: ئەو کچە شێتە. هەرکاتێ غەمی بوو تەواوی شەو نوێژ دەکاو بە ڕۆژ بە ڕۆژوو دەبێ، نە نان دەخوا نە ئاو دەخواتەوەو هەر پێی خۆشە بە تەنیا بێ؟

کە ئەوەم بیست کچەکەم زۆر خۆش ویست، کڕیمو بردم بۆ مەنزڵەکەم. تەماشام کرد سەری بەردابووەوە، لە پاشان سەری بەرزکردەوەو گوتی: ئاغا! خەڵکی کوێی؟ گوتم: عێراقیم. گوتی: کام بەشەی عێراق؟ ((بەسرە)) یان ((کوفە)) گوتم: نە بەسرە نە کوفە. گوتی: کەواتە بەغدایی؟ گوتم: بەڵێ: لە خۆشیان هاواری کردو گوتی: بەغدا شاری عابیدانە، شاری زاهیدانە، زۆرم لا عەجاییب بوو کەنیزەکێك کە دەستاو دەست هاتووە چۆن ئاگای لە زاهیدانو عابیدانە؟ بە گاڵتەوە گوتم: لەناو ئەو عابیدانەدا کامەیان دەناسی؟ گوتی: مالیکی کوڕی دینار، بیشری حافی، سالحی مەڕی، ئەبوو حاتەمی سەجستانی، مەعرووفی کەرخی، محەمەدی کوری حوسەینی بەغدادی، رابیعەی عەدەوی، شەعوانەو مەیموون دەناسم. گوتم: تۆ چۆن ئاگات لە ئەحواڵی ئەوانەیە؟ گوتی: ئەی جەوان! چۆن ئەحواڵی ئەوانە ئاگادار نابم؟

## دیمەنی مەرگ

بەخوا ئەوانە تەبیبی دلآنن، ئەوان ڕێگا نیشاندەری عاشقانن و عاشقان بە مەعشوقیان دەگەیەیێنن.

ئینجا ئەو شیعرانەی خوێندەوەکە دەڵێ: ئەوانە بیریان لای خوایەو بیر لە کەسی تر ناکەنەوەو تەنیا مەقسودیان هەر خوایەو ڕەزابوونی خوایە، نە کاریان بە دنیایەو نە بەخۆشی دنیا، نە لەززەتی خواردنی خۆش و نە خۆشەویستی ئەولاد ڕایان دەکیشێ نە زۆری ماڵی دنیا و نەلیباسی جوانیان بە خەیاڵ دا دێ.

لە پاشان گوتم: ئەی کچە! ئەمن محەمەدی کوڕی حوسەینی بەغدادیم گوتی: لە خوام دەخواست لە جێگایەگ تۆ ببینم. ئەو دەنگە خۆشەت چی لێهات کە دڵی موریدانت پێ زیندوو دەکردەوەو چاوی گوێ گرانت ڕووناك دەکردەوە؟

گوتی: توخوا هێندێکم قورئان بۆ بخوێنە. کاتێ دەستم کرد بە بسم الله، هاواری کرد و بێ هۆش بوو . کەمێکم ئاو بە دەم و چاو داکرد تۆزێك باشتر بوو گوتی: ئەوەی بە بیستنی ناوی وی ئاوای بەسەر بێ؟ دەبێ لە بەهەشتا ئەو ببینێ حاڵی چۆن بێ؟ جا گوتی: خوای تەعالا ڕەحمەت پێ بکا، دووبارە بیخوێنە، ئەو ئایەتەی سووڕەی ((جاثیە))م بۆ خوێندەوە کە دەفەرمووێ ﴿ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجْتَرَحُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ سَوَآءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ ۚ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ الجاثیة: ٢١ ئایا ئەوانەی کە خەراپە دەکەن و وابیردەکەنەوە کە لە ژیان و مردندا وەك ئیمانداران و کردەوە چاکن؟ وانیەو ئەو بۆچوونەیان غەڵەتە. کە ئەو ئایەتەی بیست گوتی: شوکر بۆ خوا کە من نە غەیری خوام پەرستووە، نە بتێکم ماچ کردووە. دەی بخوێنە خوا ڕەحمت پێ بکا. جا ئەو ئایەتەی سووڕەی (کهف))م بۆ خوێندەوە کە دەفەرمووێ ﴿ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ

﴿ فَلْيَكْفُرْۚ إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَاۚ وَإِن يَسْتَغِيثُواْ يُغَاثُواْ بِمَآءٍ كَٱلْمُهْلِ يَشْوِى ٱلْوُجُوهَۚ بِئْسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتْ مُرْتَفَقًا ﴿٢٩﴾ ﴾ الكهف: ٢٩ واتا ئێمە ئامادەمان کردووە بۆ ستەمکاران ئاگرێك کە سەراوپەردەی ئەو ئاگرە دەوری ئەوانی داوەو ئەگەر داوی ئاو بکەن ئاوێکی وەك مسی تواوەی داغیان دەدرێتێ و دەم و چاویان دەبرژێنێ و بە ڕاستی خواردنەوەیەکی خراپەو جێگایەکی ناخۆشە ئاگر.

گوتی: تۆ دەڵی خۆت نا ئومێد کرد، با هەمیشە دڵت لە بەینی خۆف و ڕەجا دابێ، ڕەحمەتی خوات لێ بێ بخوێنە، ئەو ئایەتەی سوورەی ((عبس)) و سوورەی ((قیامەت))م بۆ خوێندەوە کە دەفەرمووێ: ﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ مُّسْفِرَةٌ ﴿٣٨﴾ ضَاحِكَةٌ مُّسْتَبْشِرَةٌ ﴿٣٩﴾ ﴾ عبس: ٣٨ - ٣٩ . ﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾ ﴾ القيامة: ٢٢ - ٢٣ واتا لەو ڕۆژی قیامەتەدا چەند دەم و چاوێك گەش و دەم بە پێکەنین و چەند دەم و چاوێك ڕووناکن و تەماشای جەمالی خوا دەکەن. کە ئەوەی بیست گوتی: ئای چەندم ئارەزووی ئەو ڕۆژەیە کە بە خزمەتی دەگەم و خۆی نیشانی دۆستانی دەدا.

گوتی: دووبارە بخوێنە ڕەحمەتی خوات لێ بێ. ئەو ئایەتەی سوورەی ((واقیعە))م بۆ خوێندەوە کە دەفەرمووێ: ﴿ يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَٰنٌ مُّخَلَّدُونَ ﴿١٧﴾ بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ ﴿١٨﴾ لَّا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنزِفُونَ ﴿١٩﴾ ﴾ الواقعة: ١٧ - ١٩ تا دەگاتە ﴿ لِّأَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٣٨﴾ ﴾ الواقعة: ٣٨ واتا دەگەڕێ بەسەر ئەهلی بەهەشتا چەند غولامێکی پایەدار بە پیاڵەو مەسینەو پەرداغی شەڕابێ کە قەت سەری ئینسان نا ئێشێنێ و سەرخۆشی ناکاو میوەی هەڵبژاردەو گۆشتی باڵندەو حۆری چاو جوان وەك دانەی مرواری یان دەدرێتێ لە پاداشتی کردەوەی چاکیانداو قسەی بێ مەعنا نابیستن سەلامی

گەرم نەبێ. دادەنیشن لەبن داری بێ درِك‌و داری مۆزو لەسەر فەرشی ڕازاوە میوەی نەبڕاوەی بەهەشت دەخۆن‌و لەگەڵ کچی دەست لێ نەدراوی هاوتەمەنی خۆیاندا ڕای دەبوێرن.

ئینجا پێی گوتم: وادیارە تۆش حۆریت دەست نیشان کردووە، ئایا بیرت لە حەقە مارەییەکان کردۆتەوە یان نا؟ گوتم: حەقە مارەییەکان شەو نوێژو ڕۆژو گرتن‌و یارمەتی فەقیرو هەژارانە. جا ئەو شیعرانەی خوێندەوە کە دەڵێ:

ئەی ئەو کەسەی کە دەت هەوێ حۆری نیقاب پۆش نیشانە بکەی،هەستەو تەنبەڵی وەلانێ‌و جیهادی نەفس بکە و خۆڕاگربەو شەو نوێژ بکەو بەڕۆژوو بە، ئەوەیە حەقە مارەیی حۆریان. ئەگەر بە چاوی خۆت لەو کاتەدا بیان بینی کە تەماشات دەکەن‌و لەگەڵ کچی هاوتەمەنی خۆیان دەڕۆن‌و مەمکیان وەك دوو هەنار لەسەر سینگیان قوت بوەتەوەو گەردەنبەندی درەخشان لەسەر سینەی نەرم‌و نۆڵیان دێت‌و دەچێ‌و یاری دەکا، تەواوی خۆشی دنیات لەبیر دەچێتەوە. ئەو شیعرانەی خوێندەوەو بێ هۆش کەوت. کاتێ ئاوم بە دەم دا کرد تۆزێك هاتەوە سەر خۆی‌و گوتی: لە عەزاب بم پارێزە چونکە دان بە تاوانەکانم دەنێم‌و تۆش چاو پۆشیت لێ کردوون، تۆ زۆر بەخشندەو میهرەبانی. خەڵك من بە باش دەزانێ، بەڵام ئەگەر تۆ عەفووم نەکەی خراپترین کەسم، هیچ چارەم نیەو ئەوە نەبێ کە ئومێدم بە عەفووی تۆبێ. کە ئەو شیعرانەی تەواوکرد دووبارە بێ هۆش بووەوە. کە چووم تەماشام کرد وەفاتی کردبوو، زۆر ناڕەحەت بووم، هەستام چووم خەریکی شتی کفن‌و دفنی بووم کاتێ لە بازاڕ هاتمەوە دیم کفن کراوەو عەتری پیا کراوە، کفنەکەی سەوز بوو وەك لیباسی خەڵکی بەهەشت بەنوور دوو دێڕی لەسەر نووسرابوو، یەکەمیان ﴿أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ

يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾ یونس: ٦٢ یەعنی ئاگادارین کە ئەولیای خوا ترسیان لەسەر نیەو مەحزوون نابن لە دوا ڕۆژدا.

دەفەرمووێ: لەگەڵ دۆستان بردمان بۆ گۆڕستانو نوێژمان لەسەر کردو تەسلیم مان کردو سوورەی یاسینم لەسەر خوێندو هاتمەوە حوجرەکەم.

زۆرم پەرۆش بوو، دوو ڕکاتم نوێژ کردو خەوم لێ کەوت. لە خەومدا لەناو باخچەی بۆن خۆشی زەعفەرانی بەهەشتدا پیاسەی دەکرد، لیباسی ئاوریشمی زڕکفتی لەبەردابوو ، کەوشێکی سووری لە پێ کردبوو، تاجی گەورەی لەسەر سەر بوو، بۆنی میسكو عەنبەری لێ دەهاتو وەك مانگو ڕۆژ دەدرەوشا. بانگم کردو گوتم: ڕاوەستە با بزانم ئەو مەقامە بەرزەت بە چ کردەوەیەك دەست کەوت؟ گوتی: بەهۆی ڕوو خۆشی لەگەڵ فەقیرانو زۆری ئیستیغفارو لابردنی ناڕەحەتی لەسەر ڕێگای موسڵمانانەوە. ئنجا سێ شیعری خوێندەوەو گوتی:

ئەوکەسەی شەو بەخەبەر بێو لە شەوقی خودا شەو بەڕۆژ بکاتەوەو لەسەر گوناهەکانی بگریو شەو بە تەنیا نوێژبکاو لە ترسی عەزابی خوا ئەستێرەکان حیساب بکا. خوا حافیزو یارمەتی دەری دەبێ.

## حیکایەت

دەڵین: عادەتی شێخ ئیبراهیمی خەواس رضي الله عنه وابوو کە دەچوو بۆ سەفەر نە بەکەسی دەگوتو نە کەس دەیزانی، ئافتاوەیەکی بەدەستەوە دەگرت و دەڕۆیشت. حامیدی ئەسوەد فەرمووی: جارێك لە مزگەوتێك لە خزمەتی دابووم وەك جاران ئافتاوەکەی بەدەستەوە گرتو ڕۆیشت، منیش بەدوایدا ڕۆیشتم تا گەیشتینە شاری ((قادسیە)) گوتی: حامید! دەت هەوێ بۆ کوێ

بچی؟ عەرزم کرد قوربان وەدوای تۆ کەوتووم، فەرمووی: من دەچم بۆ ((مەککە)) عەرزم کرد ئینشاء الله منیش دێم بۆ ئەوێ.

لە پاشان سێ شەوو ڕۆژ کوڕێك هات لەگەڵمان شەوو ڕۆژ پێکەوە بووین نوێژی نەدەکرد. عەرزی شێخم کرد قوربان! ئەو کوڕە نوێژ ناکا. شێخ لێی پرسی بۆ نوێژ ناکەی؟ گوتی: من نوێژم لەسەر نیە، شێخ فەرمووی: بۆ تۆ موسڵمان نی؟ گوتی: نەخێر، من مەسیحیم‌و لە مەسیحییەتیشدا پابەندی تەوەکولم. نەفسم لای وابوو لە پەنا بەخوادا کامیلە. بەڵام داواکەم ڕەد کردەوەو هێنام بۆ ئەو دەشت‌و بیابانە کە خوانەبێ کەسی لێنیە تا تاقی کەمەوە. شێخ کە ئەوەی لێ بیست کەوتە ڕێ‌و فەرمووی: کارت بەسەر ئەوەوە نەبێ‌و لێی گەڕێ با بێ لە گەڵمان. لەگەڵمان هات تا گەیشتینە ئەو جێگایەی کە ناوی ((بطن مرد)) بوو. شێخ لیباسەکانی دانا شتنی‌و لە کوڕەکەی پرسی ناوت چیە؟ گوتی: ((عبدالمسیح)) شێخ فەرمووی: ئەی ((عبدالمسیح))! ئێرە دەروازەی ((مەککە)) یەو خواش چوونی کافرانی بۆ ((مەککە)) قەدەغە کردووەو لە سووڕەی ((تەوبە)) دا فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلَا يَقْرَبُواْ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ ﴿٢٨﴾ ﴾ التوبة: ٢٨ یەعنی کافر دڵیان پیسە نابێ بێن مزگەوتی ((مەککە)) وە. تۆ نەفسی خۆت تاقی کردەوە حەقیقەتی نەفست بۆ ئاشکربوو، کەواتە ئاگاداربە با یەکێك لە ((مەککە)) نەت بینێ و ئیرادت لێ بگرێ مەیە. شێخ حامید دەڵێ: بەجێمان هێشت‌و چووین بۆ ((مەککە)) کاتێ چووین بۆ عەرەفات دیم کوڕەکە ئیحرامی بەستووە، هەر کە ئێمەی دی هاتە پێشەوە، شێخ فەرمووی:

عبدالمسیح! چی ڕوویداوە؟ گوتی یا شێخ وا مەڵێ، عبدالمسیح نیم. بەڵکو بەندەی ئەوکەسەم کە حەزرەتی مەسیحیش بەندەی ئەوبوو. شێخ فەرمووی: بەسەرهاتی خۆتمان بۆ بگێڕەوە. گوتی: لە پاش ڕۆیشتنی ئێوە کاروانێك

## دیمەنی مەرگ

هات موسڵمان بوون ئیحرامیان بەست منیش ئیحرامم بەستو هاتین بۆ ((مەككە)) كە چاوم بە ماڵی خوا كەوت هەستم كرد دینی ئیسلام نەبێ ئەوانی تر هیچ نین، فەوری چوومە حەمامو موسڵمان بوومو لە پاشان ئیحرامم بەستو هاتم بۆ عەرەفات لە بەیانیەوە تا ئێستا لێتان دەگەڕێم. فەرمووی: لە دوای ئەوە هەمیشە پێكەوە بووینو تا وەفاتی كرد لەگەڵ سۆفیان بوو.

### حیكایەت

باڵوول ﷺ دەفەرمووێ: جارێك بە یەكێك لە خیابانەكانی ((بەسرە))دا دەڕۆیشتم: چاوم بە چەند منداڵێك كەوت یاریان بە گوێزو بادام دەكرد. لە نزیك ئەوانیش ، كوڕێكی بچووك بە تەنیا دەگریا. چووم گوتم: كوڕم! مەگری من گوێزو بادەمت بۆ دەكڕم تا بچی یاریان لەگەڵ بكەی. بە لۆمەوە تەماشای كردمو گوتی: ئەی ئەحمەق! تۆ لات وایە ئێمە بۆ یاری كردن هاتووینەتە سەر دنیا؟ گوتم: ئەی بۆچی هاتوینەتە سەر دنیا؟ گوتی بۆ كەسپی عیلمو عیبادەت. گوتم: خوا تەمەنت درێژكا ئەو قسانە لەكوێ فێر بووی. گوتی: خوای گەورە لە سوورەی ((المؤمنون)) دا دەفەرمووێ: ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا ﴿١١٥﴾ ﴾ المؤمنون: ١١٥ ئایا وازەن دەبەن كە ئێوەمان بە خۆرایی درووست كردووە؟ گوتم: كوڕم! دیارە تۆ زانایەكی گەورەی، ئامۆژگاریەكم بكە، لەوەلامدا ئەو چوار شیعرەی خوێندەوە كە دەڵێ:

تەماشا دەكەم دنیا دەبڕێتەوە ئەو كەسەی لە دنیادا دەژی لەسەر ڕۆیشتنە. كەواتە نەدنیا بۆ كەس باقی دەبێو نە كەس بۆ دنیا. وادێتە بەرچاو كە مەرگو بەدبەختی وەك دوو ئەسپی سەركێش زۆر بە پەلە دەچن بۆ لای ئینسانو دەیان هەوێ قاچی بشكێنن. جا ئەی ئەحمەق! تۆ كە عاشقی ماڵی دنیای زووكە لەو دنیا فانیە شتێك بەدەست بێنە كە لەو دنیای باقی

## دیمەنی مەرگ

بەدەردت بخوا. لە پاش خوێندنەوەی ئەو شیعرانە ڕووی کردە ئاسمان‌و دەستی بۆ دوعا بەرزکردەوەو فرمێسکی وەك دانەی مرواری هەڵوەراندن‌و دەلەرزی‌و دەی گوت: ئەی ئەو زاتەی شایەنی خۆ بەکم گرتنی ئێمەی‌و جێگای پشتبەستنی ئێمەی. تەنیا تۆی کە ئەوەی ئومێدی بە تۆ بێ نائومێدی ناکەی‌و ئارەزووی بەجێ دێنی.

کە ئەو شیعرانەی تەواوکرد بێ هۆش کەوت؟ چووم سەریم لەسەر ڕانم دانا و بە فەقیانەکەم تۆزم لێ تەکاند. کە وەهۆش هاتەوە گوتم: کوڕم! بۆ ئەوەندە دەترسی؟ تۆ ئێستا زۆر منداڵی. هیچ گوناهت لە دەفتەری ئەعمالدا نیە. گوتی: بڕۆ بەولاوە. من هەمیشە چاوم لە دایکم بوو کە ئاگری دەکردەوە لە پێشدا داری بچووکی پێوە دەنان جا داری گەورە. دەترسم لەوەی کە نەبادا لەباتی داری بچووك من بە ئاگری دۆزەخەوە نێن. گوتم: کوڕە ئاغا! تۆ فەیلەسوفێکی گەورەی تکا دەکەم ئامۆژگاریەکم بکە. ئەو شیعرانەی خوێندەوە کە دەڵێ.

من تەواوی کاتی تەمەنم بە غەفڵەت گوزەراند. هەرچەند فریشتەی مرگ بەدوای مندا دەگەڕێ ئەگەر ئیمڕۆ نەمرم بەیانی هەر دەمرم دنیا بەجێ دێڵم. خۆم بە لیباسی نەرم‌و ناسك ڕازاندۆتەوە لەگەڵ ئەوەشدا کەقەرارە لە گۆڕدا برزێ‌و لێك جیاوەبێ. دەڵێی ئێستا چاوم لەو دیمەنەیە کە بەدەنم لە گۆڕدا دەڕزێ، ئەو هەموو خاکەم لەسەر دەبێ‌و تەواوی جوانیەکام لە بەین دەچێ.

تەنانەت گۆشت‌و پێستم لێك جیادەبنەوە. دەبینم تەمەنم خەریکە تەواو دەبێ‌و زۆر لە ئارەزووەکانم پێك نایەن. سەفەرێکی درێژم لە پێشەو ئەسپابی سەفەریشم ئامادەنیە. لەبەرامبەر ئەو مەلائیکەتانەی کە حەرەسی کردەوەی خراپەن خۆم ڕاگرت‌و بە ئاشکرا گوناهم کردن‌و زۆر کاری خراپم کرد ئێستا ناکرێ تۆڵەیان بکەمەوە. بەدزی زۆر گوناهم کرد تا خەڵك نەزانن،

بەڵام ئەو هەموو گوناهەی کە ئیمڕۆ لە پێش چاوی خەڵك ونن، بەیانی لای مالیکی حەقیقی ئاشکرا دەبن.

دیارە لەخوا دەترسم، بەڵام زۆرم ئومێد بە عەفووی بوو دەمگوت بەخشندەو میهرەبانەو هەر ئەو دەتوانێ خەڵك عەفووکا، بێ شك ستایش هەر بۆ زاتی پاکی خوایە. ئەگەر لە پاش مردن هیچ بەڵایەك گەورەتر لە ڕزین و لێك بڵاوبوونەوەی بەدەن نەبێ و لەلایەن خواوە مژدەی بەهەشت و ترسی دۆزەخ نەبووایە دووبارە مەرگ و لە دوای مەرگ بۆ ئاگاداری و گەڕانەوە بە خراپە کافی بوو، بەڵام چی بکەم عەقڵم لە دەست دابوو.

خۆزگە بەخشندەی گوناه چاوپۆشی لە گوناهەکانم دەکرد. کاتێ بەندەیەك گوناه دەکا ئاغاکەی عەفووی دەکا. بێ گومان من لەو هەمووبەندانە خراپترم کە پەیمانی ئاغاکەیان شکاندووە. وەك بەندەی خەراپ قەول و قەرارم باوەڕی پێ ناکرێ. ئەی مەولای من!

دەبێ کاتێ ئاگری غەزەبی تۆ بەدەنم دەسووتێنێ حاڵم چۆن بێ؟ چونکە دەزانم کە ڕەقترین بەرد خۆی بۆ سووتانی ڕاناگرێ، کاتی مەرگ بەتەنیا دەمینمەوە، دەچمە گۆڕەوەو لە گۆڕدا بە تەنیا زیندوو دەبمەوە،و لە هیچ جێگایەك کەس یارو یاوەرم نابێ. جا لەبەر ئەوەی ئەی خوای تاك و تەنیا ڕەحم بە کەسێك بکە کە بە تەنیا ماوەتەوە.

باڵووڵ دەفەرمووێ: بیستنی ئەو شیعرانە ئەوەندەیان کار تێکردم بێ هۆش بووم، کاتێ هاتمەوە سەرخۆ، کوڕەکە لەوێ نەمابوو، لە منداڵەکانی ترم پرسی ئەو کوڕە کێ بوو؟ گوتیان: تۆ نەت ناسی؟ لە ئەولادی ئیمامی حوسەین بوو، گوتم: بەڕاستی گفتوگۆکەم زۆر لا عەجایب بوو، من خۆم بەدوای ئەو درەختەدا دەگەڕام، دەمویست بزانم کە ئەو میوەی کام درەختە، بەڕاستی دەبێ میوەی ئەو درەختە بێ خوای تەعالا بەبەرەکەتی ئەو خانەوادە بەهرەمەندمان بکا.

## حیكایەت

شێخ ئەبوو سەعیدی موسڵی ﷺ دەفەرمووێ: كاتێ فەتحی كوڕی سەعید لە دوای نوێژی جەژنی قوربان لە مزگەوت دەگەڕایەوە، تەماشای كرد دووكەڵی برژاندنی گۆشتی قوربانی لە كورەخانەی ماڵان بەرزدەبێتەوە، دەستی كرد بە گریان و گوتی: ئەی خۆشەویستی من! خەڵك بەهۆی قوربانی كردن لە تۆ نزیك دەبنەوە، خۆزگە دەمزانی بۆ وەدەست هێنانی ڕەزای تۆ چی باشە تا بیكەم بە قوربانی؟ ئەوەی گوت و بێ هۆش بوو بەلادا هات، دەفەرمووێ: ئاوم بەدەم و چاوداكرد لە پاش ماوەیەك وەهۆش هاتەوە، هەستا ڕۆیشت، كاتێ گەیشتە ناو كوچەی شار، ڕووی كردە ئاسمان و گوتی: خۆشەویستەكەم! هەڵگرتنی باری غەم و ڕەنجی جوداییم و گەڕانم بە كوچەی شاراندا دەزانی. تاكەی لە زیندانی دنیا ڕام دەگری؟ ئەوەی گوت و دووبارە بێ هۆش بووەوە. ئاوم پێداكرد وەهۆش هاتەوە و لە پاش چەند ڕۆژ وەفاتی كرد.

## دەرسی حەوت

### حیکایەت

یەکێ لە فەرمانڕەوایانی بوخارا کە زۆر زاڵم بوو. غاری بە ئەسپەکەی دەکرد، لە ڕێگادا سەگێکی گەڕۆڵی دی لە سەرمان هەڵدەلەرزی، زۆری بەزەیی پێدا هاتەوەو بۆی گریا، ڕووی کردە خزمەت کارێكو گوتی: ئەو سەگە بەرەوە بۆ قەسرەکەی منو تا دەگەڕێمەوە ئاگات لێی بێ، کاتێ هاتەوە داوای سەگەکەی کردو دەستووریدا لە گۆشەیەکی قەسر زنجیری کەنو نانو ئاوی بدەنێو بە شانە دای هێننو بالآ پۆشی بەنرخی پێدادەنو ئاگری لە نزیك بکەنەوە تا سەرمای نەبێ.

دوو ڕۆژ تێپەڕی کابرا مرد. پیاوێکی گەورە لە خەویدا چاوی پێ کەوت پرسیاری لێ کردو گوتی: کە مردی چیت بەسەر هات؟ گوتی: خوای تەعالا لەبەرامبەر خۆی دایناموو فەرمووی: تۆ سەگ بوویو کردەوەت وەك ئینسانان نەبوو، بەڵکو وەك سەگان بوو، بەڵام بە هۆی چاکەت لەگەڵ ئەو سەگە عەفووم کردی، ئەوەی لەسەرتە من بۆت دەدەمەوە.

خواوەندی گەورە زۆر بە ڕەحمەو لە هەموو پاشایەك خاوەن کەرەم ترە. ئەگەر چوکترین کردەوە ئینسان قبوڵ بکا ئینسان ڕزگاری دەبێ. دەبێ ئینسان هەمیشە خەریکی ڕەزابوونی خوا بێ، چونکە نازانێ چ کاتێ یەکێ لە کردەوەکانت قبوڵ دەکا.

### حیکایەت

عبدالله ی کوڕی عەبباس ﵄ دەفەرمووێ: قارِوون کوڕی مامی حەزرەتی مووسا علیە سلام بوو، لە زانیاری دنیاییدا زۆر پێشکەوتوو بوو، حەسوودی بە حەزرەتی مووسا دەبرد، ڕۆژێك حەزرەتی مووسا فەرموی: خوای گەورە

ئـەمری فـەرمووە: زەكاتـت لێ وەرگـرم. قـارِوون گـوتی: نـای دەمو بەخـەڵكی گـوت: ووریـابن مووسـا دەی هـەوێ بەبەهانـەی زەكاتـەوە پارەكـەتان لێ بستێنێ. مووسا گوتی: نوێژبكەن نوێژتان كرد، چەند دەستووری تری دا بە قسەتان كـرد. ئێـستاش دەیهـەوێ زەكاتتـان بەسـەردا بـسەپێنێ. خەڵكەكـە گوتیـان: ئێمـە قبـوڵی ناكـەین تـۆ بیریكـی لێبكـەوەو چارەیەكی بـۆ بدۆزەوە. قـارِوون گـوتی: شـتێكم بـە خەیاڵـدا هـاتووەو نەخـشەم ئەوەیـە ئافرەتێكی فاحیشە رِازی بكەین كە هاواربكاو بڵێ: مووسا زینای لەگەڵ كردووم.

خەڵك بە وەعدەی پارەیەكی زۆر ئافرەتێكیان رِازی كـرد كـە بەدرۆ ئـەو قسە بڵاووەكا، كاتێ ئافرەتەكە وەعدەی دا، قارِوون چووە لای حـەزرەتی مووسـاو گوتی: تەواوی بەنی ئیسرائیلییەكان كۆوەكەو هەر دەستوورێكی كە لە لایەن خواوە بۆت هاتووە پێیان رِاگەیەنە.

حـەزرەتی مووسـا علیـە سـلام پـێش نیهادەكـەی قبـوڵ كـرد، هـەموو بـەنی ئیـسرائیلیەكانی لـە دەوری خـۆی كـۆوەكردەوە. كـاتێ هـەموویان كۆبونـەوە حەزرەتی مووسا دەسـتی كـرد بـە باسـی بـەیانی ئـەحكامو یاسـای دینـیو فەرمووی: خـوای تـەعالا فـەرمانی داوە كـە تـەنیا ئـەو بپەرستنو شـەریكی بـۆ قەرار نەدەینو لەگەڵ خزمو كەسوكاری خۆمان میهرەبان بین. ئـەوەو چـەند یاسـایەكی تریـشی بـەیان كـرد. تەنانـەت ئەوەشـی فـەرموو: كـە ئەگـەر ژنو پیاوێـك ژنو مێـرد بـنو زینـا بكـەن دەبـێ رِەجـم بكـرێن، كـاتێ خـەڵك ئـەو حوكمەیان بیست گوتیان: ئەی ئەگەر تۆ زینات كرد چی؟ حەزرەتی مووسا فەرمووی: ئەگەر منیش زینـام كـرد بەردبارانم كـەن. خەڵكەكە گوتیـان: دەی تۆ زینات كردووە. حـەزرەتی مووسا بەسـەر سوورِمانەوە فەرمووی: ئـەوە چ قسەیەكە دەی كەن؟ من زینام كردووە؟ گوتیان: بەڵێ قوربان جەنابت زینـات كـردووە. ئینجا چوون ئافرەتـە فاحیشەكەیان بانگ كردو گوتیـان: تـۆ دەت هـەوێ لـەبارەی مووسـا چ بڵێـی؟ حـەزرەتی مووسـا رِووی كـردە ئافرەتەكـەو

فەرمووی: بەخوات سوێند دەدەم بڵێ بزانم دەڵێی چی؟ ژنە گوتی: لەبەر ئەوەی سوێندیاندام نابێ درۆ بکەم. ڕاستی ئەوەیە کە ئەوانە وەعدەی پارەیەکی زۆریان بە من داوە تا تۆ بەو کردەوە خراپە تاوانبار بکەم، لە سووڕەتێکدا کە تۆ بە تەواوی لەو کردەوە بەری.

کاتێ حەزرەتی مووسا ئەوەی لە ئافرەتەکە ببیست دەستی کرد بە گریان‌و بە سوجدەدا کەوت. لە سوجدەدابوو کە لە لایەن خواوە وەحی بۆ هات کە ئەی مووسا! وەختی گریان نیە، بۆ سەرزەنیشتی ئەوان تەواوی زەویمان لە ئیختیاری تۆنا، هەر فەرمان‌و دەستوورێك بدەی لەبارەی ئەوانەوە گوێ زەوی بێ ئەمریت ناکا.

حەزرەتی مووسا سەری لە سوجدە بەرزکردەوەو ڕووی کردە ئەرزو فەرمووی: ئەی زەوی! بە ئەمری خوا بە زەویاندا بەرە خوارێ: ئەرز ئەوانی تا قولاپیان بردە خوارێ‌و هاواریان کردو داوای عەفوویان لە حەزرەتی مووسا کرد حەزرەتی مووسا دووبارە فەرمووی: ئەی زەوی بیان بەرە خوارێ. زەوی تا گەردەنیان قوتی دان، دووبارە هاواریان کردو حەزرەتی مووسا گوێی نەدانێ‌و فەرمووی: بیان بەرە خوارێ. بەدەستوورو فەرمانی خوا، ئەرز هەمووی قوت دان.

ئینجا لە لایەن خواوە وەحی کرا بۆ لای حەزرەتی مووسا کە ئەی مووسا! ئەوانە پەنای عەفوویان بۆ تۆ هێناو داوای عەفوویان لێ کردی، بەلاّم تۆ گوێت نەدانێ‌و عوزرت لێ قبوڵ نەکردن. خوای گەورە فەرمووی: قەسەم بە گەورەیی خۆم ئەگەر لەبەر من وەپاڕانایەوەو داوای عەفوویان لە من بکردایە عەفووم دەکردن.

## دیمەنی مەرگ

### حیکایەت

ئـەبوو هـورەیرە ﷺ دەفـەرموێ پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: حـەزرەتی داود علیـە سـلام زۆر خـاوەن حـەیا بـوو. کـاتێ لـەماڵ دەچـووە دەرەوە دەرگـای دادەخست جا دەڕۆیی، جارێك كە هاتەوە ماڵـەوە دەرگـای كـردەوە تەماشـای كرد پیاوێك لـە ژوورەوە دانیشتوە. لـە كـابرای پرسـی ئـەتۆ چ كەسـی؟ كـابرا گوتی: من ئەو كەسەم كە لە پاشایان ناترسەمو ئەگەر ئارەزوو بكەم بچمە هەر ماڵێك دەركەوان ناتوانێ پێشم پێ بگرێ. حەزرەتی داود فەرمووی: بەخوا تـۆ ئیزڕائیلـی هـاتووی ئـەمری خـوام پـێ ڕاگـەیێنی، زۆر بـەخێر بێـی، ئـەوەی گوتو خۆی بە پەردەیەكەوە پێچاو هەر لەوێ ڕاكشاو حەزرەتی قابیز گیانی كێـشا. لەسـەر ڕیوایـەتی شـێخ (طبرانـی) لـە حـەزرەتی حوسـەینەوە ﷺ ڕیوایـەت كـراوە كـە لـە نەخۆشـی وەفـاتی پێغەمبـەر ﷺ حـەزرەتی جوبرائیل هات بۆ ئەحواڵپرسی بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ و پرسـی حاڵـت چۆنە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی جوبڕائیل بەهۆی نەخۆشیەكەمەوە زۆر ناڕەحەتم: لەوكاتەدا ئیزڕائیل گەیشتە بەر دەرگاو ئیجازەی هاتنە ژوورەوەی خواست. جوبڕائیل گوتی: ئەی موحەمەد! ئەوە ئیزڕائیلە داوای بەخزمەت گەیشتنت دەكا. فەرمووی: لە پێش تۆدا تا ئێستا ئیجازەی لە كەس داوا نەكردووەو لە پاش تۆش پرس بەكەس ناكا. پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: مـن ئیجازەی دەدەم.

جوبرائیل بە ئیزڕائیلی گوتو ئیزڕائیل هاتە ژوورەوە زۆر بە ئەدەب دانیشت حەزرەت ﷺ ڕاوەستاو لە پاشان عەرزی كرد. خوای تەعالا منـی بۆ لای تـۆ ناردووەو دەستووری داوە كە لە ئەمری موبارەكت نەچمە دەر، ئەگەر ئیجازە

دەفەرمووی: تا گیانی پڕ بەرەکەتت بکێشم. ئەگەر ئیجازەش نیە نای کێشم.
پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئیزرائیل! ئایا دەتوانی ئەوەی دەیڵێی بیکەی؟
گوتی: بەڵێ ئەی ڕەسووڵی خوا خوای گەورە وای دەستوور بە من داوە.

ئەوکاتە جوبرائیل فەرمووی: ئەی ڕەسووڵی خوا، خوا زۆر موشتاقی دیداری تۆیە. جا لەسەر ئەو قسەیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی ئیزرائیل! دەستووری خوا بەجێ بێنە. لە پاش وەرگرتنی ئیجازە ئیزرائیل ڕوحی پڕ فتوحی موبارەك‌و پڕ بەرەکەتی پێغەمبەری ﷺ لە لاشەی جیا کردەوە.

## بۆ هەر جێگایەك بچی مەرگ دەگاتە ئەوێ

لە ((خثیمە))وە رضي الله عنه ڕیوایەت کراوە کە جارێك ئیزرائیل دەچێتە مەجلیسی حەزرەتی سولەیمان علیە سلام زۆر بە سەر سووڕمانەوە تەماشای کابرایەك دەکا کە لە مەجلسی حەزرەتی سولەیماندا دانیشتووە. کاتێ حەزرەتی ئیزرائیل ڕۆیشت کابرا لە حەزرەتی سولەیمانی پرسی قوربان ئەوە کێ بوو؟ حەزرەتی سولەیمان فەرمووی: ئەوە ئیزرائیل بوو. کابرا گوتی: ئەوە بە جۆرێك تەماشای منی دەکرد دەتگوت دەی هەوێ گیانم بکێشی. حەزرەتی سولەیمان فەرمووی: ئێستا تۆ چیت دەوێ؟ کابرا گوتی: بم گەیەنە هیندوستان. حەزرەتی سولەیمان ئەمری کرد ((با)) کە هەڵیگرێ و بیبا لە هیندستانی دانێ. ((با)) کابرای هەڵگرت‌و بردی لە هیندستانی دانا. لە پاشان ئیزرائیل هاتەوە خزمەت سولەیمان‌و حەزرەتی سولەیمان فەرمووی: تۆ بۆ وا چاوت دەو کابرایە بڕی بوو؟ گوتی: زۆرم لا عەجایب بوو، چونکە خوای گەورە ئەمری بەمن فەرموو: گیانی لە هیندستان بکیشم کەچی ئەو لە تەنیشتی تۆ دانیشتبوو.

## دیمەنی مەرگ

### باسی ئیزرائیل و هاوکارەکانی

خـوای تـەعالا لـە سـوورەی ((انعـام))دا دەفـەرمووێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا وَهُمْ لَا يُفَرِّطُونَ ﴿٦١﴾ ﴾ الأنعـام: ٦١ تـا ئەجـەل دەگاتـە سەرتان و یەکێك لە فرستادە فریشتەکانی ئێمە دێ گیانتـان دەکێشێ و ئـەو فرستادانە قەت لە کاری خۆیانداپاش و پێشی ناکەن.

"عبداللـە" کـوڕی عـەبباس رضي الله عنه لـە میانـەی تەفـسیری ئـەو ئایەتـەدا فەرموویـەتی: ئـەو فریـشتانەی کـە لـەو ئایەتـەدا باسـی کـردوون بـریتین لـە بەردەستەکانی ئیزرائیل.

وەهەبی کوڕی منبە دەڵێ: ئەو مەلائیکەتانەی کە دێن بۆ لای ئینسان و بە درێژی کردەوەی ئینسان دەنووسن گیانیشی دەکێشن و لە پاشان دەی دەن بە ئیزرائیل کە گەورەیانە.

لە ئەبوو هورەیرەوە رضي الله عنه ڕیوایەت دەکەن کە فەرموویەتی: کاتێ خوای تەعالا ئیرادەی کـرد حـەزرەتی ئادەم خـەڵق بکا، یـەکێ لـەو مەلائیکەتانـەی نـارد بـۆ سەر زەوی کە هەڵگری عەرشی خـوان تـا هەنـدێك لـە خـاك بـەرێ و حـەزرەتی ئادەمی لێ درووست کا. کاتێ ئەو فریشتە هات و ویستی گڵ هـەڵگرێ، زەوی گـوتی: بـە خـوات سـوێند دەدەم دەسـتم لێ هـەڵگرە و خـاکم مەبـە، چـونکە لـە دواڕۆژدا بـە ئـاگر دەیـسوتێنن. فریـشتەکە ئـەوەی لـە زەوی بیـست و بـەزەیی پێداهاتـەوە و خـاکی نـەبرد و گەڕایـەوە. کـاتێ چـووەوە بارەگـای خـوا، خـوا فەرمووی: کێ لە بەجێ گەیـاندنی دەسـتووری منـدا مـەنعی کـردی؟ مەلائیکە عـەرزی دەوکـا ئـەی خـوای گـەورە! زەوی بـە نـاوی تـۆوە سـوێندی دام بۆیـە خاکم نەهێنا. ئینجا خوای تەعالا فریشتەیەکی تـری دەنێـرێ بـۆ سـەر زەوی. زەوی لەبـەر ئـەویش دەپاڕێتـەوە دەسـتی بـۆ نـەباو ئـەویش بـێ خـاك

دەگەڕێتەوە، تا چەن مەلائیکە بەوجۆرە دەچن و دەگەڕێنەوە. لە پاشان خوای گەورە ئیزرائیل دەنێرێ، بەلام ئیزرائیل بەزەی بە زەویدا نەهاتەوەو گوتی: ئەوەی ئەمنی بۆ ئەو کارە ناردووە پێویستە بێ ئەمری نەکەم، لە هەموو ڕووی زەوی چاك یان خراپ میقدارێکی هەلگرت و بردی بۆ خزمەت خوا. بە ئاوی بەهەشت شێلایان کردیان بە هەویرو حەزرەتی ئادەمیان لێ دروست کرد.

((زەهەر))یش دووبارە ئاوای نەقلێ کردووەو گوتوویەتی: یەکەم فریشتە ئیسرافیل بووەو دووهەمینیان میکائیل بووە. ئیبنو مەسعودو چەند ئەسحابەی تر فەرموویانە: یەکەم فریشتە جوبرائیل بووەو دووهەم میکائیل بووە.

## باسی گیان کێشان

کاتێ ئاساری مەرگ لەکەسێکدا ئاشکرابێ واتا لووتی باریك بێ خوار ببێتەوە، ئەم لاو ئەولای ناوچەوانی چوونەوە دەوێوە. چەرمی دەم و چاوی چرچ بوو، دەبێ لەسەر لای ڕاست و ڕوو بە قیبلە ڕایبکێشن و چاك وایە ئینسانێکی باش بە دەنگی بەرز لە لایدا بڵێ((اشهد ان لا اله الا الله و اشهد ان محمدا عبده ورسوله))، تا ئەویش بیڵێ، چونکە ئەو لەبەر ئەزیەتی گیان کێشان ئاگای لە خۆی نیەو ئەگەر جارێکیش بڵێ بەسە. جا ئەگەر لە پاشان قسەی بێ مەعنای بە دەمدا هات دووبارە تەلقینی کەلیمەی شەهادەی بکەنەوەو سووننەتە لە لای دانیشی و سوورەی یاسینی لەسەر بخوێنی.

سووننەتە پیاوانی بە دین لە لای نەخۆش کۆوە بن و وەکاتێ وەفاتی کرد گورج تا لەشی گەرمە چاوەکانی پێکەوەنێن و دەمی هەلدەن و بڵێن((بسم الله وعلى ملة رسول الله. اللهم يسر عليه امره وسهل علية ما بعده اسعدة بلقائك واجعل ما خرج الية خيرا مما خرج عنة)). جا دەست و قاچەکانی ڕاست بکەنەو جمگەکانی نەرم بکرێن و جلەکانی لەبەر داکەنن و پشتە مالێکی پێ

دادەن جا بانگی دۆست‌و خزمانی بکەن تا نوێژی مردووی بە جەماعەت لەسەر بکەن. ئەگەر قەرزدار بوو قەرزەکەی بۆ بدەنەوەو زوو خەریکی کفن‌و دفنی بن.بەڵام لە پێش شتنیدا نابێ قورئانی لەسەر بخوێنن.

## باسی شتنی مردوو

شتنی مردوو فەرزی کیفایەیە، جا کاتێ ویستیان مردوێك بشۆن باش وایە لە پێشدا عەتر بە تەختە شۆرەکەدا بکەن جا لە پاشان مردووەکەی لەسەر دانێنن. باشتر وایە پەردەیەك بگرنەوەجا مردووەکە ڕووت وەکەن، دەبێ بەدەنی لە ناوکییەوە تا ئەژنۆیانی داپۆشن. لە پاشان لەفافەیەك لە دەست بکاو عەورەتی پاك وەکاو دەست نوێژی بگرێ. بەڵام ئەگەر مردووەکە منداڵ بوو، دەست نوێژی ناوێ. دەست نوێژگرتنەکەشی ئاوا دەبێ، لە پێشدا دەم‌و چاوی بشوا جا دەستەکانی لەگەڵ ئانیشك بشۆ، ئنجا مەسحی سەری بکە جا قاچی ڕاستی‌و قاچی چەپی بشۆ، لە پاشان ئاوی لە دەم‌و لووتان وەردە.

هەندێك لە زانایان فەرموویانە دەبێ بە پەڕۆیەکی تەڕ دەم‌و لووت‌و ددانەکانی پاك بکرێتەوە. بە ئاوی شیلەو گەرم بیشۆ. ئەگەر بۆت کرا ((سدر)) بکە ناو ئاوەکەوە جا پێی بشۆ. ئەگەر سەرو ڕیشی هاتبوو بە سابوون، مووی سەرو ڕیشی بشۆ. جا لەسەر تەنیشتی چەپ ڕایکێشەو لای ڕاستی سەرتابەخوار بشۆ. جا بیخە سەر تەنیشتی ڕاست‌و لای چەپی بشۆ. جا بە پشتدا پاڵی بدەوەو لەسەرخۆ دەستی بە سگدا بێنە ئەگەر شتی لێ هاتە دەرەوە وەی شۆ، ئیتر دەست نوێژو غوسڵی تازەی ناوێ. جا سەرو ڕیشی بە شانە دابێنە بەڵام نینۆکی مەکەو مووی بەر سمێڵ‌و بن هەنگڵی مەفەوتێنە. ئەوەی کە لە ئاویشدا خنکابێ دەبێ هەر بشۆرێ. یان ئەگەر بای کردبوو هەلامسابووو نەدەشورا، دەبێ هەر ئاوی پێدا بکرێ واجبە. ئەگەر منداڵێك لە دایك بوو فەوری مرد، هەر دەبێ بشۆرێ‌و دەبێ ناوێکیشی لێ بندرێ‌و لە دوای شتنی نوێژی لەسەر بکرێ

وە ئەگەر منداڵێك بە مردوویی، یان كە لە دایك بوو ئەندامەكانی تەواو نەبوون ئەوە هەر بیشۆو پارچەیەكی تێ وەپێچە دفنی بكە، بەڵام نوێژی ناوێ، ئەگەر مردوویێك نەزانرا موسڵمانە یان كافرە یا نیشانەی موسڵمانی پێوە دیار نەبوو یا مردووەكە لە وڵاتی ئیسلامی بوو دەبێ وەك مردووی موسڵمان ڕەفتاری لەگەڵ بكرێ. ئەگەر یەكێك لە كەشتیدا لەناودەریادا مرد نەدەكرا بێن لە دەرەوە بینێژن. لەدوا شتنی و كفن و نوێژ لەسەر كردن شتێكی قورسی لە ناوقەد ببەستن و بیخەنە ناو دەریاوە. ئەوەی مردوو دەشوا باش وایە دەست نوێژی ببێ. ئەگەر پیاوێكی لەش پیس، یان ئافرەتێكی بێ نوێژ، یا تازە منداڵی ببو یان كافرێك مردوو بشۆن درووستە، بەڵام كەراهەتی هەیە. سوونەت وایە ئەوەی مردووەكە دەشوا خزمی مردووەكە بێ. ئەگەر خزمەكەی نەیدەزانی مردوو بشوا با یەكی موسڵمان بیشوا. دەبێ ئەو مردووە وەها بشۆرێ كە ئاو بەسەر تەواوی بەدەنیدا بڕوا، ئەگەر نیشانەیەكی چاكی بە مردوەكەوە دی لای خەڵكی باسی بكا. بەڵام ئەگەر نیشانەیەكی خراپی لێ چاو پێكەوت باسی نەكات.

دەبێ پیاو پیاو بشوا و ئافرەت ئافرەت بشوا، بەڵام منداڵ چ كچ بێ چ كوڕ درووستە پیاوو ئافرەت بیشۆن. درووستە ژن مێردی خۆیو پیاو ژنی خۆی بشوا. بەڵام سوونەتە دەست پێچێكیان لە دەست دابێ تا دەستی لە پیستی مردوەكە نەدرێ. ئەگەر ئافرەتێك مردو ئافرەتێك نەبوو بیشوا. یان پیاوێك مردو پیاو نەبوو بیشوا. درووست نیە بشۆرێن دەبێ تەیەمم بكرێن. بەڵام دەست پێچێك بكاتە دەستی تا دەستی وەپێستی مردووەكە نەكەوێ. ئەگەر كوڕێك بمرێو باوكی كافر بێ باش نیە كوڕەكەی بشوا. باشتر وایە موسڵمانێك ئەو كوڕە كافرە بشوا. ئەگەر یەكێك لە ڕێگای سەفەردا مردو ئاو نەبوو بیشۆن تەیەمومی بكەنو نوێژی لەسەر بكەن. جا ئەگەر ئاو پەیدا بوو با بیشۆن ودووبارە نوێژی لەسەر بكەنەوە.

## دیمەنی مەرگ

### باسی کفنی مردوو

کفن کردنی مردوو فەرزی کیفایەیە. کفنی سوننەت بۆ پیاو سێ پارچەیە کە بریتین لە شەرواڵێك‌و کراسێك‌و لەفافەیەك. ئەگەر زەرورەت بوو هەموو جۆرە پارچەیەك دەکرێ بە کفن. شەرواڵەکە دەبێ هەموو لەشی داپۆشێ‌و کراسەکە بە بێ یەخەو فەقێیانە بێ‌و لە ملی را تا پێیانی بێ‌و وە لە فافەکەش دەبێ لەسەریەوە تا قاچانی داپۆشێ.

بینا لەسەر فەرمایشتی عولەمای موتەئاخرین بۆ عالمی مردوو باش وایە عەمامەشی لەسەر نێن‌و لفکەی بە پێشەوەدا بەروەدەن، بەلاّم کفنی ئافرەت بریتیە لە پێنج پارچە، کراس‌و شەرواڵ‌و سەرپۆش‌و ژێر کراس‌و لەفافە. ئەگەر هەر شەرواڵ‌و سەرپۆش‌و لەفافەش بێ کافییە. کراسەکەی دەبێ لە شانیەوە تا قاچی داپۆشێ. ژێر کراسەکە دەبێ لە سنگیەوە تا ئەژنۆو سەرپۆشەکەش دەبێ دوو بست درێژو دوو بست پان بێ شەرواڵ‌و لەفافەکانیش دەبێ سەرتاپا دای پۆشن.

لەکاتی زەرورەتدا بۆ ئافرەت دوو پارچەو بۆ پیاو یەك پارچە کافیە. کوڕێك کە نزیك بە بلوغ بێ و کچێك لەسەرو بەندی بلوغ بووندا بێ‌و بمرن دەبێ وەك ژن‌و پیاوی باڵغ رەفتاریان لەگەڵ بکرێ. بۆ کوڕی زۆر منداڵ یەك پارچەو بۆ کچی زۆر منداڵ دوو پارچە کفن بەسە. بۆ پیاوان پارچەی ئاوریشم‌و زەعفەران لێ دراو کەراهەتی هەیە. بەلاّم بۆ ئافرەتان درووستە. کفنی زۆر باش ئەوەیە سپی بێ، جا کۆن بێ یان تازە هەر باشە. ئەگەر مردووەکە دەوڵەمەند بوو واریسی کەم بوون باش وایە کفنی سوننەتی بۆ بکرێ. بەلاّم ئەگەر دەوڵەمەند نەبووبەلاّم واریسی زۆر بوون باش وایە زیادە کفنی بۆ نەکەن.

## دەرسی هەشت

### چۆنیەتی کفن تێوە پێچان

لە پێش هەموو شتێکدا عەتر بە کفنەکەدا بکە ئنجا ئەگەر مردووەکە پیاو بوو ڕاستە کفنەکە ڕاخەو لە پاشان ئەوانی تری بەسەردا ڕاخەو عەتریان پێوە بکەو جا مردووەکەیان لەسەر ڕاکێشە بە ئارامی و عەتری پیا بکەو ئەگەر کافوور بوو ناوچەوانی و لووتی و دەستەکانی و ئەژنۆیانی و قاچەکانی کافووریان بەسەردا بێنەو لە پاشان ژێر کراسەکەی لە لای چەپەوە و جا لای ڕاستی تێوە پێچەو جا ئەوانی تر ئینجا لەسەرو ناوەڕاست و قاچیەوە بیان بەستە.

بەڵام ئەگەر مردووەکە ئافرەت بوو لە پێشدا لەفافەکان و لە پاشان سینەبەند و ژێرکراسەکەی پان ڕاخەو عەتریان پیا بکاو ئنجا ئافرەتە مردووەکە بێنە ژێرکراسەك و کراسەکەی تێوە پێچە، لە پاشان پرچەکانی بکە بە دوو بەش و هەر بەشەو بە لای سینگی خۆیدا بەردەوەو ئنجا سەرپۆشەکەی بەسەردادەو زولفەکانی وەبن سەرپۆشەکە بخە. ئنجا دەرپێکەی گرێ بدەو سینەبەندەکەی لە ژێر باخەڵەوە بێنە دەرو تا ئەژنۆیانی لە دەوری سینگییەوە وەپێچەو هەموو بەدەنی لە لەفافەو ڕاستە کفنەکەوە وەپێچە.

ئەگەر مردووەکە پارەی لە پاش بەجێ نەمابوو ئەوە کفنی لەسەر ئەوکەسەیە کە نەفەقەی لەسەر ئەوبوو لە ژیانیدا وەك باب و باپیرو کوڕو مێرد. کفنی ژن لەسەر مێردە، بەڵام ئەگەر کابرا فەقیر بوو مرد ئەوە کفنەکەی لەسەر ژنەکەی نیە، دەبێ خەڵکی گەرەك کفنی بکا. ئەگەر ڕێبوارێك یان فەقیرێك مردو پارەیان نەبوو دەبێ خەڵك بە یارمەتی کفن و دفنی بکەن. ئەگەر ئەو پارەی کۆیان کردەوە زیاد بوو دەبێ بیدەنەوە بە خاوەنەکەی. ئەگەر خاوەنی

## دیمەنی مەرگ

نەزانرا با بۆ کفنی فەقیرێکی تری خەرج کەن. ئەگەر مردووی فەقیر نەبوو بیدەن بە فەقیرێك.

جەدوەلی پارچە کفنەکان

| ناوی پارچە | درێژی | پانی | ئەندازە |
|---|---|---|---|
| ژێر کراس | دوو گەز | لە گەزێکەوە تا دوو گەز | بۆ سەرتاپای |
| لەفافە | دوو گەز | لە یەکەوە تا دوو گەز، کراس گەورەتر بێ | چوار گرێ لە ژێر |
| کراس یا ڕاستەکفن | دوو گەزو نیو | گەزێك | لە شانێرا تا لای قاچی |
| سینە بەند | دوو گەز | گەزێك | لە باخەڵیەوە تا ئەژنۆ |
| سەرپۆش | گەزێك | دوازدە گرێ | تا هەر جێگایەك بگا |

تێبینی: ئەگەر پارچەکە چوواردە یا پازدە یا شازدە گرێ درێژبوو دەبێ پانیەکە ½ ۱ بێ لەفافەکەش هەر وا.

### لەوازمی دفن

ژێرکراس سێ گرێی زیاتر لە حەجمی بەدەنی مردووەکە بۆ گەنجێك لە درێژی گەزێك بێ بەسە. پانیشی لە ناوکەوە تا بەلەکی، ئەگەر چواردە گرێ بێ بەسە. بەڵام دەبێ دوو بن. دەست کێش دەبێ شەش گرێی درێژو سێ گرێی پان بن و دەبێ بە ئەندازەی دەست بن.

ئەو شتانەی تریش کە پێویستن ئەوانەن دوو گۆزە، ئافتاوەیەك، تەختە شۆرێك، لۆکە، کافوور، گوڵاو، تابوت.

## بردنی مردوو بۆ گۆڕستان

هەڵگرتنی مردوو بەو جۆرە سوونەتە. چوار کەس چوار پەلی تابوتەکە لەسەر شان دانێن و بڕۆن و لە پاش دەقەدەم ڕۆیشتن جێگاکەیان بگۆڕنەوە. لەوەش چاکتر ئەوەیە کە هەڵگری جەنازەلە پێشدا لای ڕاستی پێشەوەی جەنازەکە بە شانی ڕاست هەڵگری و لە پاش دەقەدەم ڕۆیشتن یەکی دی بێتە جێگاکەی و ئەو بچێ لای ڕاستی دواوە لەسەر شانی دانێ. جا بەو تەرتیبە لای چەپی پێشەوە بە شانی چەپ و لەپاشان لای چەپی دواوە بە شانی ڕاست هەڵگرێ و بەو جۆرە تا دەیبەنە سەر قەبران.

ئەگەر منداڵێکی شیرە خۆرە، یان گەورەتر لەسەر دەستان بەرن بۆ سەر قەبران درووستە. لەکاتی جەنازە بردن بۆسەر قەبران دەبێ تۆزێك بە پەلە بڕۆن، بەڵام ئەوەندە پەلە نەکەن جەنازەکە بکەوێ، لە کاتی بردنی سەرقەبرانی دەبێ سەری مردووەکە لە پێشەوە بێ، نابێ خەڵکەکە لە لای چەپ و ڕاستی مردووەکە بڕۆن. بەڵکو دەبێ لە دوایەوە لەسەرخۆ بڕۆن تا بیگەنێ. بە پیادە بڕۆن. باشترە بە سەیارەش بڕۆن هەر درووستە بەڵام پێشی کەون کەڕاهەتی هەیە. ئەگەر مردووەکە دراوسێ بێ یان خزم بێ، یان پیاوێکی باش بێ لە گەڵی بچی بۆ سەر قەبران خێری لە نوێژی سوننەت زۆرترە. ئەو کەسانەی لەگەڵ جەنازەدەچن دەبێ بێ دەنگ بن. قسەکردن یان بەدەنگی بەرز دوعا کردن و قورئان خوێندن کەڕاهەتی هەیە. کاتێ کە گەیشتنە ناو گۆڕستان لە پیش دانانی جەنازەکە دانیشتن کەڕاهەتی هەیە. باشتر وایە تا مردووەکە دەنێژن دانەنیشن. لە ماڵی مردوو، یان لە لای جەنازەکە گریان بە دەنگی بەرز، یا ناڵەو شیوەن و لیباس دادڕین و قژ ڕنینەوە حەرامە. چونکە ئەوە یاسای زەمانی جەهالەتەو دەبێ خۆی لێ بپارێزین. بەلام لەسەرخۆ گریان حەرام نیە. بەڵام بەهەر حاڵ سەبر گرتن باشترە.

## دیمەنی مەرگ

نابێ ئافرەت لەگەڵ جەنازە بڕوا بۆ سەر قەبران، ئەگەر ئافرەتێك بە گریەو زاری بێ بۆسەر قەبران دەبێ نەهێڵی. باشتر وایە كەس و كاری مردوو مردووەكە هەڵگرن بەڵام ئەگەر بە كرێش بیبەن بە خەڵك هەر درووستە.

## باسی نوێژی مردوو

نوێژی مردوو فەرزی كیفایەیە، ئەگەر یەكێك كردی لەسەر هەمووان لا دەچێ، بەڵام ئەگەر نەكرا هەموو گوناهبارن. شەرتی نوێژی مردوو ئەوەیە كە مردووەكە شۆرابێ، ئەگەر مردووێكیان بە بێ شتن و نوێژ، یا لە دوای نوێژ لەسەر كردنی شت بێتیان و ناشت بێتیان، یان، بێ شتن نوێژیان لەسەر كردبێ و دفنیان كردبێ، دەبێ لەسەر قەبرەكەی نوێژی لەسەر بكرێ. ئەوەی لە پاشای عادلی ئیسلام هەڵگەڕێتەوە، كە بەداخەوە ئێستا ئەو پاشاو گەورەی عادلە نیە، یا ڕێگری كرد یا باوكی یادایكی كوشت و مرد، نوێژی لەسەر ناكرێ. وە ئەوەی شیری لە دوژمنان ڕاكێشاو خۆی كوژرا، یا خۆی كوشت، یا لە تۆڵەدا كوژرایەوە یا ڕەجم كرا، نوێژی لەسەر دەكرێ. بۆ ئیمامەتی نوێژی مردوو ئیمامی مزگەوتی جامعە لەوانی تر باشترە، ردای ئەو پێش نوێژی مزگەوت. دوای ئەو یەكێ لە خزمی مردووەكە، ئنجا خەڵكی تر، ئافرەت و كوڕی نابالغ حەقی نوێژی مردوویان نیە.

ئەگەر یەكێك وەسیەت بكاو بڵێ: كە مردم دەبێ فلاَن كەس نوێژم لەسەر بكا ئەوە ئەگەر ئەویش نەیكا هەردرووستە. ئەگەر لە كاتی نوێژی مەغریبدا چوونە سەر قەبران با لە پێشدا نوێژی مەغریب بكەن جا نوێژی مردووەكە بكەن. ئەگەر نەكرابوو.

شەرتی نوێژی مردوو وەك نوێژی ترەو ئەوەی نوێژی فەرز بەتاڵ وەكا، نوێژی مردوش بەتاڵ دەكاتەوە.

نیەتی نوێژی مردوو ئەوەیە بڵێی: نیەتمە نوێژی ئەو مردووە دەکەم‌و ڕوو دەکەمە ڕووگە لەبەر خوا ((الله اکبر))، ئەوانەی بە جەمەعاتیش لەگەڵ ئیمام نوێژی مردوو دەکەن بڵێن: نیەتمە نوێژی جەنازە دەکەم لەگەڵ ئەو ئیمامە بۆ خوا ((الله اکبر)).

شەرتی نوێژی مردووی حازر ئەوەیە جەنازەکە لەپێش نوێژکەرەکانەوە بێ‌و ببنە سێ سەف. بۆ وێنە ئەگەر حەوت کەسبوون یەك ببێتە پێش نوێژو سێ لەسەفی یەکەم ڕاوەستن‌و دوو لە سەفی دووهەمدا و یەك لە سەفی سێهەمدا ڕاوەستێ. نوێژی مردوو چوار ((الله اکبر))ی تێدایە.

## نوێژی مردوو ئاوا دەخوێنرێ

لەگەڵ دابەستن دا با هەردوو دەستی تا ڕاستی گوێیان بەرز بکاتەوە. جا لە دوای نیەت‌و ((الله اکبر)) اعوذ بالله بخوێنێ لەگەڵ سوڕەی فاتیحا، بەڵام ((وجهت وجهیە)) و سوڕەی ((قل هو الله)) سووننەت نین. ئنجا ((الله اکبر)) بکاو لە پاشان سلاْوات لەسەر پێغەمبەر لێ بدا. ئنجا ((الله اکبر)) بکاو لە پاشان دووعا بۆ مردووەکە بکا بە هەر زمانێك بێ. باش وایە بڵێ

((اللهم ارحمه اللهم اغفر له، اللهم لحینا و میتناو شاهیدناء غائبناء ذکرناو انثانا. اللهم من احییته منا فاحیه علی الاسلام و من توفیته منا فتوفه علی الایمان)) ئەگەر مردووەکە منداڵ بوو بڵێ: اللهم اجعله فرطا لابویه وسلفا وذخرا وعظة و اعتبارا وشفیعا وثقل بة موازینهما و افرغ الصبر علی قلوبهما)) جا لە پاش ((الله اکبر))ی چووارەم پێش سەلام دانەوە سوننەتە بڵێ: ((اللهم لا تحریمنا اجره ولا تفتنا بعده)) بۆ ئافرەت زەمیرەکان بگۆڕی بە ((ها)) . ئەگەر لە پێشدا فریای ئیمام نەکەوت کە ئیمام سەلامی دایەوە با ئەو ((الله اکبر)) ەکان تەواوبکا جا سەلام بداتەوە. ئەگەر چەند

## دیمەنی مەرگ

جەنازە حازربوون درووستە بەسەریەکەوەو بە تەنیاش نوێژیان لەسەر بکرێ. نوێژی مردووو لە هەموو شوێنێکی پاکدا درووستە. بەلام لەسەر قەبران لە پێش دفنیداو لە مزگەوت ئەگەر لەکاتی نوێژی جەماعەتدا بێ کەراهەتی هەیە.

### باسی گۆڕو ناشتنی مردوو

لە گۆڕخستنی مردوو فەرزی کیفایەیە، گۆڕ بە دوو جۆر دەبێ. ئەگەر زەویەکە ڕەق بوو وا سوننەتەلا دڕ هەڵیکەنن ئەگەر نەرمیش بوو بە گۆڕیچە بێ باشترە. باش وایە قەبرەکە ئەوەندە قوڵ بێ کە ئینسانێکی نەدرێژ نە کورت لەناویدا ڕاوەستێ سەری بەدیارەوە نەبێ. باش وایە کە جەنازەکەیان داهێشتە ناو گۆڕەکە بڵێن((بسم الله و علی ملە رسول الله))، ئەگەر مردووەکە ئافرەت بوو باش وایە خزمی بە تایبەتی ئەوانەی مەحرەمنی بیخەنە ناو قەبرەوەو پەردەیەك لەسەر قەبرەکە بگرن. ئینجا ڕوو بە قیبلەوە لەسەر تەنیشتی ڕاست ڕای کێشن و گرێی کفنەکەی بکەنەوە، جا گڵی وەسەر کەن. سوونەتە ئەوەی لای قەبرەکە بێ سێ مشت گل لە گڵی قەبرەکە هەڵبگرێ و بە سەریەکیاندا ((منها خلقناکم)) بەسەر یەکی تریاندا ((وفیها نعیدکم)) وەبەسەر ئەوی تریاندا ((ومنها نخرجکم تارە اخری)) بخوێنێ و لە لای سەریەوە بیکاتە قەبرەکەوە.

چەتر لەسەر کردن و خانوو کردن و نووستن و بەسەردا ڕۆیشتن و میزکردن و ئایەت نووسین لەسەر قەبر کەراهەتی هەیە، بەلاّم سوونەتە لە دوای تەسلیم بوونی ماوەیەك لە لای گۆڕەکە وەمێنێ و قورئان بخوێنێ و دوعای بۆ بکەی. چونکە دەبێتە هۆی سووکی عەزابی مردووەکە.

لە پاشانیش هەرکاتێ بچی بۆ گۆڕستان و قورئان بخوێنی و سەوابەکەی هەدیە بکەی خێری زۆرە. ئەگەر یەکێك لە غەریبی مرد هەر لە گۆڕستانی ئەو جێگایە بنێژرێ باشە. گیا و داری تەڕی گۆڕستان باش نییە ببڕێ.

## باسی زیارەتی گۆڕستان

سوننەتە حەفتەی جارێك زیارەتی گۆڕستان بکەی. بەتایبەتی ڕۆژی هەینی یا شەممە یا دووشەممە یا پێنج شەممە لە ڕۆژەکانی تر باشترە. هەروەها شەوی بەرات و دەڕۆژی ئەوەڵی ((ذی الحجـە)) و جێژنەکان و دەی مانگی محەڕڕەم خێری زۆرترە. محەمەدی کوڕی واسیع فەرموویەتی: ئەو کەسەی ڕۆژی پێنج شەممە و جومعە بچێتە زیارەتی مردووی، مردووەکە ئاگای لێیەو دەی ناسێ. پێغەمبەر ﷺ لە ((مەدینە)) وە دەچوو بۆ زیارەتی شەهیدەکانی غەزای ((احد)) . لە پاش وەفاتی حەزرەتیش حەزرەتی ئەبوو بەکرو حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێ) ئەو سوننەتەیان دەکرد.

عەللامە شێخی ((ابن حجر عسقلانی)) فەرموویەتی: ئەگەر بە عەزێك لەو کەسانەی کە دەچنە سەر قەبران کاری خەراپیش بکەن، یان پیاو ژن پێکەوە بچن. دووبارە نەچوونی سەر قەبران هەر ئیشتیبایە. دەبێ هەر بچنە سەر قەبران، بەڵام بەرگری لە خراپەڕوودان بکەن. ئەگەر ئافرەتیش بۆ یادی مەرگ و سەواب بچێتە گوڕستان هەر درووستە.

ئەوەی دەی هەوێ بچێتە سەر قەبران باش وایە دوو ڕکات نوێژ بکا و لە هەر کاتێکدا لە دوای سووڕەی ((الفاتحە)) جارێك ((اية الكرسی)) و سێ جار ((قل هو الله)) بخوێنێ و سەوابەکەی بۆ مردووەکە بنێرێ. خوای گەورە قەبری مردووەکە ڕووناك دەکاتەوەو خێری زۆری پێ دەگا. جا لە دوای نوێژەکە بڕوا بۆسەر قەبران و پشت بە قیبلەی ڕوو بکاتە گوڕەکەو بڵێ: السلام

علیکم یا اهل القبور یغفر الله لنا ولکم انتم لنا سلف ونحن بالاثر) یان بڵێ : (( السلام علیکم دار قوم مؤمنین وانا ان شاءالله بکم لاحقون)). جا ئەوەندەی بۆی کرا قورئان بخوێنێ و سەوابەکەی هەدیە بکا.

ئەبوو بەکری کوڕی سەعید دەفەرمووێ: سوڕەی ((قل هو الله)) حەوت جار یان دەجار بخوێنێ و سەوابەکەی هەدیە بکا. ئەگەر مردووەکە گوناهکاربێ خوا عافووی دەکاو ئەگەر پیاوی چاکیش بێ خوا لەو کەسە خۆش دەبێ کە دەی خوێنێ. ئەوەی سوننەت دەکا ئەگەر سەوابەکەی هەدیەی ژن و پیاوی موسڵمان بکا، ئەوە هەر یەکەی سەوابی تەواوی پێ دەگاو لە بەشی خۆشی هیچ کەم نابێتەوە. ئەهلی سوننەت و جەماعەتیش ئەو بیرو باوەڕەیان هەیە.

لە پاش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ حەزرەتی عومەر رضي الله عنه هەموو ساڵێك بۆ ئەوەی کە سەوابەکەی هەدیەی پێغەمبەر ﷺ بکا دەچوو بۆ عەمرە. ((ابن موفق)) هەر بەو نیەتە حەفتاجار حەجی کردو ((ابن سراج)) زیاتر لە دەهەزار جار قورئانی خەتم کرد. سوننەتە ئەگەر یەکێك مرد، سێ ڕۆژ لەسەر یەك دراوسێ و ناسیاو و ئەهلی گەڕەك بچن بۆ سەر خۆشیان لێ بکەن و ئامۆژگاری گەورەو بچووکیان بکەن و دڵخۆشیان وەدەن و بڵێن: خوا عەفووی کاو لە گوناهەکانی خۆش بێ و سەبرتان بخاتە دڵەوە.

بە دەنگی بەرز گریان و لیباس دڕین و لەخۆدان و خاك وەسەر کردن و بۆ پیاوان ڕش پۆشی حەرامە، بەڵام گرین لەسەر خۆو فرمێسك هەڵوەراندن قەیدی نیە. دراوسێی ئەو ماڵەو خزمی سوننەتە یەك دووجار خواردنیان بدەنێ. بەڵام ڕۆژی سێ یەم چوارەم هەستانیان و نان دانیان درووست نیە. دەبێ ئەو ڕسمە تەرك بکرێ. باش وایە جارجار خواردن ساز بکەیت و بیدەی بە فەقیران و سەوابەکەی هەدیەی ڕوحی مردوو بکەی.

## باسی چەند مەسئەلەیەك

((یەكەم)) لەبەر ئەوەی مردوو شتن وەزیفەی زندوانە، ئەگەر یەكێك خنكاو غەرق بوو كە هێنایانەوە دەروە دەبێ بشۆری، بەلاّم ئەگەر لەو كاتەدا لە ئاوەكە دەی هێننە دەرێ نیەتی غوسلی لێ بێنن لە پاشان شتنی ناوێ‌و ئەگەر مردوو بارانی لێ باری، یان كەوتە بن ئاوەوە، هەر دەبێ بشۆرێ.

((دووەم)) ئەگەر پارچەی ئینسانێك لە جێگایەك كەوتبو وەك مردووی تەواو هەموو شتێكی دەوێ.

((سێیەم)) ئەگەر مردوویێك كەوتبو نەزاندرا موسڵمانە یان كافرە، ئەگەر لە ولاّتێك بوو موسڵمانی زۆرتر بوو دەبێ بشۆرێ‌و نوێژی لەسەر بكرێ.

((چووارەم)) ئەگەر مردووی كافرو موسڵمانان تێكەڵ بوون‌و نەناسرانەوە دەبێ هەموو بشۆرێن.

((پێنجەم)) ئەگەر كافر مرد درووستە بشۆرێ، بەلاّم نوێژ لەسەر كردنی حەرامەو كفن‌و دفنی درووستە.

((شەشەم)) ئەگەر لە پاش شتن مردوو شتی پیسی لێ هاتە دەرەوە زەرەری نیە. كفن هەڵگرتن زەرەری نیە بەلاّم گۆڕ ئامادەكردن كەڕاهەتی هەیە.

خەڵكینە! ئەوەیە حەقیقەتی ژیان: خوای تەعالا ڕەحمتان پێ بكا. لە خەوی غەفلەت وەخەبەر وەرن لە پێش ئەوەدا پێتان بڵێن: فلاّن كەس نەخۆش كەوت، زۆر ناڕەحەتە، پرسیاری دوكتۆرێكی باشی بۆ بكەن. دوكتۆرێكی زۆر باشی بۆ بێنن. جا دوكتۆر بێ‌و ئومێدی بە ژیانی نەبێ، لە پاشان بڵێ: تەماشا وەسیەت دەكا، زمانی لاڵ بووە، دەنگی نایەتە دەر، چاوی بە مۆڵەق وەستاون.

تەماشان دەكا بە زەحمەت هەناسەی دێتە دەر. ئەزیەتی گیان كێشانی زۆرتر بووەوە. برۆو برژانگی هاتنە خوارێ. لەوكاتەدایە كە هەست بە ئەحواڵی

## دیمەنی مەرگ

قیامەت دەکا. زمانت لاڵ دەبێ. ناتوانی قسەیەك بکەی. براو کەس‌و کار کۆدەبنەوە دەست دەکەن بە گریان، جارێك کوڕەکە دێتە بەردەمت، جارێك براکانت، جارێك ژنەکەت دێتە بەرامبەرت ، بەلاّم زمانت ناگەڕێ. لەو کاتەدا ڕوح وردە وردە خواحافیزی لە ئەندامەکانت دەکاو دەڕوا بۆ ئاسمان. خزمەکانت بە پەلە خەریکی کفن‌و دفنت دەبن، ئەوانەی دێنە لات لە پاش گریان بێ دەنگ دەبن‌و دوژمنەکانت خۆشحاڵ دەبن‌و واریسەکانت خەریکی دابەشکردنی میراتەکەت دەبن‌و تۆش بە جەزای ئەعمالەوە گرفتار دەبی. ئەوەیە حەقیقەتی ئەو ژیانە وریا بن‌و فریای خۆتان بکەون تا نەکەوتوونەتە ئەو حاڵەتەوە.

## دەرسی نۆ:

## ئەحوالی بەرزەخ

**پێشەکی:**

هەروەك لە فەرمایشتەکەی پێغەمبەر ﷺ بە ئاشکرا دەردەکەوێ، هەرچەند ئەوەی دەمرێ ئێمە بە مردووی دادەنێین، بەڵام لە حەقیقەتدا زیندووە، تەنیا ئەوەندە هەیە کە تازە ژیانی ئەو لەگەڵ ژیانی ئێمە فەرقی هەیە.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: شکاندنی ئێسقانی مردوو وەك ئەوە وایە کە بە زیندوویی ئێسقانی بشکێنی.

لە مێشکاتدا دەفەرمووێ: جارێك عەمری کوڕی حەزم پاڵی دابوو بە قەبرێکەوە، پێغەمبەر ﷺ چاوی لێ بوو فەرمووی: خاوەنی ئەو قەبرە ئەزیەت مەدە. کاتێ ئینسانێك دەمرێو دنیا بەجێ دێڵێ دەچێتە عالەمی بەرزەخەوە، با ئێستا نەشخرابێتە قەبرەوە، یان ئاگریان تێبەر نەدابێ؟ وەك هیندیەکان. لەوکاتەشدا هۆش‌و هەستی هەر هەیە.لە کتێبی حەدیسی سەحیحی بوخاریدا دەفەرمووێ: حەزرەت ﷺ فەرموویەتی کاتێ جەنازە لەسەر تەختە شۆر یان هەر شتێکی تر دادەنرێ‌و لە پاشان خەڵك هەڵی دەگرن بۆسەر قەبران، ئەگەر ئەو مردووە لە دنیادا پیاوێکی باش بووبێ دەڵێ تکایە زوو بم بەن بۆ سەر قەبران. بەڵام ئەگەر کردەوە خراپ بووبێ، ڕوحی ڕوو دەکاتە کەس‌و کاریو دەڵێ: ((وا حەسرەتا)) ئەی هاوار بەماڵم ئەوە بۆ کوێم دەبەن؟

## دیمەنی مەرگ

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئینسان نەبێ هەموو شتێك گوێی لە دەنگیەتی، ئەگەر ئینسانێك گوێی لێ بێ بەبێ شك بێ هۆش دەبێ. جا لە پاش مەرگ تا ڕۆژی قیامەت بەو ماوەیە کە بەسەر مردنی ئینساندا تێ دەپەڕێ دەڵێن: بەرزەخ. بەرزەخ لە لۆغەتدا بە مەعنای پەردەو حیجابە. جا لەبەر ئەوەی ئەو ماوەیەلە بەینی دنیاو قیامەت وەك پەردە وایە پێی دەڵێن: بەرزەخ.

لەبەر ئەوەی کە عادەتەن مردووان دەنێژن، لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ لە بابەت ڕەنج و ڕاحەتی بەرزەخدا کەلیمەی قەبر بە کاربراوە، بەڵام ئەوە مەعنای وا نیە کە ئەوەی نەنێژرێ یا بسوتێندرێ یا غەرق ببێ لە عالەمی بەرزەخدا ناژی؟ چونکە لە حەقیقەتدا سەواب و عەزاب هەر بۆ ڕوحە. با ئەویشمان لەبیر نەچێ کە خوای تەعالا قودرەتی هەیە بەسەر ئەوەدا کە تەواوی زەڕڕەکانی لاشەی ئینسان کە پەرت و بڵاوبوونەتەوەلە هەر جێگایەك بن کۆیان بکاتەوەو عەزابیان بدا، یا سەوابیان پێ بگەیێنێ. لە ((موسلیم)) و ((بوخاری))دا دەفەرمووێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە زەمانی پێشودا پیاوێ گوناهی زۆر کردبوو، لەکاتی سەرە مەرگدا وەسیەتی بۆ کوڕەکانی کردو گوتی: هەرکاتێ مردم لاشەکەم بسوتێنن و نیوەی خۆڵەمێشەکەم وەبەر ((با)) بدەن و نیوەکەی تری باوێنە دەریاوە. لە دوای ئەو وەسیەتە گوتی: ئەگەر بەو حاڵەش خوا زیندووی کردمەوە ئەوە دیارە لە هەموو کەسم زیاتر عەزاب دەدا.

کاتێ کابرا مردو کوڕەکانی وەسیتەکەیان بەجێ هێنا. جا خواوەندی گەورە ئەمری کرد بە دەریا کە هەموو زەڕڕەکانی لاشەی ئەو کابرایە کۆ بکاتەوەو دەریا گورج کۆی کردنەوە. جا ئەمری کرد بە ((با)) و ئەویش نیوەکەی تری کۆکردەوە. ئنجا خوای گەورە زیندووی کردەوەو فەرمووی: ئەوە بۆچی ئەو وەسیەتەت کرد؟ کابرا عەرزی کرد ئەی خوای گەورە! تۆ زۆر باش دەزانی

کە لە ترسی تۆ بوو ئەو وەسیەتەم کردووە. خوای گەورە دەفەرمووێ: ئەوا عافووم کردی.

با ئەوەمان لە یاد نەچێ کە ئەوەی لە خوا بترسێ خوا لە گوناهی خۆش دەبێ. لە ڕیوایاتی دینیشەوە دەر دەکەوێ کە لە عالەمی بەرزەخدا موسڵمانان یەکتر دەبینن و لەوکەسانەی کە تازە دەمرن و دەچنە عالەمی بەرزەخەوە لە ناسراوو کەس و کاریان دەپرسن کە فلاَن کەس چۆنەو فلاَن کەس لە چ حاڵێك دایە؟

سەعیدی کوڕی جوبەیر ﷺ دەفەرمووێ: لەوکاتەدا باوکێك دەمرێ کوڕە مردووەکانی بە پیریەوە دەچن و بەخێرهاتنی دەکەن هەر وەك لە دنیادا ئەگەر یەکێك لە دەرەوە ڕابێ بەخێرهاتنی دەکەن.

((ابن ابی الدنیا)) دەڵێ: سابیتی بەنناى دەی فەرموو: کاتێ یەکێك دەمرێ ئەو خزمانەی کە لەپێش ئەودا مردوون ئیستیقبالی دەکەن و بە چاو پێکەوتنی یەکتر زۆر پێ خۆشحاڵ دەبەن.

((ابن الحبان)) لە قەیسی کوڕی قووبەیعەوە دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەوەی ئیمانی نەهێنابێ، لە عالەمی بەرزەخدا ئیجازەی نادەن قسە لەگەڵ مردوواندا بکا یەکێك عەرزی کرد ئەی ڕەسولی خوا! بۆچی مردووش قسە دەکەن؟ فەرمووی: بەڵێ: زیارەتی یەکتریش دەکەن.

## باسی بەرزەخ

لە لوغەتی عەرەبیدا بەرزەخ بە سەددێك دەڵێن کەببێتە پەردە لە بەینی دوو شتدا، بەلاَم لە زاراوەی شەرعدا هەر وەك لە سوڕەی ((المؤمنون)) ((الی یوم)) لە قورئاندا دەفەرمووێ: ﴿ لَعَلِّيٓ أَعۡمَلُ صَٰلِحٗا فِيمَا تَرَكۡتُۚ كَلَّآۚ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَاۖ

## دیمەنی مەرگ

﴿وَمِن وَرَائِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾ المؤمنون: ١٠٠ یەعنی لە پشتیانەوە عالەمی بەرزەخ هەیە، لەوێ دەمێننەوە تا ڕۆژی زیندوو بوونەوە. بەو ماوە دەڵێن: کە لەبەینی دنیاو قیامەتا ئینسان لە دوای مەرگ تا ڕۆژی قیامەت تێیدا دەمێنێتەوە.

یەکێ لە زانایان بە ناوی (فڕا) وە گوتویەتی: بەرزەخ ماوەی بەینی مەرگو زیندوو بوونەوەی دوای مەرگەو ئەوەی مرد دەچێتە بەرزەخ.

خوای تەعالا بە قودرەتی خۆی حەزرەتی ئادەمی لەگڵ درووست کردو ناوی هەموو شتێکی فێرکردو ئەمری کرد بە مەلائیکە سوجدەیان بۆ بردو بەهەشتی کردە مەسکەنی. ئینجا لەبەر خاتری خۆی هێنایە سەر زەوی. جا بەو تەرتیبە لە پێشدا بەهەشتو لە دوای بەهەشت دنیا ئینجا بەرزەخو جارێکی تر بەهەشتی کردەوە قەرارگای ئینسانو بۆ هەر یەکێك لەو چوار قەرارگایانە چەند یاسایەکی دیاری کرد.

دنیای کردە ((دارالعمل))و مەزرەعەی دوا ڕۆژو، بۆ فێربوونی کردەوەی چاكو دووری لە خراپە. پێغەمبەری ناردنو منەتێکی گەورەی لەسەر ئینسان دانا. جا ئەو کەسانەی پێغەمبەرایەتیو ئەمرو فەرمانی ئەوانی قبوڵ کرد، چوە ڕیزی موسڵمانانەوەو ئەوەی سەر پێچیشی کرد چوە ڕیزی کافرانەوە.

ماوەی مانەوەی بەینی مەرگو قیامەت پێی دەڵێن: بەرزەخ. لەوێدا موسڵمانان بە ئاسوودەییو کافر بە نارەحەتی ژیان دەبەنە سەرو جەزاوو سزای حەقیقی لە دوای حیسابی ڕاستەقینەی ڕۆژی قیامەت دەست پێ دەکا.

## ئەووەڵی مەرگ

((ابـن ابـی شـیبه)) و ئیمـامی ئەحمــەد لــە زمـان حــەزرەتی حەســەنەوە دەگێڕنـەوە کـە فەرموویـەتی: کـاتێ خـوای گـەورە حـەزرەتی ئادەمو ئـەولادی ئادەمی دروست کرد، مەلائیکە عەرزیان کرد ئەی خوای گەورە! ئـەو هـەموو ئـەولادی ئادەمـە چـۆن لـە دنیـا جێگایـان دەبێتـەوە؟ خـوا فـەرمووی: مـەرگ دروسـت دەکـەم. فریـشتەکان عـەرزیان کـرد: ئـاخر ئەگـەر مـەرگیان بـۆ دروست بکەی ژیانیان تاڵ دەبێ. خوا فەرمووی: ئومێد دەخەمە دڵیانەوە.

ئەبوو نەعیم لە کتێبی ((حلیلة الاولیاء)) دا دەفەرمووێ: حەزرەتی موجاهید ﷺ فەرموویەتی: کاتێ حەزرەتی ئادەمیان علیه سلام هێنایە سەر زەوی، خوا فەرمووی: ئەی ئادەم! بۆ وێران بوون دنیا ئاوەدانەوەکەو، بۆ مردن با ئەولادت ببێ. جا ئەی ئەو کەسەی کە لە بڵندترین قەسردا دەژی، تۆ بەو زووانە دەچیتە ژێر خاك. مەلائیکەیەك هەموو ڕۆژێك بانگ دەکاو دەڵێ: بۆ مردن لە دایك بن و بۆ وێرانی دنیا ئاوەدانەوەکەن.

## ئەحواڵی قەبر

کاتێ ئینسانێکی موسڵمان مردو خستیانە قەبرەوە، مەلائیکە دەچن دای دەنیشێنن، نە سەری لێ تێك دەچێ و نەغەمی دەبێ. جا پرسیاری لێ دەکەن دەڵێن: تۆ لەبارەی ئیسلامەوە دەڵێی چی؟ ئنجا پرسیاری پێغەمبەری لێ دەکەن. ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ: محمەد پێغەمبەری خوا بوو بە بەڵگەوە ناردی بۆسەر ئێمە باوەڕمان پێ کرد.

ئینجا گۆشەیەکی دۆزەخی نیشان دەدەن کە لەوێدا خەڵك سواری یەکتر بوون و هجومیان هێناوە. ئنجا پێی دەڵێن: بڕوانە خوای تەعالا تۆی لێرەوە ڕزگار کردووە. جا گۆشەیەکی بەهەشتی نیشان دەدەن کە زۆر خۆش و

جوانەو زۆر لەززەتی لێ دەبا. جا پێی دەڵێن: ئەوە جێگای تۆیەو دەچیتە ئەوێ، چونکە لە دنیادا ئیمانت بە دوا ڕۆژ بووەو بەو بیروباوەڕەوە مردیو لەسەر ئەو حاڵەتەشەوە لە ڕۆژی قیامەتا زیندوو دەکرێیتەوە.

بەلاّم کاتێ ئینسانێکی خەراپ دەمرێ، لە قەبردا زیندووی دەکەنەوەو دادەنیشێو زۆر دەترسێ، سوئالەکان لەویش دەکەن. دەڵێ: نازانم. دەرگای بەهەشتی بۆ دەکەنەوەو نازو نیعمەتی بەهەشتی نیشان دەدەن. جا دەڵێن: ئێرە مەنزڵی ئەسڵی تۆ بوو بەلاّم تۆ لێرە دەرکراوی. ئنجا دۆزەخی نیشان دەدەن کە زۆر ناخۆشەو پێی دەڵێن: ئیستا ئێرە جێگای تۆیە، چونکە لە دنیادا شکت لە زیندوو بوونەوەو ڕۆژی قیامەتدا بوو، لەسەر ئەو حاڵەتەشدا مردیو لە لە ڕۆژی قیامەتیشدا لەسەر ئەو حاڵەتە زیندوو دەکرێییتەوە.

لە کتێبی میشکاتدا لەئەبوو قوتادە ڕیوایەت دەکا کە فەرموویان: جارێك جەنازەیەکیان بەلای پێغەمبەردا ﷺ هێنا فەرمووی: ئەو کەسەیان بۆ خۆی ئاسوودە بوو، یان بوو بە هۆی ئاسوودەیی خەڵك. لە دوایا فەرمووی: ئەوە پیاوێکی موسڵمان بووە کە لەدوای مەرگ لە ناڕەحەتی دنیا ڕزگاری دەبێو دەبێتە دراوسێی ڕەحمەتی خوا.

کاتێ بێ دینێك دەمرێ، تەواوی خەڵكو ئاوەدانیو درەختو گیاندار بە مردنی ئاسوودە دەبن. لەبەر ئەوەی بە هۆی شوومی گوناهەکانی لە دنیادا بەلاّو ئافەت نازڵ دەبنو باران نابارێو بە هۆیەوە فەساد پەیدا دەبێ ، دار وشك دەبن، خواردنی حەیوانات کەم دەبێ، جا بە مردنی هەموویان ئاسوودە دەبن. چونکە بە خراپەی وی تووشی عەزاب دەبوون.

ئیبنو عومەر رضي الله عنه دەفەرمووێ: جارێك پێغەمبەر ﷺ دەستی موبارەکی بەسەر شانمدا هێناو فەرمووی: لە دنیادا وەك ئینسانێکی غەریبە بژی، یان وەك ئەو کەسە بژی کەڕێبوارەو بە ڕێگەدا دەڕوا. لە جێگایەکی تردا

دەفەرمووی: کە ڕۆژت لێ بووەوە چاوەڕوانی شەو مەبەو کەشەویش هات چاوەڕوانی ڕۆژ مەبەو لەو ڕۆژانەدا کە سەلامەتی، توێشوی ڕۆژانی نەخۆشیت وەدەست بێنەو، لە ژیانی دنیادا توێشوی مردنت بەرێ بکە.

ئەبوو هورەیرە دەفەرمووێ: جارێك لە خزمەت پێغەمبەردا لەگەڵ جەنازەیەك بووین، کاتێ گەیشتینە گۆڕستان حەزرەت ﷺ تەشریفی چوو بۆ لای قەبرێك و فەرمووی: ڕۆژێك نیە کە گۆڕ بە زمانێکی زۆر فەصیح نەڵێ: ئەی ئەولادی ئادەم! تۆ منت فەرامۆش کردووە، من خانووی تەنیایی تۆم. مەنزڵی بێگانەییم. جێگە دانیشتنی وەحشەتم، لانەی کرمانم. هێلانەی تەنگم. بەڵام بۆ ئەو کەسانە کە خوای گەورە منی بۆ گوشاد بکا. لە پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: قەبر یان باغێکە لە باغەکانی بەهەشت، یان بیرێکە لە بیرەکانی دۆزەخ.

## ترسی قەبر

ئەبوو سەعیدی خدری ﷺ دەفەرمووێ: جارێك پێغەمبەر ﷺ تەشریفی هات بۆ مزگەوت لە کاتێکدا هێندێك قاقا پێ دەکەنین. حەزرەت ﷺ فەرمووی: ئەگەر ئێوە بیرتان لە مەرگ بکرادایەوە کە هیچ خۆشیەك ناهێڵی، ئێوەی لەو کارانە دەگێڕایەوە کە دەبنە هۆی پێکەنینتان. قەبری هەموو کەس هەموو ڕۆژێك بانگ دەکا و دەڵێ: من ماڵی تەنیاییم، من لانەی جودابیم، من هێلالانەی کرمانم.

کاتێ ئینسانێکی موسڵمان دەمرێ و دەی خەنە قەبرەوە، قەبرەکە پێی دەڵێ: زۆر بەخێرهاتی، بە هاتنت زۆر خۆشحاڵ بووم، لەناو ئەو هەموو خەڵکەدا بەسەرمدا دەڕۆیشتن هەر تۆم خۆش دەویست. ئیمڕۆکە هاتووی بۆ لای من خۆش ڕەفتاری خۆمت نیشان دەدەم. لە پاشان قەبرەکە ئەوەندە گوشاد دەبێ تا چاو پڕ بکاو پەنجەرەیەك لە قەبرەکەوە بۆ ناو بەهەشت دەکرێتەوەو بۆنی خۆشی بەهەشت دێتە ژوورەوەو گیانی ئینسان تازە دەکاتەوە.

بەڵام کاتێك کافرێك یان خەراپ کارێك دەمرێ‌و دەی خەنە قەبرەوە، ئەرز پێی دەڵێ: هاتنی تۆ زۆر نەحسەو بە هاتنت زۆر نارەحەت بووم. لەناو تەواوی ئەو خەڵکەدا بەسەرمدا دەڕۆیشتن تۆم زۆر ناخۆش دەویست. ئیمڕۆکە کەوتویە بەر دەستانم بزانە چۆن بەدڕەفتاری خۆمت نیشان دەدەم؟ لەپاشان قەبرەکە وای بە ڕقەوە لە باوەش دەگرێ پەراسووی تێك دەپەڕن‌و حەفتا ئەژدیها دەست دەکەن بە پێوەدانی، ئەو مارانە ژەهریان ئەوەندە زۆرە ئەگەر یەکیان لە لە هەر جێگایەك بمرێ تا ڕۆژی قیامەت ئەو جێگایە گیای لێ سەوز نابێ. ئەوانە تا ڕۆژی قیامەت هەر دەی گەزن پەنا بە خوا لە پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:

قەبر یا باغێکە لە باغەکانی بەهەشت ، یا چاڵێکە لە چاڵەکانی دۆزەخ. لە تەڕغیبدا دەفەرمووێ: ((عبداللە))ی کوری حەزرەتی عومەر رضی الله عنه دەفەرموون: جارێك یەکێك عەرزی حەزرەتی ﷺ کردو گوتی: ئەی ڕەسولی خوا! بە هۆشترین‌و وردبین ترین ئینسان کێ یە؟ فەرمووی: ئەوکەسەیە کە هەمیشە یادی مردن بکاتەوەو خۆی بۆ مەرگ ئامادە بکا. ئەو جۆرە کەسانەن کە لە دنیادا زۆریان ڕیز لێ دەگیرێ‌و لە قیامەتیشدا نیعمەت‌و حوڕمەتی زۆریان دەست دەکەوێ.

## حیکایەتی عومەری کوڕی ((عەبدالعزیز))

جارێك عومەری کوڕی ((عەبدوالعزیز)) رضی الله عنه لەگەڵ جەنازەیەك تەشریفی چوو بۆ سەر قەبران‌و لە گۆشەیەك بە تەنیا دانیشت‌و غەرقی بیرکردەوەبوو، یەکێ عەرزی کرد، ئەی ئەمیری موسڵمانان! خۆ تۆ سەرپەرشتی کەری ئەو جەنازەیە بووی، بۆچی وا دوور دانیشتووی؟ فەرمووی: بەڵێ: گۆڕێك بانگی کردم‌و گوتی: ئەی عومەری کوڕی ((عبدالعزیز))! بۆچی لێم ناپرسی داخۆ من لەگەڵ ئەوانەی دەمرن و دێن بۆ گۆڕستان چۆنیان ڕەفتار لەگەڵدا دەکەم؟

گوتم: تکایە پێم بڵێ: گوتی: من کفنەکانیان دەدڕم، بەدەنەکەیان پارچە پارچە دەکەم، خوێنیان هەموو دەمژم، گۆشتەکەیان دەخۆم، دەت هەوێ بزانی بەندی ئێسقانەکانیان لێ دەکەم؟ شانیان لە باسکیان‌و باسکیان لە دەستیان‌و سەریان لە بەدەن‌و ڕانیان لە ئەژنۆیان‌و ئەژنۆیان لە بەلەکیان‌و بەلەکیان لە پێیان جیادەکەمەوە. یەعنی تەرتیبی تەواوی بەدەنیان تێك دەدەم.

تا ئێرەی گوت‌و دەستی کرد بە گریان‌و بە گریانەوە فەرمووی: مانەوی ئینسان لە دنیادا زۆر کورتە، بەڵام ئارەزووی دنیای زۆر زۆرە، لەودنیایەدا ئەوەی خۆش ڕابوێرێ لە قیامەتدا زەلیلە، ئەوەی پارەدارە لە دوا ڕۆژدا نەدارە، گەنجی ئەو دنیایە زوو پیر دەبێ‌و زیندووی زوو دەمرێ.

گوتی: وریابن نەبادا ماڵی دنیا فریوتان بدا، لەگەڵ ئەوشدا کە دەزانن چەند زوو ڕوو لە ئینسان وەر دەگێڕێ.

ئەو کەسە زۆر ئەحمەقە کە فریوی ئارەزووی دنیا بخوا. ئەوانەی دڵیان بە دنیاوە بوو چوونە کوێ؟ شاری گەورەیان درووست کردن، جۆگە ئاوی گەوەیان لێ دان، باغی گەورەیان پێ گەیاندن، بەڵام لە لە پاش ماوەیەکی کەم هەموویان بەجێ هێشت‌و ڕۆیشتن. ئەوان بە ساغ‌و سەلامەتی خۆیان بە سەهو چوون‌و بەو هۆیەوە کەیف‌و نیشاتیان کەوتە دڵەوەو تووشی گوناه بوون، بەخوا ئەوانە بەهۆی پارەی زۆرەوە یان بوونە باعیسی چاوێنی خەڵك پێیان، هەرچەندە ئەوان لە پەیدا کردنی ئەو پارەیەدا تووشی زۆر تەنگ‌و چەڵمە دەبوون، بەڵام پارەیان هەر باش پەیدا دەکرد. خەڵك حەسوودی پێ دەبردن بەڵام ئەوان گوێیان نەدەدایە کەس، خەریکی پارە کۆکردنەوە بوون و لەو ڕێگایەدا هەموو زەحمەتێکیان بە پێکەنینەوە تەحەمول دەکرد.

ئێستا تەماشا بکەن کرم چی لە بەندی ئێسقانەکانیان کردووە؟ ئەوان لە دنیادا لەسەر تەخت‌و جێگای بڵندو لەسەر فەرشی بە قیمەت‌و دۆشەکی

## دیمەنی مەرگ

نەرمو لەناو خزمەتکاراندا ئیسراحاتیان دەکرد، خزمو دراوسیٚ هەموو کاتیٚ دڵخۆشیان دەدانەوە، بەڵام ئێستا چۆنیان ڕەفتار لەگەڵ دەکریٚ؟ بانگیان بکەنو پرسیاریان لیٚ بکەن داخۆ لە چ حاڵێك دان؟ فەقیرو دەوڵەمەند هەموویان لە مەیدانێکدا کەوتوون، لە خاوەن پارەیەك بپرسە داخۆ پارەکەی بەکەڵکی چی هاتو لە فەقیرێکیش پرسیار بەکە دخۆ لە فەقیریەکەیدا چ زەرەرێکی کردووە؟ لە زمانی ئەو کەسانە پرسیار بکە کە زۆر بلیٚ بوون.

بزانە داخۆ حاڵی زمانیان چۆنە، تەماشای چاوی ئەو کەسانە بکە کە لە هەموو لایەکیان دەڕوانی. لە پێستی نەرمو شلیان بپرسەو لە ڕەنگو ڕووی دڵ ڕفێنیان، بزانە کرم چی لەو بەدەنە ناسکەیان کردووە؟ ڕەنگیان ڕەش کردوون، گۆشتیان خواردوون، گلیان بەسەردا کردوون، ئەندامەکانیان لێك جیا کردوونەوە، زەڕڕە زەڕڕەی بەدەنیان لێك ترازاوە،لە کوێن ئەو خزمەتکارانەی کە هەمیشە بەڵیٚ قوربانیان بۆ دەکردن؟ سەراو پەردەو تاغەکانیان لە کوێن کە ئیسراحەتیان تێدا دەکردن؟ خەزانەکانیان لە کوێن کە زۆریان ئاگاداری دەکردن؟ خۆ خزمەتکارەکانیان هیچیان بۆ نەخستنە ناو گۆڕەکانیانەوە؟

جێگایەکیان بۆ ڕانەخستن، سەرینیکیان بۆ دانەنان، ئەوانە کەوتنە تەنیایی، لە تاریکیدا خەووتون، لای ئەوان ڕۆژو شەو فەرقی نیە، ناتوانن مولاقاتی دۆستانیان بکەن، ناتوانن کەس بۆ لای خۆیان بانگ بکەن. چەند ژنو پیاوی ناسك بەدەن بوون، کە ئێستا لەژێر خاکدا ڕزیون، ئەندامەکانیان جیابونەوە، گلێنەی چاویان هاتۆتە دەریٚ، گەردنیان لە دوور کەوتووە، دەمیان پڕە لە ئاوو چڵكو کرم بەسەر تەواوی بەدەنیاندا دەخزن. ئەوان کەوتونە ئەو حاڵەوە پیاو بەزەیی پێدا دێنەوە، لە کاتێکدا ژنەکانیان شویان کردوەتەوەو ڕای دەبوێرن، کوڕەکان دەستیان بەسەر خانووەکانیاندا گرتووەو واریسەکان ماڵەکەیان دابەش کردووە.

بەڵام لە عەینی حاڵیشدا کەسانێك هەن لە قەبرەکانیاندا لەززەت دەبەنو بە ڕەنگی جوانو ئاسوودەیی ژیان دەبەنەسەر لە گۆڕدا، ئەوانە ئەو کەسانەن

کە لە دنیادا دوا ڕۆژیان لەبیر بوو، ئومێدیان بە دوا ڕۆژ لە ئومێد بە دنیا زیاتر بوو، پێویستی ئەو سەفەرەیان ئامادەکردبوو، ئەی ئەو کەسەی کە بەیانی دەچێتە گۆڕەوە! چی لەو دنیایەدا تۆی تەفرە داوە؟ ئایا ئومێدت هەیە ئەو دنیا بێ نرخە لەگەڵ تۆدا بسازێ؟ ئومێدت هەیە کە لەو دنیا فانیەدا هەمیشە دەمێنیەوە؟ ئەو خانووە گەورانەت، میوەی گەیشتووی باغەکانت، تەختو جێگای نەرمی نووستنت، لیباسی هاوینیو زستانیت، هەمووی لێرە بەجێ دەمێنێ. کاتێ ئیزرائیل هات بۆ لات هیچ شتێك ناتوانێ بیگێڕێتەوە ئارەقەت لە بەدەن دێتە خوارەوە، تینوایەتی تینت بۆ دێنێ، لەکاتێکدا ئەزیەتی گیان کێشان دەچێژی، خۆت لە عەرزی دەدەی، حەیف سەد حەیف! ئەی ئەوکەسەی ئیمڕۆ لە کاتی مردنی براکەتدا چاوانی لە سەریەك دەدەنێی، چاوی کوڕە مردووەکەت وێك دەنێی و چاوی باوکە مردووەکەت لەسەر یەك دەنێی، یەکیان دەشۆی بە دەستی خۆت، یەکی تریان کفن دەکەی ، لەگەڵ جەنازەی یەکی تریاندا دەچی بۆ سەر قەبرانو یەکێ دفن دەکەی! بەیانیش خۆت دوچاری ئەو سەرونوشتە دەبی.

ئینجا دوو شیعری خوێندەوەو فەرمووی: ئینسان بە بوونی چەند شتێك خۆشحاڵ دەبێ کە بە زوویی لە بەین دەچنو خەریکی ئارەزووی ئایندەو لە ئومێدی ئێستادا دەمێنێتەوە. ئەی ئەحمەق! نابێ بە لەززەتی خەوی غەفڵەت بە سەهو بچی، تەواوی ڕۆژت بە غافڵیو شەوت بە خەو دەبەیتە سەر، لە حاڵێکدا کە مەرگ هەموو ئانێك هەڕەشەت لێ دەکا. ئیمڕۆ چەند کارێك دەکەی، کە سبەینێ بە هۆی ئەو کارانەوە تووشی ناڕەحەتی دەبی، تۆ لە دنیادا وەك چووارپێیان دەژی،. دەڵێن: ئێستا حەفتەیەك لە دوای ئەو تێ نەپەڕی بوو کە عومرەی کوڕی ((عبدالعزیز)) وەفاتی فەرموو.

## دەرسی دە

## حورمەتی موسڵمانان و بێ حورمەتی کافر لە کاتی مەرگ و دوا مەرگدا

کاتێ جابیری کوڕی زیاد ﷻ لە گیان کێشاندا بوو، یەکێك لێی پرسی ئارەزووت چیە؟ فەرمووی: پێم خۆشە چاوم بە حەسەنی بەسری بکەوێ،

کاتێ شێخ حەسەن ﷻ تەشریفی هات خەڵك گوتیان: شێخ حەسەن تەشریفی هێنا. جابیر ڕووی کردە شێخ حەسەن و فەرمووی: برادەر! کاتی کۆچە و خەریکم دەڕۆم، بەڵام نازانم بۆ بەهەشت دەچم یا بۆ جەهەننەم.

تەمیمی داری دەفەرمووێ: خوای تەعالا بە قابیزی ئەرواح دەڵێ بچۆ بۆ لای فلان دۆستم و گیانی بکێشە. چونکە لە خۆشی و ناخۆشیدا تاقیم کردووەتەوە. من چۆنم دەویست ئەو ئاوا بوو، بچۆ بی هێنە تا لە نارەحەتی دنیا ڕزگاری ببێ، ئیزرائیل لەگەڵ کۆمەڵێك لە مەلائیکە واتە پێنج سەد مەلائیکە دەێن بۆ لای و وە هەر یەکە دەستە گوڵێکی ڕیحانی بەهەشتی بە دەستەوەیە و هەر گوڵەی بە بیست ڕەنگ دەنوێنێ و هەر ڕەنگی بۆنیکی خۆشی تازەی هەیە، بەبێ ئەوەش هەر مەلائیکەی دەستە سڕێکی سپی بە دەستەوەیە بۆنی میسکی لێ دێ.

ئیزرائیل دەچێ لە لای سەری دادەنیشێ و مەلائیکە دەوری دەدەن و دەستی بەسەر ئەندامەکاندا دێنن و دەسرە بۆن خۆشەکەی وەبن شانی دەدەن و دەرگایەکی بەهەشتی لە پێش چاو دەکەنەوە و بە شتی جۆراوجۆری بەهەشت سەرگەرمی دەکەن. هەر وەك کە منداڵێك دەگری و بە نیشان دانی شت ژیری دەکەنەوە، جارێك حۆری لە پێش چاو ڕادەگرن، گاهێ میوەی بەهەشتی نیشان دەدەن، تاوێك بەرگ و لیباسی بەنرخ و جارێك ئەنواعی

شتی جیاجیا، حۆریەکانی لە خۆشیدا دەکەونە هاتو چۆ، بەچاو پێکەوتنی ئەو دیمەنانە ڕوحی لە بەدەنیدا وەك باڵندەیەك لە قەفەسدا بۆ هاتنە دەرەوە پەلە پەل دەکاو ئیزڕائیل پێی دەڵێ: ئەی ڕوحی موبارەك! وەرێ کەوە بۆ ژێر سێبەری داری ((سیدر)) کە زۆر فێنکەو دڕکی نیەو بۆ خواردنی ئەو هیشوە مۆزانەو ئەو سێبەرە نەبڕاوە. هەروەکو خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرمووێ:

﴿ فِي سِدْرٍ مَّخْضُودٍ (٢٨) وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ (٢٩) وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ (٣٠) ﴾ الواقعة: ٢٨ - ٣٠

لەژێر داری سیدری بێ دڕكو داری مۆزی چڕو پڕو سێبەری ڕاکشاودا، ئیزڕائیل وا لەسەر خۆ قسە دەکا وەك دایکێکی میهرەبان لەگەڵ منداڵەکەی بدوێ، چونکە دەزانێ ئەو ڕوحە زۆر لە خوا نزیکەو لەگەڵ ئەو ڕوحە ڕەفتاری خۆش دەبێ تا خوا لێی ڕازی بێ.

جا ئەو ڕوحە وا لەو بەدەنەی جیا دەبێتەوە، وەك موویێك لەناو ئارد بێنیە دەرەوە. کاتێ ڕوحی لە بەدەنی هاتە دەرەوە هەموو مەلائیکەتەکان سەلامی لێ دەکەنو مژدەی چوونی بەهەشتی پێ دەدەن. هەر وەك خوای تەعالا لەبارەی ئەجۆرە کەسانەدا لەسورەتی ((نحل))داو لە سورەتی (الواقیعە)) دا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ طَيِّبِينَ يَقُولُونَ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمُ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ (٣٢) ﴾ النحل: ٣٢ .. ﴿ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ (٨٩) ﴾ الواقعة: ٨٩ جاکاتێ ڕوح لە بەدەنی جیا دەبێتەوە پێی دەڵێ: خوای تەعالا پاداشتی بەخێرت بداتەوە، تۆ کەسێك بووی لە ئیتاعەی خوادا پەلەت دەکردو بێ ئەمریت نەدەکرد. ئەو ڕۆژەت لێ پیرۆز بێ، چونکە نەك هەر خۆت بەڵکو منیشت لە عەزاب نەجات دا. بەدەنیش بەو جۆرە خوا حافیزی لە ڕوح دەکا. ئەو جێگایانەی خوا پەرستی تێدا کردبوون بۆی دەگرین دەرگاکانی ئاسمان دەگرینو کە کردەوەی خێری ئەویان پێدا دەچوو بۆ ئاسمانو ڕزقی ئەویان پێدا دەهاتە خوارەوە.

لە پاش مەلائیکەتانە دەوری جەنازەکەی کۆدەبنەوەو کاتێ مردوو شۆر ئەم دیو ئەو دیوی دەکەن مەلائیکە یارمەتی دەدەن کە کفنیان کرد، مەلائیکەش ئەو کفنەی لەگەڵ خۆیان هێنابوو تێیەوە دپێچن‌و عەتری پێ دەکەن، لە پاشان لەبەر دەرگای ماڵەکەیانەوە تا سەر قەبرەکەی لە دوو لاوە سەف دەبەستن، بە دوعاو تەڵەبی لێ خۆش بوونەوە بە خێرهاتنی دەکەن.

کاتێ شەیتان ئەو هەموو دیمەنانە دەبینێ بە لەشکرەکەی دەڵێ: لەعنەتی خواتان لێ بێ‌و وەها دەگری ئێسقانەکانی دەقڵەشن‌و بە جەماعاتەکەی دەڵێ: چۆن بوو ئەوەتان لە دەست چوو؟ لە وەڵامدا دەڵێن: لەبەر ئەوەی بێ گوناه بوو.

لە پاشان ئیزرائیل ڕوحەکەی دەبا بۆ ئاسمان، جوبرائیل لەگەڵ حەفتا هەزار فریشتە بە پیریەوە دەچن. ئەو فریشتانە لە لایەن خوای گەورە مژدەی زۆری پێ دەدەن، جا کاتێ ئیزرائیل دەی با بۆ عەرشی خوا دەچێتە سوجدەو لە پاشان خوای تەعالا دەفەرمووێ. ڕوحی ئەو بەندەی من بەرە بۆ : ﴿ فِي سِدْرٍ مَّخْضُودٍ ﴿٢٨﴾ وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ ﴿٢٩﴾ ﴾ الواقعـة: ٢٨ – ٢٩ جا کاتێ لاشەکەیان خستە قەبرەوە، نوێژەکانی لە لای ڕاستی ڕادەوەستن، ڕۆژووەکانی لە لای چەپی‌و قورئان خوێندن‌و زکری خوای لەسەر سەری ئەو هەنگاوانەی بۆ چوونی مزگەوت هاوێشبوونی لە لای قاچیەوەو، سەبر لەسەر مووسیبەت لە تەنیشت قەبرەکەی ڕادەوەستن، لە پاشان عەزابی خوا سەر لە قەبرەکە ئێنێتە دەرو دەی هەوێ خۆی بگەیەنێتە مردووەکە، بەڵام ئەگەر لەلای ڕاستیەوە بچێ نوێژ پێی دەڵێ: بڕۆ بەو لاوە، بەخوا ئەو پیاوە لە دنیادا زەحمەتی زۆری کێشاوە، ئێستا خەوی لێ کەوتووە. جا لە لای چەپ دەچێتە پێشەوە، دووبارە ڕۆژوو دەی گێڕێتەوە. جا لەلای سەریەوە دەچێتە پێشەوەو قورئان‌و زکری خوا بەری پێ دەگرن. خولاسە لەهەر لایەکەوە بێ

هەوێ بچێتە پێشەوە ڕێگای نادەن، چونکە عیبادەت لە هەموو لایەکەوە دەوری دۆستی خوا دەگرن و عەزاب دەگێڕنەوە.

لە پاشان سەبر کە لە گۆشەیەك ڕاوەستاوە بە عیبادەتەکان دەڵێ: من چاوەڕوانی ئەوەبووم کە ئەگەر بە هۆی ناتەواوی عیبادەتێکەوە تووشی ناڕەحەتی ببێ لەسەر بکەمەوە، بەڵام حەمد بۆ خوا ئێوە بەسەر یەکەوە دیفاعتان لێ کرد جا من لە کاتی کێشانی ئەعمالیدا یارمەتی دەدەم.

ئینجا دوو مەلائیکە دێن چاویان بەرقی لێ دەباریێ، دەنگیان وەك گرمەی هەورە، دانیان وەك شاخی گایە، هەناسەیان وەك بڵێسەی ئاگرە، تووکی سەریان دەگاتە قاچیان، بەینی ئەمشان تا ئەو شان چەند ڕۆژ ڕێگایە، قەت سەرفی نەزەریان نیە، هەرچەند لەگەڵ موسڵمانان خۆش ڕەفتارن، بەڵام تەنیا سامەکەیان کەم نیە. ناویان نەکیرو مونکەرە، هەر یەکەی چەکوشێکی گەورەی بەدەستەوەیە، تەواوی ئەجننەو ئینسانی دنیا نای توانن. دێن و بە مردوو دەڵێن: دانیشە. دادەنیشێ و کفنەکەی لەسەری دەخزێ تا دێتە سەر شانی. جا پرسیاری لێ دەکەن: خوات کێ یە؟ لەسەر چ دینێکی؟ ناوی پێغەمبەرەکەت چیە؟ مردووەکە دەڵێ: خوای من ئەوکەسەیە کە بێ شەریکەو دینم ئیسلامەو پێغەمبەرم ((محمد المصطفی)) ئاخری پێغەمبەرانە. دەڵێن: ڕاست دەکەی. لە پاشان لە هەموو لایەکەوە پاڵ بە دیوارەکانەوە دەنێن قەبرەکە گەورە دەبێ، جا دەڵێن: سەرت بەرزکەرەوە. کاتێ سەر بەرزدەکاتەوە چاوی بە دەرگایەك دەکەوێ بەهەشتی لێوە دیارە. جا دەڵێن. ئەی دۆستی خوا! ئەوە جێگای تۆیە لەبەرو ئەوەی تۆ ئیتاعەی خوات کردوە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: قەسەم بەو خوایەی کە گیانی من لە دەستی قودرەتی دایە ئەوەندە خۆشحاڵ دەبێ جارێکی تر خۆشحاڵی وا نابینێ. جا

دەڵێن: تەماشای لای خوارەوەت بکە، کە تەماشای لای قاچانی دەکا چاوی بە دەرگایەکی دۆزەخ دەکەوێ فریشتەکان پێی دەلێن: ئەی دۆستی خوا! تۆ لێرە نەجات بووە. ئەوەندە خۆشحاڵ دەبێ کە بە خەیاڵدا نەیە. ئنجا لە قەبرەکەیدا حەفتا دەروی بۆ بەهەشت لێ دەکرێتەوە کەهەر یەکەی بایەکی خۆش و بۆنیکی خۆشی لێوە دێ و تا ڕۆژی قیامەت لەو حاڵە دا دەبێ.

جا ئێستا گوێ لە ژیانی یەکێ تر ڕاگرەو بزانە حاڵی ئەو چۆنە.

خوای گەورە ئەمر دەکا بە ئیزڕائیل و دەفەرمووێ: بچۆ بۆ لای ئەو دوژمنەی من و گیانی لە لاشەی بێنە دەرێ، من زۆرم چاکە لەگەڵ کردو لە بەخشینی هیچ نیعمەتێکدا درێغیم لەگەڵ نەکرد، بەڵام ئەو دووبارە بێ ئەمری منی کرد، بچۆ بۆم بێنە تا تەنبێی کەم، ئیزڕائیل بەوینەیەکی سام ئاوەرەوە دەچێ بۆ لای و دووازدە چاوی هەیەو گوورزێکی ئاگراوی دڕك داری بە دەستەوەیەو پێنج سەد مەلائیکەی لەگەڵە، هەر یەکەی پارچە مسێك و پشکۆی ئاگری جەهەننەم و شێلاقی ئاگرینیان بەدەستەوەیە. هەرکە ئیزڕائیل گەیشتە لای بە گورزە دڕکاویەکە دایدەگرێ و بەرەگ و ڕیشەیدا دەچێتە خوارەوە. ئیزڕائیل دڕکەکان ڕادەکێشیتەوە و دووبارە هەربەو گورزە دڕکاویانە دای دەگرێتەوەو فریشتەکانی تریش بە شێلاق سەرو سوڕەتی دادەگرن و بە لێدان بێ هۆشی دەکەن. ڕوحی لەسەری قامکی پێیانیەوە تا پاژنەکانی دێنن و کوتەك کاری دەکەن. لەپاشان لە پاژنەکانی ڕا تا ئەژنۆیانی دێنن و دەست دەکەنەوە بە لێدانی.

ئینجا وردە وردە ڕوحی لە ئەژنۆوە تا سکی و تا لە هەموو بەدەنی ئێتە دەرەوە جار لەگەڵ جار کوتەك کاریەکی باشی دەکەن لە پاشان فریشتەکان مس و پشکۆیەکانی وەژێر چەنەگەی دەدەن و ئیزڕائیل دەڵێ: ئەی ڕوحی مەلعون! وەرە دەرێ و بڕۆ بۆ جەهەننەم ئەو جەهەننەمەی کە خوای گەورە لە سوڕەتی ((واقعە)) دا باسی دەکاو دەفەرمووێ: ﴿ فِي سَمُومٍ وَحَمِيمٍ ﴿٤٢﴾ وَظِلٍّ

مِّن يَحْمُومٍ (٤٣)﴾ الواقعة: ٤٢ – ٤٣ کافرەکانو بێ دینەکان دەچنە ناو گەرماوی زۆر بە شیددەتو ئاوی لە کوڵو سێبەری گەرمی دووکەڵاوی.

جا لەکاتی خوا حافیزی ڕوحی دەڵێ: خوا پاداشتی خەراپت بداتەوە، تۆ بووی کە منت لە ڕێگای ڕاست لاداو هەڵت دەنام بۆ گوناه کردن خۆشت بە هیلاك داو منیش.

بەدەنیشی هەروەها بە ڕۆحی دەڵێ: وەهەر جێگایەك کە لە زەوی گوناهی تێدا کردبێ نەعلەتی لێ دەکاو لەشکری شەیتان ڕادەکەن بۆ لای شەیتانو مژدەی بۆ دەبەن کە یەك نەفەریان برد بۆ جەهەننەم. جا کە خستیانە قەبرەوە زەوی وای بە توندی دەباوەش دەگرێ پەراسووی تێك دەپەڕن. ئنجا دوو ماری ڕەش یەکیان لە لووتی ڕاو ئەوی دیان لە پێیانیەوە دەست دەکەن بە پێوەدانی تا لە ناوەڕاستی لاشەکەی بەیەك دەگەنەوە.

جا دوو فریشتە بە ناوی ((نەکیرو مونکەر)) کە لە پێشەو باسمان کردن دێن بۆ لایو دەڵێن: خوات کێیەو لەسەر چ دینێکیو پێغەمبەرت کێ یە؟ لە وەڵامدا دەڵێ: نازانم. بە گورزی ئاگری دەست دەکەن بە لێدانی، قەبرەکەی پڕ دەبێ لە پشکۆ. لە پاشان دەڵێن: بۆ سەرەوە بڕوانە. کەسەر لە ئەژنۆی بەرزدەکاتەوە دەرگایەکی بەهەشت کراوەتەوەو دیمەنی باغو بەهاری لێوە دیارە، ئەو دوو فریشتە پێی دەڵێن: ئەی دوژمنی خوا! ئەگەر ئیتاعەی خوات بکردایە ئەوە جێگای تۆ بوو،

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: قەسەم بەوکەسەی کە گیانی منی بەدەستە لەوکاتە ئەو کەسە دوچاری حەسرەتێك دەبێ کە قەت تووشی حەسەرەتی وا نابێتەوە. جا دەرگای دۆزەخی بۆ دەکرێتەوەو پێی دەڵێن: ئەی دوژمنی خوا! ئێستا ئەوەیە جێگای تۆ.

## دیمەنی مەرگ

### وەزعی خەڵك لە گۆڕدا

گەورە پیاوێك دەڵێ: جارێك داوام لە خوا كرد وەزعی ئەهلی گۆڕستانم نیشان بدا. شەویك لە خەومدا ڕۆژی قیامەت بوو، مردوو خەریك بوون لە قەبرەكانیان دەهاتنە دەرێ،تەماشام كرد یەكێ لەسەر دۆشەكی ئەتڵەس و یەكێ لەسەر قەرەوێڵەو یەكێ لەسەر تەختێكی بەرزو یەكێ لەسەر گوڵ دانیشتون.

یەكێ پێ دەكەنێ و یەكێ دەگری. گوتم: ئەی خوای گەورە! ئەگەر حاڵی هەموانیان وەك یەك بوایە. چەند خۆش بوو. یەكێ لە مردووەكان گوتی: ئاخر ئەوە هەمووی بە هۆی جیاوازی كردەوەی خۆیانە: ئەوانەی لەسەر ئەتڵەسن عەدەتیان زۆر باش بووە، ئەوانەی لەسەر قەرەوێڵەن ئەو كەسانەن كە لەڕێگەی خوادا شەهید كراون و ئەوانەی لەسەر گوڵانن ڕۆژووەوانی ئوممەتی پێغەمبەرن و ئەوانەی كە دەگرین جینایەتكاربوون و ئەوانەی لەسەر تەختی بەرزن و ئەوكەسانەن كە وەك خوا فەرمووبوی یەكتریان خۆش دەویست.

كفن دزێك بوو قەبری هەڵدەدایەوەو كفنی مردووەكانی دەدزی، جارێك قەبرێكی هەڵدایەوە، تەماشای كرد یەكێك لەسەر تەختێكی بڵند دانیشتووە و قورئانی لە پێشە قورئان دەخوێنێ و جۆگە ئاوێك بە ژێر تەختەكەیدا دەڕوا، كە چاوی بەو دیمەنەكەوت ئەوەندە ترسا هاتە ئەملای گۆڕستانەكە و بەلادا هات، خەڵك زانی و چوون هێنایانەوە، لەپاشان لێیان پرسی ئەوە چی بوو؟ بۆ وات لێ هات؟ هەرچی دی بووی بۆی گێڕانەوە.

هەندێكیان داوایان لێ كرد كە ئەو قەبرەیان نیشان بدا. گوتی: باشە ڕۆژێك نیشانتان دەدەم، بۆ شەوێ كابرای ناو قەبرەكە گوتی: ئەگەر قەبرەكەمیان نیشان بدەی دوچاری ئافەتێك دەبی قەت ڕزگارت نابێ، بەڵێنی دا كە نیشانی كەسی نەداو، تا مردن بە كەسی نەگوت.

## هاواری مردوو بەهۆی گورزی ئاسنەوە

لـە بـەڕرای کـوڕی عازەبـەوە ﷺ ڕیوایـەت دەکـەن کـە ڕەسـولی خـوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێ کافر وەڵام دەداتەوەو دەڵێ: بەداخەوە نازانم، یەکێك لە ئاسمانەوە بانگ دەکاو دەڵێ: درۆ دەکا، پشکۆی سوری بۆ ڕابخەن، لیباسی ئاگری لەبەر کەن و دەرگایەکی دۆزەخی بۆ بکەنەوە. دەرگایەکی بۆ دەکەنەوە گەرماو بای دۆزەخی بۆ دێ و قەبرەکەی ئەوەندە تەنگ دەبێتەوە پەراسووی تێك دەپەڕن، جا مەلائیکەیەکی کوێرو کەڕی بۆ دەنێرن بە گورزێ گەورە ئەگەر لە کێوێکی بدا پارچە پارچە دەبێ، لە پاشا فەرمووی: کاتێ دەست دەکا بە لێدانی ئینسان و ئەجیننە نەبێ تەواوی مەخلوقاتی خوا گوێیان لێیە، بەیەك گورز دەبێتەوە خاك و دووبارە زیندوو دەکرێتەوە.

لە حەدیسی بوخاری و موسلیم دا هاتووە کە بەهۆی لێدانی ئەو گورزەوە ئەوەندە بە توونـد هـاوار دەکـا کـە ئەجیننـەو ئینسان نـەبێ هـەموو گیـان لەبەرێك گوێی لێ یە. جا لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە پێشەوە کە بۆچی ئەجننەو ئینسان گوێیان لە هات و هاواری نیە؟ وەڵامەکەی ئەوەیە کە ئینسان و ئەجیننە لەگەڵ عالەمی بەڕزەخدا سەروکاریان هەیە، جا ئەگەر عەزابی قەبریان نیشان بدرێ یان گوێیان لە لێدان و هاواری مردووان بێ دەبێ فەوری ئیمان بێنن و دەست بکەن بە کاری چاك، لە سوورەتێکدا کە لە خزمەت خوادا ئیمان بە شتی غەیبی موعتەبەرە، واتا دەبێ گوێ لە فەرمایشتی پێغەمبەران بگرن و قبوڵی بکەن، مەعنای بزانن یا نەزانن. بەهەر حاڵ فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ بە ڕاست بزانن، ئەوە پێی دەڵێن ئیمان. جا بەبێ شك ئەوکەسانەی لە خوای خۆیان دەترسن بێ ئەوەی خوایان دیبێ سەواب و پاداشتیان زۆرە، ئەگەر ئەوزاعی دۆزەخ و بەهەشت و بەرزەخیان

نیشان بدرێ پێویست بە ئیمان بە غەیب نابێو دەبێ هەموو ئیمان بێننو موسڵمان ببن. بەڵام لە لای خوا ئیمان هێننان بە شتێك بە چاو بیبینێ موعتەبەر نیە، جا لەبەر ئەوەیە کە لە کاتی مەرگدا ئیمان هێنان قبوڵ ناکرێ، چونکە لەو کاتەدا فریشتەی عەزاب دەبیندرێن. وەك خوای گەورە لە سورەی ((غافر))دا دەفەرمووێ: ﴿ فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَٰنُهُمْ لَمَّا رَأَوْا۟ بَأْسَنَا ﴿٨٥﴾ ﴾ غافر: ٨٥ واتە کاتێ عەزابی ئێمەیان دی تازە ئیمان هێنان سوودی نیە. لە نیشان نەدانی عەزابی قەبر بە خەڵكو لە نەبیستنی لێدانی مردووان بە گورزی گران سوودی زیندووەکان ئەوەیە کە ئینسان خۆی بۆ ئەو عەزابو دەنگی ئەو گورزانە ڕاناگرێ. ئەگەر چاویان بە عەزابی قەبر بکەوێ یا گوێیان لێ بێ خۆیان ڕاناگرنو بێ هۆش دەبن. هەروەك ئەبوو سەعد دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کاتێ جەنازەی ئینسانێکی بێ دین لەسەر شان دەبەن گۆڕستان دەڵێ: ئەی هاوار بە ماڵم ئەوە بۆ کوێم دەبەن! ئینسان نەبێ هەموو شتێك گوێی لە دەنگییەتی، ئەگەر ئینسان گوێی لێ بێ بێ هۆش دەبێ. دیارە خوای گەورە نەبێ پێغەمبەری هەر ئاگادار کردبێ بەسەر ئەسراری بەرزەخدا، بەڵکو نیشانیشی داوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ خۆی بۆ ئەو جۆرە شتانەی ڕاگرتووە، تەنانەت لە پاش چاو پێکەوتنی ئەو دیمەنەشو دیمەنی دۆزەخیش لە پێ کەنینو لە قسە کردنو لە هەستانو دانیشتو لە خواردنو خواردنەوەو لەگەڵ ئەسحابەکاندا فەرقی پێ نەدەکرا.

لە ئەییوبەوە ﵁ ڕیوایەت کراوە کە جارێك ڕەسولی خوا ﷺ لە پاش ڕۆژ ئاوابوون تەشریفی چوە دەرەوەی شاری ((مەدینە)) دەنگێکی بیست زۆر وەحشەتناك بوو. بە بیستنی ئەو دەنگە فەرمووی جوولەکەکان لە قەبردا عەزاب دەدرێن.

## دیمەنی مەرگ

زەیدی کوڕی سابیت ﵁ دەفرمووێ: جارێك ڕەسووڵی خوا ﷺ سواری ئێسترەکەی ببوو دەچوو بۆ ناو باغێکی قەبیلەی بەنی نەجارو ئێمەشی لە خزمەتدا بووین، لەناکاوێك ئێسترەکەی ترساو وا غاری دا زۆری نەمابوو تەشریفی بەرەوەبێ. لە جێگایە پێنج شەش قەبری لێ وو، حەزرەت ﷺ لەبارەی ئەو قەبرانەدا فەرمووی: کێ خاوەنی ئەو قەبرانە دەناسێ؟ یەکێ عەرزی کرد: من دەیان ناسم. فەرمووی: ئەوانە کەی وەفاتیان کردووە؟ کابرا گوتی: لەدەوری پێش ئیسلامدا وەفاتیان کردووە. حەززرەت ﷺ فەرمووی: لە قەبردا ئینسان عەزاب دەدرێ، فەرمووی: ئەگەر ترسی ئەوەم نەبوایە کە ئێوە تەرکی مردوو ناشتن بکەن لە بەرخوا دەپاڕامەوە کە ئێوەشی ئاگادار بکردایە بەسەر دەنگی مردوواندا هەروەك منی ئاگادار کردووە.

## دەرسی یازدە

## ئەنواعی عەزابی ترسێنەری قەبر

لــە سمــرەی کــورە جەنــدەب ﷺ ڕیوایــەت کــراوە کــە پێغەمبــەری خوشەویـست ﷺ عـادەتی وابـوو لـە ڕەفیقـەکانی دەپرسـی کـێ خـەوێکی دیوە؟ ڕۆژێك بەیانی خۆی فـەرمووی: ئیمشەو لـە خەومـدا دوو نەفـەر هاتنـە لامو بردیانم بۆ لای (بیت المقدس)) بەلای پیاوێکدا ڕۆیشتین ڕاکشا بوو، یەکێ تر بە بەرد لەسەری ڕادەکێشا، کاتێ بەردەکەی پێدا دەدا سەری پارچە پارچە دەبوو، بەردەکـە دەکەوتـە لایـەك، کابرا دەچوو بەردەکە هەڵگرێتـەوە سـەری کـابرا وەك خـۆی لێ دەهاتـەوەو کـابرا دەسـتی دەکـردەوە بـە سـەر کوتـانی. ئەو وەزعـە هـەر دەوامـی بـوو تـا بـە یـەکێ لە دوو هاوڕێکـانم گـوت ((سبحان لله)) دەبێ ئەو دوو نەفەرە کێ بن؟ ڕەفیقەکەم گوتی: تۆ تۆزێك بچۆ پێشەو کاتێ چووینە پێشەوە پیاوێك لەسەر دۆشەکێك ڕاکشابوو، پیـاوێکی دی لێـوی بـە مەقاشـێکی ئاسـن بـۆ لای پـشتەملی ڕادەکێشا، تـا لێوەکـەی تریشی ڕادەکێشا ئەوەی پێشوویان دەچووەوە جێگای خۆی. گوتم ((سـبحان الله)) دەبێ ئەوانـە کـێ بـن؟ گوتیـان: دووبـارە بـڕۆ پێـشەوە، بەرەو پێـشەوە ڕۆیشتین، لە ڕێگـادا تـەنوورێکمان دی زۆر شـلۆق بـوو، تەماشامان کرد ژنو پیاوی ڕووتی تێدا بوو کە بڵێسەی ئاگری لێی دەدان هاواریان دەکرد، بۆنی ناخۆشی سووتانی لەشیان کەس خۆی بۆ ڕانەدەگرت. پرسیم: ئەوانە کێو چ کەسـەن؟ گوتیـان: دووبـارە بـەرەو پێـشەوە بـڕۆ، لـە جۆگایـەك پەڕینـەوە ئاوەکەی وەك خوێنی سوور بوو، پیاوێك مەلەی تێدا دەکردو پیاوێکی دی چـەند بـەردێکی بەدەسـتەوە بـوو. کـاتێ کـابرای مەلـەوان دەهاتـە قـەراغی جۆگاکە بەردێکی وەك لوقمە دەخستە دەمەوە. چەند جار ئاوام دی، پرسـیم: ئەوانە کێن؟ لە وەڵامدا گوتیان: کارت نەبێ بەرەو پێشەوە بڕۆ، ڕۆیـشتین، بە

## دیمەنی مەرگ

لای باغێکی خۆش‌و سەوزو دڵگیردا ڕۆیشتین، پیاوێکی بالاَ بەرزی لەناودا بوو نەمان دەتوانی تەماشای سەری بکەین. منداڵی زۆر دەوری دابوو، قەتم ئەو منداڵانە نەدی بوو: گوتم: ئەوانە کێن؟ جاریَ درێژە بە ڕۆینەکەت بدە. ئینجا گەیشتینە باغێکی گەورەی خۆش‌و قەتمان باغی وا جوان نەدی بوو. کاتیَ بە ئیشارەی ڕەفیقەکەم چووینە ناو باغەکە شارێکی بە خشتی زێرو زیو تێدا دروست کرابوو. چووینە بن دەروازەی شارەکەو کردمانەوەو چووینە ناو شار، لەوێدا چەند کەس هاتنە لامان نیوەی لەشیان زۆر جوان‌و نیوەکەی تریان زۆر ناشیرین بوو. ڕەفیقەکەم پێی گوتن خۆتان باوێنە ناو ئەو جۆگە ئاوەی ڕوو بەڕووتانە. چوون خۆیان هاوێشتە ناو ئاوەکەوە. جۆگایەکە زۆر پان بوو. ئاوەکەی وەك شیری سپی بوو. کاتیَ لە جۆگایەکە هاتنە دەرەوە ناشرینیەکەیان نەمابوو بەدەنیان زۆر جووان ببو. ڕەفیقەکەم پێی گوتم: ئەوە ((جنت العدن))ە و جێگای تۆ ئێرەیە. کە تەماشام کرد قەسرێکی سپیم هاتە بەرچاو.ڕەفیقەکەم گوتی: ئەو قەسرەش جێی دانیشتنی تۆیە. گوتم: خوا دەوامتان بدا بێڵن با تاوێك بچمە ناوی، گوتی: ئێستا ناتوانی، بەلاَم هەر دێیتە ناوی.

هەرچی لە ئەووەڵەوە تا ئێرە ڕووی دابوو، هەر دیمەنێکی عەجایبی دی بوومان لە ڕەفیقەکەم پرسی .گوتی ئەو کەسەی کە بەردەکەمان لەسەری ڕادەکێشا ئەو کەسەیە قورئان دەخوێنیَو لە بیری دەباتەوە بە عەمدیو نوێژی فەرزی تەرك دەکردو دەنووست، تا ڕۆژی قیامەت ئاوای ڕەفتار لەگەلَ دەکریَ . ئەو کەسەی لە لێوو لەغاوەیان ڕادەکێشا ئەوە ئەو کەسەیە کە ڕۆژ تا ئێوارە هەر درۆ دەکا،

ئەویش تا ڕۆژی قیامەت هەر وای لیَ دەکەن. ئەو ژن‌و پیاوانەی لە تەندورەکەشدا دەیان سووتاندن ئەوە زیناکارن، ئەوەی لە جۆگا خوێنەکەشدا مەلەی دەکردو دەهاتە قەراغی بەردێکیان دەخستە دەمەوە،

## دیمەنی مەرگ

ئەوە سوو (ڕیبا) خۆرە. ئەو ئینسانە باڵا بەرزە کە لەناو باغەکەدا دیمان، ئەوە حەزرەتی ئیبراهیم علیە سلام بوو، ئەو منداڵانەش کە دەوریان دابوو ئەوە هەموو ئەو منداڵە مووسڵمانانەن کە بە بچووکی مردوون. ئەوانەی نیوەی بەدەنیان جوان و نیوەی بەدەنیان ناشیرین بوو ئەوە ئەو کەسانەن کە لەگەڵ کردەوەی چاك خەراپەیشیان بووە. بەڵام وەبەر ڕەحمەتی خوا کەوتن ناشیرینیەکەیان نەما.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئینجا ئەو دوو ڕەفیقە خۆیان پێ ناساندم، یەکێکان گوتی: من جوبرەائیلم و ئەوی دیش میکائیلە. جا عولەمای دین دەفەرموون: ئەو حەدیسە پیرۆزە کە شێخی بوخاری و بەیهەقی ڕیوایەتیان کردووە بۆ ئیسپاتی عەزابی بەرزەخ وەك ((نەسی)) سەریح وایە، لەبەر ئەوەی خەونی پێغەمبەران وەك حەقیقەت وایە وەك ڕووداو حیسابی بۆ دەکرێ.

ئەوەش کە لە حەدیسەکەدا دەفەرمووێ: تا ڕۆژی قیامەت ئاوایان موعامەلە لەگەڵ دەکرێ، دەلیلی ئەوەیە کە ئەو هەموو ئەحواڵە عەلاقەی بە عالەمی بەرزەخەوە هەیە.

ئەو حەدیسەی کە لەو بابەتەوە بە حەزرەتی عەلی رضي الله عنه ڕیوایەت کراوەئەوەش دەڵێ: ئەوەی ئاگرەکەی خۆش دەکردو لە دەوری هەڵدەسوڕا ئەوە قەرەوڵی دۆزەخە. کاتێ پڕینچکێك لە ئاگرەکە دەپەری ئەو گورج دەی خاتەوە ناوی و ئەو بۆنە بەدەی لەژن و پیاوە ڕووتەکان دەهات، ئەوە بۆنی بەدی ئالەتیان بوو. ئەو سك زلانەش کە دیار بوون و ئاگر لە خوارەوەیان بەردەبوو لە دەمیانەوە دەهاتە دەر، ئەوە هەتیو باز بوون وەك قەومی لوت. ئەو جۆگایەش کە ئاوەکەی وەك شیری سپی بوو ئەوە ئاوی جۆگای حەوزی کەوسەر بوو. ((ابن عساکر)) ئەو حەدیسەی ڕیوایەت کردووە.

((ابن بیهقی ودلایل النبوه)) لە ئەبوو سەعدی خدریەوە ڕیوایەت دەکەن کە پێغەمبەر ﷺ بەلای سفرەیەکدا ڕۆیشت گۆشتی سوورکراوەی زۆر نایابی لەسەر بوو، بەڵام کەس نەبوو بیخوا، هەر لەو جێگایەش سفرەیەك ڕاخرابوو گۆشتی بۆگەنی لەسەر بوو کۆمەڵێك دەوریان دابوو، کاتێ پرسیاریان کرد ئەوانە کێن؟ گوتیان: ئەوانە ئەو کەسانەن کە حەرامیان لە حەڵاڵ باشتر بوو.

ئینجا حەزرەت ﷺ بە لای کۆمەڵێکی ورگ زلدا ڕۆیشت کە هەڵدەستان خۆیان ڕانە دەگرت‌و بەلادا دەهاتن زۆر بە حەسرەتەوە دەیان گوت: ئەی خوای گەورە ! قیامەت بەرپا مەکە. هەر دەگریان‌و هاواریان دەکرد. کەپرسیان، گوتیان: ئەوانە سوو خۆرن. بەلای گرووهێکدا ڕۆیشتن لێویان وەك لێوی وشتر وابوو، بەردیان دەخستە دەمیانەوەو لە پاشەوەیانڕا دەهاتە دەرێ، کەپرسیان ئەوانە کێن؟ گوتیان: ئەو کەسانەن کە ماڵی هەتیویان بە ناحەق خواردووە. بەلای کۆمەڵێکی تردا ڕەت بوون گۆشتیان لە هەردوو تەنیشتیان دەکردەوەو دەرخواردیان دەدانەوەو پێیان دەگوتن: ئەو گۆشتە بخۆن هەروەك گۆشتی براکان‌و دەخوارد. کاتێ پرسیان ئەوانە کێن؟ مەعلوم بوو کە غەیبەت کەرو عەیب جو بوون. ئەو ڕەفتارە تا ڕۆژی قیامەت دەوامیان لەسەر دەکا.

(( ابن عدی‌و بیهقی)) لە ئەبوو هوریرە رضي الله عنه ڕیوایەت دەکەن کە لە شەوی میعراجدا پێغەمبەر ﷺ بەلای کۆمەڵێکدا تێ پەری بەبەرد لە سەریان ڕادەکێشان. کاتێ سەریان چاك دەبوەوە دووبارە دەستیان دەکردەوە بە لێدانیان. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی جوبرائیل ئەوانە کێن؟ گوتی: ئەو کەسانەن کە سەرگەردان بوون لە نوێژاندا واتە موبالاتیان پێ نەدەکرد یان هەر نەیان دەکرد. لە پاشان چاوی بە تاقمێك کەوت ڕووت بوون تەنیا

ئالەتیان بە پارچەیەکی بچووك داپۆشرابوو. وەکو وشترو بزن خەریکی لەوەڕ بوون. پەلەداری دڕکاوی‌و بەردری گەرمیان دەخواردو، کاتێ پرسی ئەی ئەوانە کێن؟ ئاشکرا بوو کە ئەو کەسانەن کە خێرو زەکاتیان لە مالەکەیان جیانە دەکردەوە. ئنجا چاوی بە کۆمەڵێك پیاوو ئافرەت کەوت کە لە بەرامبەریان گۆشتی ناسکی سورەوەکراوو لە تەنیشتیان گۆشتێکی پیس دانرا بوو، هیچ موبالاتیان بە گۆشتە جوانە ناسکەکە نەدەکردو گۆشتە پیسەکەیان دەخوارد. کە پرسیاری کرد مەعلوم بوو کە پیاوەکان ئەو کەسانەن کە ژنی خۆیان بەڕەلاَّ دەکردو دەچوونە لای ئافرەتی خەراپ. و ئافرەتەکانیش ئەوانەن کە عەلاقەیان لەگەڵ پیاوی نامەحرەمدا پەیدا دەکرد. لەپاشان چاوی بە پیاوێك کەوت کۆمەڵە پشتێکی گەورەی درووست کردبوو نەی دەتوانی هەڵی گرێ، لەگەڵ ئەوەشدا هەر دەی خستە سەرو زیادی دەکرد، کاتێ پرسیاری کرد مەعلوم بوو کە ئەوە ئەو کەسەیە کە ئەمانەتی خەڵکی زۆر لا بووەو نەی داونەوە. لە پاشان حەزرەت ﷺ بە لای گروهێکدا ڕۆشت کە زمان‌و لێویان بە مەقاست دەبڕین‌و لە پاشان چاك دەبوونەو دووبارە دەیان بڕینەوە، چەند جار ئاوای دین، کاتێ پرسی گوتیان: ئەوە ئەو خەتیبە واعیزانەن کە ئاگری فیتنەو فەسادیان هەڵدەگیرساند.

((ابن خەزیمە و ابن حبان)) لەئەبوو ئومامەوە ڕیوایەت دەکەن کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من خەونێکم دی وە ڕاستە دەبێ زۆر باشی تێ بگەن. لە خەومدا پیاوێك هاتە لام دەستی گرتم‌و وەڕێکەوت لە ڕێگادا کێوێکی گەورەوە دیار کەوت گوتی: بچۆ سەر ئەو کێوە گوتم: چۆن بچمە سەر ئەو کێوە گەورە؟ گوتی: من بۆت ئاسان دەکەم کاتێ هەنگاوم هەڵێنایەوە چاوم بە پلیکانەیەك کەوت لە ژێر پێمدا بەوجۆرە پلە پلە سەرکەوتم، کاتێ چووینە

سەر کێوەکە هێشتا زۆر نەڕۆیشتبووین، چەند ژنو پیاومان دی دەمیان داقەڵشابوو، گوتم ئەوانە کێن؟ مەعلوم بوو کە ئەو کەسانەن گوفتارو کرداریان وەك یەك نەبووە. تۆزێکی کە ڕۆیشتین تووشی چەند ژنو پیاوێك بووین گویٚو چاویان بە گوڵو میخ داکوترابوو، کە پرسیم: گوتیان: ئەوانەن کە گوێیان بۆ خەراپەو چاویان بۆ قسەی ناشایست ڕاگرتووەو تەماشایان کردووە. کاتێ زیاتر چووینە پێشەوە زۆرمان ئافرەت دی سەرەو بن هەڵواسراو بوون مار مەمکی دەگەزین، کە دەربارەیان پرسیم: ئەو ژنانە بوون کە نەیان هێشتووە منداڵەکانیان شیری مەمکیان بخوا. بەولاوە تر ڕۆیشتین زۆر ژنو پیاو سەراو بن هەڵواسرابوون، قوڕو لیتەیان دەلستەوە، پرسیارم کرد گوتیان: ئەوانە ئەو ڕۆژوەوانانەن کە لەپێش بانگ دا ڕۆژوویان شکاندووە. تۆزێکی دی ڕۆیشتین تووشی سێ نەفەر بووین شەڕابی تەهوریان دەخواردەوەو لە خۆشیان گۆرانیان دگوتن، لە وەڵامی پرسیارمدا گوتیان: ئەو سێ کەسە زەیدی کوڕی حارسو جەعفەری تەییارو ((عبدالله)) ی کوڕی ڕەواحەن.

## وەزعی جۆراو جۆری خەڵك لە قەبردا

تەبەڕانیو ((نوادر الاصول)) و تەرغیب لە ((عبدالرحمان)) ی کوڕی سەمرەوە باسیان کردووە کە ڕۆژێك ڕەسولی ئەکرەم ﷺ هاتە لامانو فەرمووی: ئیمشەو لە خەومدا شتی عەجیبو غەریبم دی. پیاوێکم لە ئوممەتم دی فریشتەی مەرگ هاتبووە لای گیانی بکێشێ، ئەو خۆش ڕەفتاری یەی کە لەگەڵ باوكو دایکی بە خەرجی دابوو هاتە پێشەوەو فریشتەی مەرگی لێ دوور خستەوە. یەکێ تر لە ئوممەتم دی، عەزابی قەبر دەوری دابوو بەڵام دەست نوێژ هاتە پێشەوەو لە عەزابی قەبر نەجاتی دا.

## دیمەنی مەرگ

یەکێ ترم لە ئممەتم دی شەیتانان دەوریان دابوو، زکری خوا چووە پیشەوە و ڕزگاری کرد. یەکێ ترم لە ئوممەتم دی فریشتەی عەزاب لە دەوری کۆببوونەوە نوێژ چوو ڕزگاری کرد، یەکێ ترم چاو پێکەوت لە تینویان زمانی کێشابوو، دەچوو بۆ سەر هەر حەوزێك بە تینوەتیەوە دەیان گێڕاوە، بەلاّم ڕۆژووەکانی چوونە پێشەوەو تینوایەتیەکەیان لا برد.

یەکێ ترم لە ئوممەتم دی کاتێك لە حەڵقەی پێغەمبەرەکان نزیك دەبووە دەریان دەکرد، غوسڵی لەش پیسی هاتە پیشەوەو دەستی گرتو هێنای لە تەنیشت من دای نا. یەکێ ترم لە ئوممەتم دی لە هەر شەش لاوە تاریکی دەوری دابوو لە و تاریکی یەدا حەیرانو سەرگەردان دەگرا، حەجو عومرە هاتن ڕزگاریان کردو بەریان ڕووناك کردەوە. یەکێ ترم لە ئوممەتم دی کە دەی هەویست لەگەڵ موسڵمانانندا قسە بکا ڕوویان لێ وەردەگێڕا، سیلەی ڕەحم هاتە پێشەوەو گوتی، موسڵمانینە! لەگەڵی ڕو خۆش بن، جا زۆر بە ڕو خۆشی قسەیان لەگەڵ کرد. یەکێ دیکەم دی لەبەرامبەر تینو بڵێسەی ئاگر بەدەست دیفاعی لە ڕووی خۆی دەکرد، بۆ ئەوەی نەبادا بسوتێ، خێرو سەدەقەیەکی کە لە ژیانی دا کردبووی هاتو دیفاعی لەسەرو سوڕەتی کرد، یەکێ دیکەم لە ئومەتم دی، فریشتەی عەزاب هەر یەکەی ئەندامێکی بەدەستەوە گرتبوو، بەلاّم بانگ کردنو بلاّو کردنەوەی ئایین ئەویان لە دەست مەلائیکەی عەزاب هێنایە دەرو دایان بە فریشتەکانی ڕەحمەت.

یەکێ ترم لە ئوممەتم دی کە گوناهەکانی لینگە تەرازووی چەپیان قورس کردبوو، ترسی لە خوا هاتە پێشەوەو لینگە تەرازووی ڕاستی هێنایە خوارو ئەوی چەپی بەرز کردەوە. یەکێ ترم دی لینگە تەرازووی ڕاستی کردەوەی زۆر سووك بوو. دوو منداڵی مردووی چوونە پێشەوەو لینگە تەرازووی ڕاستیان بۆ قورس کرد. یەکێ دی لە ئوممەتم دی لە قەراغ جەهەننەم ڕاوەستابوو. ترسی لە خوای هاتو دوری خستەوە. یەکێ دی کەوتبوە ناو

ئاگرەوە، ئەو فرمێسکانەی کەلە بەر ڕەزای خوا هەڵی وەراندبوون هاتن و لە ئاگرەکەیان دەرهێنا،

یەکێ ترم لە ئوممەتەکەم چاو پێکەوت لەسەر پردی سیرات ڕاوەستابوو لە ترسان دەلەرزی، بڕوا بەخوای هات و لەرزینەکەی نەهێشت و لە پردی سیرات پەڕیەوە. یەکێ ترم دی لەسەر پردی سیرات، جاری وابوو لەسەر سەرو جاری واش بوو لەسەر ئەژنۆیان دەڕۆیشت، ئەو سەلاوەتانەی کە بۆ منی لە دنیادا دەنارد هاتن ڕاستیان کردەوەو بەسەر پردی سیراتدا پەڕیەوە. یەکێ ترم دی کاتێ گەیشتە بەردەرگای بەهەشت لەسەری داخرا، کەلیمەی شەهادەو ئیمان هاتن دەرگای بەهەشتیان بۆ کردەوەو چوە بەهەشتەوە. خەڵکێکی زۆرم دی لێویان دەبڕین و گوتم ئەوانە کێن؟ گوتیان: ئەوانە غەیبەت گۆن، ئینسانی زۆرم دی بە زمان هەڵواسرابوون گوتم: ئەوانە کێن؟ گوتیان: ئەوە ئەو ژن و پیاوانەن کە بە ناهەق خەڵکیان تاوان بار دەکرد.

لە کتێبی ((روض الریاحین)) دا بینا لەسەر ڕیوایەتی ئیمامی شافعی رحمە الله دەفەرمووێ بەعزێك لە پیاوە گەورەکان داوایان لە خوای گەورە کرد کە ئەحواڵی ئەهلی گۆڕستانیان نیشان بدات. جا بەو هۆیەوە گۆڕەکان شەق بوون، تەماشایان کرد بەعزێك لە مردووەکان لەسەر پارچەی ئاوریشم و هەندێك لەسەر حەریرو بەعزێ لەسەر دیباو، هەندێك لەسەر گوڵ و ڕێحانەو بەعزێك لەسەر تەختەوە خەوتوون، بەعزێکیان دەگرین و هەندێکیان پێدەکەنن. پیاو چاکان گوتیان: ئەی خوای گەورە! ئەگەر بت ویستایە دەت توانی یەك جۆریان ڕەفتار لەگەڵ بکەی، دەنگێك لە گۆڕێکەوە هات گوتی: ئەی فلان کەس! ئەو دەرەجە بەندی یە بەهۆی کردەوەی خۆیانەوەیە، ئەوانەی لەسەر ئاوریشم خەوتن ئەوکەسانەن خاوەن ڕەفتاری باش بوون، ئەوانەی لەسەر حەریرو دیباش نووستوون ئەوکەسانەن کە ڕۆژوویان گرتووەو، ئەوانەی لەسەر تەختە نووستوون ئەوانەن کە لەبەر خوا یەکتریان

خۆش ویستووە. ئەوانەی دەگرین ئەوە گوناهکار بوون‌و، ئەوانەی پێدەکەنن ئەوانەن کە تۆبەیان لە گوناه کردبوو.

لە کتێبی ((الروح)) دا ((ابن القیم)) فەرموویەتی: خۆ پاراستن لەو شتانەی کە دەبنە باعیسی عەزاب لازمەو گەورەترین وەسیلەی نەجات لە عەزابی قەبر ئەوەیە کە هەموو شەوێك لە پێش نووستندا موحاسەبەی نەفسی خۆت بکەی‌و بزانی ئاخۆ لە تەواوی ئەو ڕۆژەدا چ کارێکی خەراپی کردووە. ئینجا تۆبە لە گوناهەکانی بکاو بخەویّ. کاتیّ وەخەبەرهات ڕوو بکاتە چاکەو فرسەت لە دەست نەداو ئەگەر لە ژیانیدا کەم‌و کەسریەك بوو تۆڵەی بکاتەوە، کاتیّ خوای گەورە ویستی چاکە لەگەڵ یەکێکدا بکا تەوفیقی دەدا.

## چاو پێکەوتنی وەزعی پێنج قەبر بوو بە هۆی تەوبە کردنی گوناهکارێك

لە کتێبی حەدیسدا هاتووە کە لاوێکی غەمگین چوو بۆ لای ((عبدالملك))ی کوڕی مەڕوان. کاتێك عبدالملك لە غەمباری پرسی ئەو گەنجە مەحزوونە گوتی: بەهۆی گوناهی خۆمەوە غەمگینم: عبدالملك گوتی:خۆ گوناهی تۆ لە ئەرزو ئاسمان گەورەتر نیە؟ گوتی: لە ئەرزو ئاسمان گەورەترە. عبدالملك گوتی: خۆ لە عەرشی خوا گەورەتر نیە! گوتی: لەویش گەورەترە. عبدالملك گوتی: گوناهی تۆ گەورەترە یا ڕەحمەتی خوا. گەنجەکە کە ئەوەی بیست بێدەنگ بوو. جا عبدالملك پرسی گوناهەکەت چیە؟

گوتی: من کفن دز بووم. مردووی پێنج قەبر تۆبەیان بە من کرد. کاتیّ قەبری یەکەمم هەڵدایەوە تەماشام کرد مەلائیکەی عەزاب ڕووی مردووەکەیان لە قیبلە وەرگێڕابوو ئەزیەتیان دەدا، لە ترسان ڕام کرد، لە غەیبەوە بانگیان کردم گوتیان: بۆ لەو مردووە ناپرسی کە بەهۆی چیەوە تووشی ئەو عەزابە بووە؟ گوتم: ناتوانم ئەو پرسیارە بکەم. لە غەیبەوە گوتیان: ئەو کابرایە بە چاوی سووکەوە تەماشای نوێژی دەکرد، بۆیە ئەو عەزابە دەچێژیّ.

کاتێ گۆڕی دووەمم هەڵدایەوە، تەماشام کرد مردووەکە وەك بەراز زنجیر کرابوو، کە ئەوەم دی ترسام و لەرزیم. لە غەیبەوە بانگیان کردم بۆ هۆی ئەو عەزابە لەو مردووە ناپرسی_ گوتم: توانای ئەوەم نیە بە زمان بیڵێم. دەنگەکە گوتی: ئەوە شەراب خۆر بووەو ئەوەی خوا حەرامی کردبوو ئەو بە حەڵاڵی دەزانی.

کاتێ قەبری سێ یەمم هەڵدایەوە تەماشام کرد تەواوی بەدەنی مردووەکە بە بزماری ئاسن دا کوترابوو، زمانی لە پشتی ملیەوە هاتبووە دەرەوە ترسام و ویستم وەگەرێم لە غەیبەوە گوتیان: بۆ هۆی ئەو عەزابە لەو مردووە ناپرسی؟ گوتم: تاقەتم نیە. گوتی: ئەوە ماڵی خەڵکی بە ناهەق زەوت کردوەو غەسپی دەکرد. وەختێ قەبری چوارەمم هەڵکەندەوە تەماشام کرد مردووەکە لە ئاگردا دەسوتاو مەلائیکە لێیان دەداو هاواری دەکرد، ترسام ویستم رابکەم، لە غەیبەوە گوتیان: ئەوە بۆ هۆی عەزابی لێ ناپرسی؟ گوتم: توانای پرسیارم نیە. گوتی: درۆزن بوو سوێندی بە درۆی دەخواردن.

کاتێ قەبری پێنجەمم هەڵدایەوە تەماشام کرد مەلائیکە بەشێلاقی ئاسن لێیان دەداو هاواری دەکرد، ترسام و ویستم ڕاکەم، لە غەیبەوە گوتیان: بۆ هۆی ئەو عەزاب دانەی لێ ناپرسی.گوتم: ئاخر حەوسەڵەی ئەوەم نیە، دەنگەکە گوتی، ئەو پیاوە قومارکەر بوو. هەر چەند پێغەمبەریش ﷺ قوماری مەنع کردبوو مەنزور ئەوەیە کە عەزابی قەبر کە بەهۆی کاری ناشایستەوەیە کە بە دڵ و چاوو گوێ و سك و دەست و پێ و باقی ئەندامەکانمانەوە دەیان کەین. لە سەرکردنی کاری چاکیش بەو ئەندامانە پاداشتی کاری باش وەردەگرین.

## دەرسی دووازدە

## خۆ ئاشکراکردنی ئافرەتێك بۆ سزای گوناهێك

خواوەندی گەورە لە سوورەی ((ال عمران)) دا دەفەرمووێ: ﴿ وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ۝١٣٣ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ۝١٣٤ ﴾ آل عمران: ١٣٣ - ١٣٤ واتە پەلە بکەن بۆ لای لێ خۆش بوون لە لایەن خواوەو بۆ بەهەشتێ کە پانایی بە قەد ئەرزو ئاسمانەو بۆ پەرهێزکاران ئامادە کراوەو بۆ ئەوانەی پیاوەتی و خێر دەکەن، لە خۆشی و ناخۆشیداو ڕقی خۆیان دەخۆنەوەو لە خەڵك خۆش دەبن. خواش ئینسانی چاکە کەری خحۆش دەوێ.

زانایانی ئایینی کە نووسیویانە کە بەعزە خەڵکێك لەبەر ئەوە حەسوودیان بە بەنی ئیسرائیلیەکان دەبرد، کە کاتێ یەکێ لە ئەوان گوناهێکی دەکرد لەبەر دەرگاکەی لەبارەی جۆری گوناهەکەی و کەفارەتەکەی دەی نووسی و ئیعتیرافی دەکردو بۆ ئەوەی کەفارەتەکەی بدا خۆی تەسلیم بە دەوڵەت دەکرد. جا حەسوودیان پێ وە دەبرد چونکە دەیان زانی کەفارەتەکەیدا، گوناهەکەی لەسەر لا دەچێ و سزای ئەو گوناهە لە قیامەتدا لە سزای دنیا سەختترە. نەك هەر پیاو، بەڵکو ژنانیش عەقیدەیان بوو. جارێك ئافرەتێك کە زینای کردبوو هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گوتی: زینام کردووە، بۆ ئەوەی عەیبەی ئەو گوناهە لەسەر خۆی لا با، خۆی تەسلیم کرد بە سەنگبارانی بکەن. بۆچی وای کرد؟ چونکە سزای دنیای بەلاوە سووك تربوو لە سزای دووا ڕۆژ.

## باسی فائیدەی سەدەقەی جاریەو دۆعای ئەولاد

لە میشکاتی شەریفدا لە ئەبوو هوریرەوە ﵁ ریوایەت دەکا کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کە ئینسان مرد سەوابی تەواو دەبێ، بەلآم سێ شت لەدوای مردنیش سەوابیان هەیە فەرمووی: یەکەمیان سەدەقەی جاری یەیە. دووەمیان عیلمە، کە خەڵك سوودی لێ بکا. سێ یەمیان دووعای ئەولادی ساڵحە کە لەدوای مردن دوعایی بۆ بکەن. چەند لووتفێکی گەورەیە کە خوای گەورە لەگەڵ بەندەکاندا کردوویەتی. ئەگەر یەکێك بی هەوێ کە لە دوای مردنیشی کاتێ هەڵی کردنی کردەوەی چاکی لەدەست دەچێ‌و بێ کاری دەمێنێتەوە لەگۆڕدا بە ئاسوودەیی بخەوێ‌و خێری هەر بۆ بنوسرێ، ئەوە خوای گەورە گەورەترین ڕێگای نیشان داوەو، پێغەمبەر ﷺ زۆر تاکید لەسەر سێ شت فەرمووە. یەکیان سەدەقەی جاری یە واتە شتێك بکەی بەخێر کە فائیدەکەی دەوامی هەبێ وەك مزگەوت پردو وەقف‌و بیراوێك‌و باغێك‌و ئەو جۆرە شتانە.

لە فەرمایشتێکی تردا دەفەرمووێ: لەو شتانەی کە لەدوای مەرگ دەبنە هۆی سەواب عیلمێکە بەخەڵکت گوتووە. دووەم ئەولادی ساڵحە کە لەپاشت بەجێ بمێنێ سێیەم قورئانە. چوارەم مزگەوت‌و خانووێکە کە وەقفت کردبن. پێنجەم بیراوو ئاوێکە پەیدات کردبێ. شەشەم خێرێکە کە لە حاڵی حەیاتدا کردبێت‌و لەپاشت بەجی مابێ ئەوە سەوابەکەت هەر پێ دەگا. مەبەست لەوەی کە دەڵێن: سەوابەکەی هەر پێ دەگا ئەوەیە کە شتێکی بەناوی سەدەقەی جاریە لە ڕێگەی خوادا دا بێ، واتە بۆ سوودی خەڵك وەقفی کردبێ‌و مەبەست لە عیلمیش ئەوەیە مەدرەسەیەکی دروست کردبێ، یان یارمەتی دانی دروست کردنی دابێ، یان قورئان‌و کتێبی دینی وەقف کردبێ، یا دەرسی یەخەڵك گوتبێ ئەوە سەوابی عیلمی هەرهەیە. لە

## دیمەنی مەرگ

فەرمایشتێکی دی دا فەرموویەتی: حەوت شت لەپاش مەرگیش خێریان بۆ مردووەکە هەر دەگا. زانیاری یەك بەخەڵکی گوتبێ، جۆگە ئاوێکی هێنابێتەوە بیرێکی هەڵکەندبێ بۆ ئاو، نەمامێکی ناشتبێ، مزگەوتی دروست کردبێ، قورئانی لە پاش بەجێ مابێ، یان ئەولادی ساڵحی لەدوا بەجێ مابێ. ئەگەر شەریکیش بووبێ لەو کارانەدا بەشە هەر سەوابی پێ دەگا.

ئەو کەسە خۆش بەختە کە بەشی لە بلاوکردنەوەی ئاییندایەو بۆ مانەوەی دین هەوڵ دەدا، چونکە ژیانی دنیا لە خەوێك زیاتر نیە. کەس نازانێ کەی مەجبوور دەبێ ئەو دنیایە بەجی بێڵێ. جا تا کاری چاك زیاتر بکاو بە یادگار لەپاش خۆی بەجێیان بێڵێ باشترە، دۆستو خزمەکانی هەر دوو سێ ڕۆژ بۆی دەگرین، لە پاشان خەریکی کاری ڕۆژانەی خۆیان دەبنو ئەو فەرامۆش دەکەن شتی چاك ئەوەیە پیاو بی باتە ئەو ((بانك))ە وە کە قەت لە بەین ناچێ و سەرمایەکە هەر دەمێنێتەوەو تا ڕۆژی قیامەتیش بەهرەی هەر پێت دەگا.

لە کتێبی ((روض)) دا دەفەرمووێ ئافرەتێك ناوی ((باهینە)) بوو ، زۆر عیبادەت گوزاربوو، لەکاتی سەرەمەرگدا سەری بەرزکردەوەو گوتی: ئەی ئەو زاتەی کە تیۆشوو زەخیرەی منیو لەکاتی ژیانو مەرگدا پشتو پەنامی! لەکاتی مەرگدا ڕیسوام مەکەو لە قەبردا وەحشەت زەدەم مەکە. کە وەفاتی کرد کوڕەکەی هەموو ڕۆژی جومعە دەچوە سەر قەبرەکەیو قورئانی دەخوێندو سەوابەکەی هەدیە دەکرد بۆ دایکیو بۆ باقی مردووەکان دۆعای دەکرد، شەوێك لەخەویدا چاوی بەدیکی کەوتو لێی پرسی دایە گیان! حاڵت چۆنە، گوتی: عەزابی قەبر زۆر ناخۆشە، بەلام لە سایەی خواوە من زۆر ڕاحەتم، جێگای نووستنم لە گوڵو ڕێحان درووست کراوە، سەرینو پشتەماڵی ئاوریشمی لەسەرە، تا ڕۆژی قیامەت ئاوا دەبم کوڕەکە گوتی:

دایـە بفـەرموو بزانـە مـن دەتـوانم چ خزمـەتێکت پـیٚ بکـەم؟ گـوتی: ئـەوە کـە هـەموو ڕۆژی جومعـە دێـی و قورئـان دەخـوێنی تـەرکی مەکە، چونکە کە تۆ دێـیٚ هـەموو قەبستانەکە خۆشـحالٚ دەبـن و مـژدەم دەدەنـیٚ دەڵـێن:کوڕەکـەت هات، منیش بە هاتنی تۆ زۆر پیٚ خۆشحالٚ دەبم و ئەوانیش زۆر خۆش حالٚ دەبن.

کوڕەکە دەڵیٚ: هەروەها جومعەیەك دەچوومە سەر قەبری دایکم، شـەوێك لـە خەومدا کۆمەڵێکی گـەورە ژن و پیـاو هـاتن بـۆ لام، پرسـیم ئێـوە کێن و بۆچی هـاتوون؟ گـوتیـان: ئێمـە خـەڵکی فلاٚن قەبرستانین هـاتووین سوپاسـگوزاریت بکـەین، کـە هـەموو جومعەیـەك دێـی و دۆعـای بـەخێرمان بـۆ دەکـەی، ئێمـە بەوکارەی تۆ زۆر پیٚ خۆشحالٚ دەبین، تکایە ئیدامـەی پـیٚ بدە کوڕەکـە دەڵیٚ: لە پاشان زیاترم موبالات بە چوونە سەرقەبران دەکرد.

یەکیٚ تر لە عولەمای دین دەڵیٚ: پیاوێك لە خەویدا تەماشای کرد لە ناکاوێك هەموو قەبری گۆڕستانێك شەق بوون و مردووەکـان هاتنـە دەرەوەو دەسـتیان کرد بە شت چنینەوە، بەلاٚم یـەکێك بێکـار دانیـشتووەو هـیچ هەڵناگرێتـەوە، دەڵیٚ چوومە پێشەوەو سەلامم کردو وەلاٚمی دامەوەو پرسیم: ئەوە ئەوانـە چ هەڵدەگرنـەوە؟ گـوتی: ئـەوە بەرەکـەتی ئـەو دۆعایانـە هەڵدەگرنـەوە کـە خـەڵك هەدیـەی ئـەهلی ئـەو قەبـستانەی دەکـەن. گـوتم: ئـەی تـۆ بـۆ هەڵناگریـەوە؟ گوتی: من ئیحتیاجم بە دۆعای ئەو خەڵکە نیە، چونکە کوڕێکم هەیە لـە فلان بازاردا((زولوبیا)) دەفرۆشیٚ، ڕۆژی جارێك قورئان دەخوێنیٚ سـەوابەکەی بە مـن دەبەخـشیٚ. دەڵـیٚ بـەیانی هەسـتام چـووم بـۆ بازارەکـە کـوڕێکی گـەنج ((زلۆبیای))ی دەفرۆشت، بەلاٚم لێوی هەر دەجولا ، پرسیم ئەوە چ دەخوێنی؟ گـوتی: ڕۆژی جارێـك قورئـان دەخـوێنم و سـەوابەکەی بـە بـاوکم دەبەخـشم. دەڵـیٚ: لـە پاشـان جارێکی دی ئـەهلی ئـەو قەبرسـتانەم دی شـتیان لـە زەوی دەچنیەوە، ئەوجارە کابرای پێشوم دی لەگەڵ خەڵکەکە شتی دەچنیەوە لـەو

کاتـەدا فـەوری وەخەبـەر هـاتم: زۆرم لا عـەجایب بـوو، بـەیانی کەهەسـتام چوومەوە بازارەکە کە پرسیارم کرد کوڕەکە مردووە.

## دیمەنی مەرگ

سـاڵحی مـەری ﷺ دەفـەرمووێ: جارێـك شـەوی جومعـە لـە دوای نیـوە شـەو دەچوومە مزگەوتی جامیعە بۆ نوێژی بەیانی، هێشتا دنیا هەر تاریك بوو، ڕۆژ نـەببوەوە، لەسـەر قەبرسـتانێکی گـەورە بـوو، دەبـوو هـەر بەوێـدا بـڕۆم. لـەوێ لـە نزیـك قـەبرێك دانیـشتمو خـەوم لێ کـەوت. لـە خەوەکەمـدا تـەواوی مردووەکـان قەبرەکـەیان شـەق بـوور هاتنـە دەرەوە زۆر بـە خۆشـحاڵی یـەوە دەستیان کرد بە قسان، لە ناو قەبرێکدا گەنجێك لیباسی زۆر کەسیفی لەبەر دابوو، زۆر بە غەمگینی چوو لە گۆشەیەك دانیشت، لە پاش ماوەیەکی کەم فریشتەی زۆر لە ئاسمانەوە هاتنە سەر زەوی، خوانی سەر داپۆشراو بەسـەر پۆشـی نوورانیـان لەسـەر دەسـت بـوو، دەیـان دان بـە مردووەکـانو هـەر مردوویـەی خـوانێکی وەردەگـرتو دەچـوەوە نـاو قەبرەکەیـەوە. کـاتێ هـەر کەسـە خـوانی خـۆی وەرگـرت، ئـەو کـوڕە خـەریك بـوو بـە دەسـتی بەتاڵـەوە بگەڕێتـەوە، لـێم پرسـی چ خەبـەرە؟ بـۆ ئەوەنـدە غـەمگینی. ئەوانـە چ جـۆرە خـوانو سـفرەیەك بـوون؟ گـوتی: ئـەو خـوانو مەجومعانـە پـڕ بـوون لـەو دیاریانەی کە زیندوەکان بـۆ مـردووی خۆیـان ناردوون، من لە دنیادا کەسم نیـە تـا سـفرەی وام بـۆ بنێـرێ، دایکـێکم هەیـە زۆر گرفتـاری کـاری دنیایـە، دووبارە مێردی کردۆتـەوە، لەبەر کاری مێردەکـەی ئاگای لـەمن نەماوە، ناو نیشانی دایکیم لێ وەرگرتو بەیانی ڕۆژی دوایی چوومە ماڵیـانو لـەو دیوی پەردەوە بانگم کردو خەونەکەم بۆ گێرایەوەو لـەبارەی کوڕەکەیـەوە پرسیارم لێ کرد، گوتی: لـەوەدا شـك نیـە کـە ئـەوە کـوڕی منـەو جگـەرم بـوو، باوەشـم جێگای خەوی بوو، لە پاشان ژنەکە هەزار درەمـی دامـێ و گـوتی: ئەو پارە بە خێری کوڕە نووری چاوەکەم بکە بە خێرو سـەدەقەو لـەو ڕۆژە بە دواوە هەمیـشە دۆعـای بـە خێـری بـۆ دەکـەمو فەرامۆشـی ناکـەم. دەفـەرمووێ :

جارێکی دی لە خەومدا چاوم بە کۆمەڵە مردووەکە کەوتەوە کوڕەکەم دی لیباسێکی بەنرخی لەبەردابوو، بەغاردان هاتە لام و گوتی: ئەی ساڵحی مەری خوای گەورە جەزای بە خێرت بداتەوە، دیاریەکەتم پێ گەیشت.

هەزاران هەزار لەوجۆرە بەسەرهاتەنە لە کتێبی دینیدا هەیە. جا ئەو کەسەی دەی هەوی کە ئەولادەکانی لە پاش مردنی بەکاری بێن، دەبێ تا دەتوانێ باشیان بار بێنێ، چونکە پەروەردەی ئەولاد نەك هەر سوودی بۆ ئەولادەکە هەیە، بەڵکو سوودی بۆ خۆشت هەی هەروەك خەوای گەورە لە سووڕەی ((تحـــــريم))، دەفرمـــــووێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا ٦ ﴾ التحريم: ٦ ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە خۆتان و ماڵ و منداڵتان لە ئاگر بپارێزن. زەیدی کوڕی ئەسلم ﷺ دەفەرمووی: کاتێ حەزرەت ﷺ ئەو ئایەتەی خوێندەوەو ئەسحاب عەرزیان کرد ئەی ڕەسولی خوا! ﷺ چۆن ئەهل و عەیالمان لە ئاگری جەهەننەم بپارێزین؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو کارانەیان نیشان بدەن کە خوا لێیان ڕازی بێ و لەو کارانەیان مەنع بکەن کە خوا پێی ناخۆشن. لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا لە حەزرەتی عەلی یەوە ﷺ نەقڵ دەکەن کە فەرموویەتی: مەعنای وایە کە خۆتان و ئەهل و عەیالتان هەمیشە خەریکی کاری خێر بن و خۆتان لە خەراپە بپارێزن.

لە ((درالمنثور)) دا دەفەرمووێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوای تەعالا ڕەحم بە باوکێك بکا کە یارمەتی ڕەفتاری چاکی ئەولادەکانی نادا ئەگەر ئەولاد چاك بار نەهێنن لەگەڵ باوك و دایکیان خەراپیش بن هەقی خۆیەتی.

لە حەدیسدا هاتووە کە دەبێ ڕۆژی حەوتی دوای لە دایك بوونی منداڵ مووی سەری بتاشن و حەیوانێك سەر ببڕن و ناوی لێ بنێن. کە پێی نایە

شەش سالییەوە ئادابی کۆمەلایەتی فێر کەن و لە نۆ سالیدا جێگای بۆ جیاوەکەن و لە تەمەنی سێزدە سالیدا لەسەر نوێژ نەکردن لێی بدەن و لە شازدە سالیدا ژنی بۆ بێنن و لە پاشان باوکی دەستی بگریٚ و بلیٚ: ئادابی کۆمەلایەتیم فێرکردی، دینم فێرکردی، ژنم بۆ هێنای، بەلام ئێستا لە دنیادا لە فیتنەی تۆو لە قیامەتا لە عەزابێك کە لە بەر تۆ تووشم بیٚ پەنا دەبەمە بەر خوا. مەبەست لە عەزابێك کە بەهۆی ئەولادەوە تووشی باوك دەبیٚ ئەوەیە کە

لە زۆر حەدیسدا بە جیا جیا ئەو فەرمانەی پێغەمبەر ﷺ هاتووە کە ئەو کەسەی رێگای خەراپ دەگریٚ نەك هەر لەبەر ئەو کارە خراپە کە دەی کا گوناه بار دەبیٚ، بەلکو گوناهی ئەوکەسانەش کە چاو لەوی دەکەن هەر لە ئەستۆی ئەوە، بە جۆرێك کە هیچیش لە گوناهی گوناهکارەکان کەم نابێتەوە، ئەوانیش وەك ئەو کەسە سزا دەدرێن کە ئەوان چاویان لیٚ کردووە. جا بەگوێرەی ئەوە هەر کردەوەیەکی بەدو خەراپ کە ئەولاد بە چاولێکەری باوك بیکا گوناهی لە ئەستۆی باوکیەتی. جا لەبەر ئەوە دەبیٚ گەورەکان لەپێش چاوی بچووکەکان خۆیان لە حەرەکاتی ناشایستەوە بپارێزن. لەو حەدیسە شەریفەدا هاتووە کە ئەگەر مندال تەمەنی بوو بە سێزدە سال ئەگەر نوێژی نەکرد لێی بدریٚ.

لە بەعزە حەدیسێکی دی دا هاتووە کە تەمەنی بوو بە حەوت سال فێری نوێژی بکەن، کە بوو بە دەسال ئەگەر نەی کرد لێی بدەن، ئەو جۆرە ریوایەتانە لەبەر ئەوەی راستو زۆر باوەر پێکراون، خولاسە ئەگەر باوکێك لەسەر نوێژ نەکردن لە کورەکەی نەدا بە گوناهبار حیسابە، تا تەمەنی دەبێتە پازدە سالی، بەلام بە پێچەوانە ئەگەر کورەکەی پابەندی نوێژو رۆژوو ئەحکامی دینی بکا بەشێکی لە سەوابی کردەوەی چاکی کورەکەی پیٚ دەگا. لەوەش زیاتر ئەگەر ئەو کورە پیاوێکی سالحی لیٚ دەرچیٚ دۆعای

بەخێر بۆ دایكو باوكی دەكاو دەبێتە هۆی سەوابو گەیاندنی زۆر بە باوكو دایكەكەی.

((ابن مالك)) رضي الله عنه دەفەرمووێ: لە حەدیسەكە بۆیە فەرمووی: ئەولادی سالح چونكە ئەولادی نا سالح نابێتە هۆی سەواب گەیامدن بە دایكو باوك. زانایان گوتویانە: سەوابی كردەوەی چاكی ئەولادی سالح یە دایكو باوك هەر دەكا با ئەو ئەولادە دۆعاشیان بۆ نەكا. هەروەك چۆن ئەگەر یەكێك بۆ سوودی گشتی دارێكی خاوەن بەر بنێژێ و خەڵك میوەكەی بخۆن دۆعای بۆ بكەن یا دۆعای بۆ نەكەن سەوابی پێ دەگا ئەویش ئاوایە.

عەللامەی مونادی رحمة الله علیە دەفەرمووێ: لەبەر دڵ نیایی گوتراوە ئەولاد دۆعای بەخێر بۆ دایكو باوكیان بكەن، ئەگینا هەر كەسێك دۆعا بۆ هەركەسێك بكا فائیدەی هەیە، كوڕ بێ یا نا، لە حەدیسەكەدا بەتایبەتی ئیشارە بۆ سێ شت كراوە بە عەلاوەی ئەو سێ شتە لەچەند حەدیسی جیا جیاشدا ئیشارە بۆ چەند شتی تریش كراوە كە سەوابەكەیان دایمی یە.

لە زۆر حەدیسدا دەفەرمووێ: ئەوەی كارێكی چاك ئەنجام دەدا وە نەبێ هەر تەنیا لە موقابیل ئەو كارە خێرەدا پاداشتی پێ بگا. بەڵكو بەشێكی لە سەوابی كردەوەی ئەو كەسانەش پێ دەگا كە پەیڕەوی لەو دەكەن بێ ئەوەی لە بەشە سەوابی ئەوان هیچ كەم وەبێ. وە ئەو كەسەی كردەوەیەكی خەراپ دەكا نەك هەر لەبەر كردەوە خەراپەكە بە گوناهكار لە قەڵەم دەدرێ، بەڵكو گوناهی تەواوی ئەو كەسانەش كە چاو لەوی دەكەن دەچێتە ئەستۆی ئەو. بەلاٚم هیچیش لە سزای گوناهی ئەوان كەم نابێتەوە. هەروەها لە حەدیسێكی تردا هاتووە كە سەوابی كردەوەی هەموو كەس لە دوای مردنی تەواو دەبێ، بەلاٚم ئەوەی بەرگری لە خاكی ولاٚت دەكا دوای مردنیش خێری هەر پێ دەگا.

## دیمەنی مەرگ

### تەواو بوونی کردەوە بەهۆی مەرگەوە

ئەبوو سەعیدی موعەللا رحمة الله علیه دەفەرمووێ: لەپاش مەرگ دەفتەری ئەعمال دەبەسترێو ئەوەی دەمرێ نە دەتوانێ کارێکی چاك ئەنجام بدا ، نە وەلآمی سەلام بداتەوە، واتە مردوو تاقەتی ئەوەی نیە سەلام لە کەس بکا تا ئەجرو سەوابی دەست کەوێ تەنیا دەتوانێ وەلآمی سەلامی ئەو کەسانە بداتەوە کە دەڵێن: ((السلام علیکم یا اهل القبور)). دەڵێن لە زۆر حەدیسی صەحیحدا ئیشارە بەوە کراوە.

موترفی کوڕی شوخیر دەفەرمووێ: شەوی جومعە بە مەیدانێکدا ڕۆیشتم کە شەوانی تریش هە ر پێیدا دەڕۆیشتم ، لەو مەیدانەدا خەڵکێکی ڕووتم دی سەلامم لێ کردن کەچی وەلآمیان نەدامەوە. لەوێ ڕاوەستام گوێم لێ بوو بە یوکتریان دەگوت: ئەوە موترفی کوڕی شوخەیرە، گوتم: زۆرم لا عەجایبە کە ئێوە ناوی خۆمو باوکم دەزانن کەچی جوابی سەلامەکەتان نەدایەوە، گوتیان: ئێمە مردووین دەفتەری عەمەلی خێری ئێمە بەستراوە، ئەگەر بمان توانیایە وەلآمی سەلامی تۆمان بدایەوە بە دنیامان نەدەگۆڕیەوە، گوتم: ئەی هۆی چیە هەموتان ڕووتن؟ گوتیان: کفنەکانمان دڕاونو هیچمان نیە عەورەتی خۆمانی پێ داپۆشین.

گوتم: ئەی بۆچی هەمووتان لێرە کۆبوونەوە؟ گوتیان: لەبەر ئەوەی هەر قەبری حەفتا مردووی وەبەر کەوتووەو زۆر زۆر بوین ناچار بووین لە جێگایەك کۆوە بین، گوتم: ئەی بە هۆی ئەوەوە کە ئافرەتیش بە ڕووتی لەگەڵ ئێوە کۆبوونەوەو یەکتر دەبینن خەجاڵەتی ناکێشن؟ گوتیان: ئەی موتریف تاڵیو سەکەڕاتی مەرگ عەقڵی لێ ستاندووینەوە لەبەر ئەوە نە پیاو دەزانێ کە پیاوە، نە ئافرەت دەزانێ کە ئافرەتە.

گوتم: ئەی هۆی چیە کە هەر ئیمشەوە ئێوەم دی، خۆ شەوەکانی دی کەسی لێ نەبوو؟ گوتیان: ئاخر ئیمشەو جومعەیەو لە شەوی جومعەدا دێینە

دەرێ، تا بزانین داخۆ کوڕو خانەوادەی ئێمە، ئێمەیان لەبیرە یان نا؟داخۆ بۆ ئەوەی سەوابمان پێ بگا خێرمان بۆ دەکەن یان نا؟ کاتێ ویستم بڕۆم گوتیان: ئەی موترف! سەبر بکە دەمان هەوێ شتێکت پێ بڵێین: تکات لێ دەکەین لە ڕۆژی جومعەدا ئامۆژگاری خەڵك بکەو پێیان بڵێ: کە کفنەکەمان ڕزیوەو بەدەنمان لێك ترازاوەو ئێسقانەکانمان ورد بوون، لە کاتێکدا ئێوە، ئێمەتان لە بیر چۆتەوە، جا لەبەر ئەوەی ڕەحم بە حاڵی ئێمە بکەن ژیانتان بە فرسەت بزانن، چونکە ئێمە زۆر پەشیمانین کە لە کاتی خۆیدا کردەوەی چاکمان نەکرد.

خولاسەی کەلام سەوابی خێرو سەدەقە بە مردووان دەگا چاوەڕوانی ئەوەن کە یەکێك لە خۆشەویستانیان سەوابێکیان بۆ بنێرێ. لەو ڕوون کردنەوەشدا ئەوە زاندرا کە بە گوزەشتی زەمان تاڵی مەرگ لە بەین ناچێ و بەدەن ڕوحی هەموو کەس وابەستە بە خۆیەتی و دیارە ئەو بەدەنە، بەدەنی بەرزەخی پێ دەڵێن و لەگەڵ بەدەنی دنیایی فەرقی هەیە.

مردووان زۆریان پێ ناخۆشە کە زیندوو خەریکی کاری دنیا دەبن دەڵێن: ئێمە ناتوانین وەڵامی سەڵام بەدەینەوە. لە حەدیسدا هاتووە کە مردوو جوابی سەلام دەدەنەوەو ئەوەی بچێتە زیارەتیان دەی ناسن. گوایە ناتوانن وەك عیباد جوابی سەلام بدەنەوەو ئەجر و سەوابیان دەست کەوێ، بەڵکو هەر بۆ ئاشکرا کردنی خۆشەویستی جوابی سەلام دەدەنەوە، بەڵام کە جوابی سەلامی موترەف یان نەدایەوە لەبەر ئەوەبو کە ڕەنج و حەسرەتی ئاشکرا بکەن.

بە عەقیدەی بەعزێك لە عولەمای دینی مەبەستیان لەوە کە گوتیان: ناتوانیین وەڵامی سەلام بدەینەوە ئەوە بوو کە ئەو جوابی وەڵامی سەلام دانەوە کە خەڵك گوێی لێ بێ ناتوانین و ئەوەندە لەسەر خۆ جوابی سەلام دەدەینەوە زیارەت کەر گوێی لێ نابێ.

## دیمەنی مەرگ

حەزرەتی ئەمیر رحمة الله علیة دەفەرمووێ: تەمەنی باقی بەندەی ئینسانی موسڵمان هیچ نیە ئەگەر خێری تێدا نەکا، چونکە ئەگەر دنیاو هەرچی لە دنیا دایە هی ئەو بێ لە ڕۆژی قیامەتا گوناهێکی لەسەر لانابا، بەڵام ئەگەر یەك سەعات لە ژیانیدا تۆبە بکاو پەشێمانی وەبێ دەتوانێ گوناهی چەند ساڵەی تەمەنی لەبەین بەرێ

## دەرسی سێزدە

عەلیمی کەندی رحمة الله علیة دەفەرمووێ: ڕۆژێك لەگەڵ ئەبوو عەبەسی غەففاری لەسەر بان ڕاوەستابووین، کاتێ ئەو خەڵکەی دی کە لە ترسی ((وەبا)) شاریان وەجی هێشتو گوتی: ئەی ((وەبا)) من بەرە بۆ لای خۆت، ئەو جوملەی سێ جار گوتەوە، کە گوێم لەو قسەیەی بوو گوتم: نەت بیستووە کە پێغەمبەر ﷺ دەی فەرموو: نابێ کەس ئارەزووی مردن بکا؟ چونکە زنجیرەی کردەوەی ئینسان دەپچڕێو فرسەتی ئەوەی لە دەست دەڕوا کە تۆبە بکەیتو ڕەزای خوا وەدەست بێنی؟

گوتی: من لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە فەرمووی:لە پێش ئەوەدا ئەو شەش ڕوودواە ڕووبدەن، بۆلای مەرگ پێش دەستی بکەن، یەکەم تا حکومەت وەدەست ئەحمەقان نەکەوتووە. دووەم تا بێ عەقڵ زۆر نەبوون. سێیەم تا دەستوورو قەزاوەت نەکراون بە پارە. چوارەم تا پیاو کوشتن نەبۆتە عادەت. پێنجەم تا تەرکی سیلەی ڕەحم نەکراوە. شەشەم تا قورئان خوێندن وەك گۆرانی گوتنی لێ نەهاتووە.

((ابن ابی االدنیا)) دەفەرمووێ: حەزرەتی حەسەن رضي الله عنه دەفەرمووێ: ئیزڕائیل ڕۆژێ سێ جار لە هەموو ماڵێك دەدا تا بزانێ ڕزقی کامیان تەواو بووەو تەمەنی چ کەسێ کۆتایی هاتووە. رزقی هەر کەسێك تەواو بووبێ گیانی دەکێشی. لەوکاتەدا کە لە پاش مەرگی بۆی دەگرین ئیزڕائیل لەبەر دەرگای ماڵەکەیان ڕادەوەستێو دەڵێ: من خەتام نیە، چونکە وام دەستوور پێ درابوو، بەخوا من نە ڕزقی ئەوم خواردووە، نە لە تەمەنی ئەوم کەم کردۆتەوە، من هەمیشە سەر لەماڵی ئێوە دەدەم تا کەستان نامێنێ.

حەزرەتی حەسەن رحمة الله علیة فەرمووی: ئەگەر دانیشتووانی ماڵی مردووەکە ئیزڕائیل ببینن و گوێیان لە قسەکانی بێ، مردووەکەیان لە بیر دەچێتەوەو بۆ خۆیان دەگرین*.

## زەمانی زوو ئیزڕائیل خۆی ئاشکرا دەکرد

((مروزی و ابن ابی الدنیا)) لە ئەبوو ((الشعشا)) جابیری کوڕی زەیدەوە ڕیوایەت دەکەن کە لە زەمانی زوودا ئیزڕائیل بەبێ زەحمەت گیانی خەڵکی دەکێشا. کاتێ خەڵك دەستی کرد بەخەراپەو قسەی بێ جێ. لە خزمەت خوادا شکایەتی کرد.

بەهۆی شکایەتی ئیزڕائیلەوە، خوا ئەو هەموو جۆرە نەخۆشیانەی نارد تا کەس بە ئیزڕائیل نەڵێ. جا ئەوەیە کە ئێستا باسی ئیزڕائیل ناکەن و خەتای نەخۆشی و دەردو بەلاٚ دەگرن، مەبەست ئەوەیە کە بە عەلاوەی چەند کەسێکی تایبەتی، خەڵك پێێ وایە کە نەخۆشی هۆی مردنە.

ئیمامی ئەحمەدو بەززاو حاکم لە ئەبوو هورەیرەوە ﵁ ڕیوایەتیان کردووە

کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لەکاتی گیان کێشاندا ئیزڕائیل بەئاشکرا دەچوو بۆ لای ئەو کەسە کە گیانی دەکێشا، کاتێ چوو بۆ لای حەزرەتی موسا علیه سلام گیانی بکێشێ حەزرەتی مووسا ناڕازی بوو کە بە ئاشکرا خۆی نیشانی خەڵك دەدا. ئیزڕائیل لە خزمەت خوا شکایەتی کرد، کە بەندەی تۆ مووسا بەو نەوعە گیان کێشانە نا ڕازی یە، خوای تەعالا فەرمووی: بچۆ بۆ لای ئەو بەندەی من و لە زمان منەوە پێی بڵێ: کە دەستی لەسەر پشتی گایەك دابنێ و چەند تاڵ مووی وەبن دەستی کەوتن ئەوەندە ساڵەی لە عومری زیاد دەکەم. کاتێ ئیزڕائیل ئەو پەیامەی خوای بە

حەزرەتی مووسا ڕاگەیاند حەزرەتی مووسا فەرمووی: جا ئەگەر قەرار بێ لە دوایش مەرگ هەربێ بۆ ئیستا نەبێ؟ جا ئیزرائیل سێوێکی دا بە حەزرەتی مووسا بە بۆنیەوە کردو گیانی کێشا. لە پاشان خوای تەعالا بڕیاری دا کە ئیزرائیل بە نهێنی بێ گیانی خەڵك بکێشێ.

## بێ دڵ کردنی دایك و باوكو پیاو کوشتنو قسە گوتن بە حەزرەتی ئەبووبەکرو عومەر هۆی عاقیبەت خەرا پییە

بەیهەقی و تەبەڕانی لە ((عبدالالە)) کوڕی ئەبی ئەفاوە ڕیوایەت دەکەن کە پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و عەرزی کرد ئەی ڕسولی خوا! کوڕێك لە حاڵەتی گیان کێشان دایە هەر چەند دەکەین شادەی بۆ نایە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە ژیانیدا شادەی هێناوە؟ گوتیان بەڵێ: حەزرەت ﷺ فەرمووی: کەواتە دیارە ئەوەی لە ژیانیدا شادە بێنێو لە سەرەمەرگدا بۆی نەیە هۆێیکی هەیە. ئینجا تەشریفی هەستاو لە خزمەتیدا هاتین بۆ لای کوڕەکەو حەزرەت ﷺ چوە لای سەریو فەرمووی: بڵێ ((لا الە الا الله)) عەرزی کرد ناتوانم بیڵێم. فەرمووی بۆ ناتوانی؟ عەرزی کرد لەبەر ئەوەی بە قسەی دایکم نەدەکرد. پرسی دایکت ماوە؟ گوتی: بەڵێ قوربان. فەرمووی: یەکێك بنێرن با دایکی بێ. چوون بانگیان کردب. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە کوڕی تۆیە؟ گوتی: بەڵێ قوربان، فەرمووی: ئەگەر ئاگرێك بکەنەوەو بڵێن: ئەگەر کوڕەکەت عەفوو نەکەی دەی خەینە ناو ئاگرەوە هەر عەفووی ناکەی؟ گوتی: ئەگەر وابکەن دیارە عافووی دەکەم. فەرمووی: بە شاهێدی خواو ئێمە بڵێ: لە کوڕەکەم ڕازی بووم. گوتی: ئەوا عافووم کرد، ئینجا پێغەمبەر بە کوڕەکەی گوت: بڵێ((لا الە الا الله)) کوڕەکە زۆر بە ئاشکرا

گوتی: (( لا اله الا الله))حەزرەت ﷺ زۆر خۆشحاڵ بوو فەرمووی: سپاس بۆ ئەو خوایەی کە بە واسیتەی منەوە ئەو کوڕە گەنجەی لە ئاگری دۆزەخ نەجات دا.

((ابن عساکر)) دەڵێ: ((عبدالرحمن)) مەحاربی رضي الله عنه دەفەرمووێ: پیاوێك خەریکی گیان دان بوو گوتیان: بڵێ: (لا الـه الا الله)) گوتی: ناتوانم بیڵێم، چونکە لەناو ئەو کەسانەدا ژیاوم کە جنێویان بە حەزرەتی ئەبووبەکر و عومەر دەدا.

پێغەمبەر ﷺ ئەبوو قوتادەی لەگەڵ چەند نەفەردا نارد بۆ کێوی ((ضم)). ی ((مەدینە)) . لە ڕێگادا تووشی پیاوێك بووین ناوی عامیری کوڕی ((صبط)) بوو . کە چاوی بە ئەسحابەی پێغەمبەر کەوت کابرا شادەی هێناو سەلامی کرد، موسڵمانەکان لەبەر ئەوەی باوەڕیان بە شەهادەت هێنانەکەی نەبوو وەلامی سەلامەکەشیان نەدایەوەو بەڵکو یەکێك بەناوی مەحلەمی کوڕی جوسامە چووە پێشەوەو کوشتی. جا ئەو ئایەتەی سورەی (انبیاء) لەسەر ئەو ڕووداوەدا نازڵ بوو کە دەفەرمووێ. ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُواْ وَلَا تَقُولُواْ لِمَنْ أَلْقَىٰٓ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَٰمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا ﴿٩٤﴾ ﴾ النساء: ٩٤ ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتیان هێناوە ئەگەر لەڕێگای خوادا سەفەرتان کرد بەوردی بکۆڵنەوەو ئەوەی سەلامی لێ کردن گورج مەڵێن تۆ موسڵمان نی. کاتێ مەحلەم بۆ عوزرخواهی هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ((لا غفر الله لك)) واتا خوا قەت عەفووت نەکا. کە مەحلەم ئەوەی بیست فرمێسکی لە چاوان هاتنە خواریێو لە مەجلیسەکەدا هەستاو هەر لەبەر حەفتەدا مرد. کاتێ خستیانە قەبرەوە قەبر لەخۆی

نەگرت و فڕێی دایە دەرەوە. تا سێ جار دەیان خستەوە ناو قەبرەکەو قەبرەکە فڕێی دەدایەوە. ئاخری لاشەکەیان خستە ناو کۆمەڵە بەردێکەوە.

کاتێ ئەوەیان بۆ حەزرەت ﷺ گێڕایەوە فەرمووی: زەوی زۆر لەوەی خراپتری لە باوەشی خۆی گرتووەو دەئامێزی دەگرێ، بەلاّم ئەوجارە خوای تەعالا ئێوە ئاگادار دەکاتەوە تا چاوتان بکرێتەوە.

## دەست لێدان و بۆن کردنی مەلائیکە لەکاتی مەرگدا

((ابن ابی الدنیا)) لە داوودی کوڕی ئەبوو هێندەوە دەگێڕێتەوە کە لە باسی بەسەرهاتی خۆیدا فەرموویەتی: جارێك زۆر نەخۆش بووم، لە نەخۆشیەکەمدا تەماشام کرد کابرایەکی کەللە زلی ناوشان گۆشتن پەیدابوو دەتگوت قولی زەنگیی یە، کەچاوم پێکەوت گوتم: ﴿قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ١٥٦﴾ البقرة: ١٥٦ و گوتم: ڕەنگە هاتبێ گیان بکێشێ، چونکە بیستبووم کە گیانی کافران مەلائیکەی ڕەش دەی کێشێ، لەوکاتە بەسامەدا دەنگی ڕوخانی بانەکەمانم بیست، تەماشام کرد سەربانەکەمان نەماو ئاسمان وەدیار کەوت، فریشتەی بەرگ سپی لە ئاسمانەوە هاتنە سەر زەوی و دەستیان کرد بە لۆمەی کابرا ڕەشەکەو ڕاویان نا، کابرا دوورکەوتەوە، بەلاّم لە دوورەوە زل زل تەماشای دەکردم و فریشتەکانیش هەر سەرزەنشتیان دەکرد، دوو فریشتە بەرگ سپیەکان یەکیان لە لای سەرم و ئەوی دی لە خوارمەوە دانیشتن. ئەوەی لای سەرم بەوی لای خواری گوت: تۆ دەست لە قاچانی بدەو بزانە. دەستی لە قاچانم داو گوتی بەو قاچانەی چووە بۆ نوێژ. ئینجا ئەوەی لای خواروم بەوەی لای ڕاستی گوت: تۆش دەست لە دەمی بدەو بزانە، دەستی لە دەم دام و گوتی: دەمی بەهۆی زکری خواوە هەر تەڕو تازەیە.

لـە کتێبـی ((نـوادر الاصـوال))دا لـە ئـەبوو قوللابـەوە ڕیوایـەت دەکـا کـە فـەرمووی: برازایـەکم نـاوی ((ماجـد)) بـوو زۆر نـەخۆش بـوو، لەبـەر چـەند خەتایەکی نەچووم بۆ لای، بەڵام کاتێ بیستم کە لە گیان کێشاندایە ڕەحمم بزوت، چونکە برازام بوو گوتم: لەبەر ئەوەی کەوتۆتە بازاڕی خواوە دەبێ عەفووی کەمو بچم بۆ لای، هەستام چوومو شەو تا بەیانی لە لای سەری دانیشتم.

لەو شەوەدا دوو نەفەری ڕەش پێست هەر یەکەی چەکوشێکیان بە دەستەوە بوو پەیدا بوون، لەپاش ماوەیەکی کەم تەماشام کرد دوو فریشتە لەسەر بانێ دەهاتنە خوارێ گوێم لێ بوو یەکیان بەوی دی دەگوت: تۆ بچۆ بۆ لای ئەو نەخۆشە بزانە داخۆ لە ماوەی ژیانیدا قەت دەستی بۆ کارێکی چاك بردووە یان نا؟

یەکیان هات بۆ لای برازاکەمو بۆنی بەسەرو سگو پێیانیەوە کردو گەڕایەوە بۆ لای ڕەفیقەکەیو گوتی: بۆنم بەسەر یەوە کرد بۆنی قورئانی لێ نەدەهات.

بۆنم بە سکیەوە کرد نیشانەی ڕۆژووی تێدا نەبوو. لە پاشان فریشتەکەی تر چوو بۆنی بە سەروسكو بەری دەستو قاچیەوە کردو گوتی: زۆرم لا عەجایبە، کە خوای تەعالا ناوی لە لیستی ئوممەتی محەمەد ﷺ نووسیوە، کەچی هیچ سیفەتێکی ئوممەتی محمدی ﷺ تێدا نیە. ئینجا هەر بەو سەر سامیەوە دەمی برازاکەمی لێك کردەوەو بەسەری زمانی ماڵیو لەناکاو ((الله اکبر))ێکی کردو گوتی: لەسەر نووکی زمانی ((الله اکبر)) ێکی دۆزیەوەو کە زۆر بە ئیخلاسی لە شاری ((انطاکیە)) ی ڕۆم گوتویەتی: لەپاش ئەوە بۆنی میسك وڵاتەکەی پڕکردو برازاکەم وەفاتی کرد. کاتێ فریشتە گیانی برازاکەمی کێشا بە دوو نەفەرە ڕەشەکانی گوت: کە لەبەر دەرگا ڕاوەستابوون، هەردووکتان بگەڕێنەوە چونکە ناتوانن دەستی بۆ

بەرن، بۆ بەیانی کە ئەبوو قوللابە خەونەکەی بۆ خەڵك گێڕایەوە زۆریان لا عەجایب بوو نوێژی جەنازەیان لەسەر کردو داوای لێ خۆش بوونیان بۆ کرد.

((ابن سندە)) لە حەسەنی کوڕی ساڵحەوە ڕیوایەت دەکا کە فەرموویەتی: ئەو شەوەی عەلی برام وەفاتی کردگوتی: چۆڕێکم ئاو بدەیە، لەوکاتەدا لە نوێژدا بووم، کە لە نوێژ بوومەوە ئاوەکەم بۆ برد گوتی: ئێستا ئاوم خواردۆتەوە زۆرم تکا لێ کرد ئاوەکە وەخوا هەر وای گوت: بەسەر سوڕمانەوە گوتم: خۆ لەو باڵەخانەدا من و تۆ نەبێ کەسی لێ نیە، کێ ئاوی دایتی؟ گوتی: ئێستا حەزرەتی جوبرەئیل تەشریفی هێناو لەدوا ئاودانم مژدەی دا و فەرمووی تۆ و براکەت و دایکت لەو کەسانەن کە خوای گەورە بەر لوتف و کەرەمی خۆی خستوون و لە ڕیزی ئەنبیا و صدیقین و شوهەداو پیاو چاکانن.

((ابن عساکر)) لە ((عبدالرحمن))ی کوڕی غەنەمی ئەشعەری ڕیوایەت دەکا و دەڵێ: کوڕی حەزرەتی موعاذی کوڕی جەبەل ﷺ بەهۆی تاعون عەمواسەوە وەفاتی کرد (لە شام گەڕەکێك هەیە ناوی عەمواسە، لە سەدری ئیسلامدا تاعونێکی زۆر کوشندەی لێ هات و ئێستا بەناوی تاعونی عەموەس بەناوبانگە)) حەزرەتی مە عاذ ﷺ بە فەوتی کوڕەکەی زۆر خۆ ڕاگر بوو، کاتێ لە شەڕی کافران نێزەیەکی وەبەر کەوت و فەرمووی: دۆست بۆ کاری خۆی هاتووە، ئەوەی بۆ بەجێ هێنانی کاری دۆست پەشێمانی نیشان بداو عوزر خواهی بکا قەت سەرکەوتو نابێ. ((عبدالرحمن)) دەفەرمووێ: کە ئەو قسە غەریبانەم لێ بیست گوتم: ئایا هیچ دەبینیت؟ گوتی: بەڵێ. بەهۆی ڕەزابوونم بە مەرگی کوڕەکەم خوای تەعالا ڕیزی لێ گرتووەو ئێستا هات بۆ لام و مژدەی دامێ کە ڕەسولی خوا ﷺ لەگەڵ سەد سەف مەلائیکەو شەهیدو سالحین دێن نوێژی جەنازەم لەسەر دەکەن و دەم بەن بۆ بەهەشت،

ئەوەندەی گوت و بێ هۆش بوو، لە بێ هۆشیەکەیدا دایم وەك موسافەحە لەگەڵ یەکێکدا بکا وابوو وەك بڵێ زۆر بەخێر بێی، خۆشیت هێنا، هەر ئێستا بە خزمەتتان دەگەم، ئەوەی گوت و وەفاتی کرد.

دەفەرمووێ: لەپاش وەفاتی لە خەومدا دیم هەر چوار دەوری کۆمەڵە سوارێکی بەرگ سپی بوو لە ناوەڕاستیاندا نەعرەتەی لێ دەدەن و دەی گوت: ئەوەیە پاداشتی سەرنێزەو موسیبەتی تاعون. ئینجا ئەو ئایەتەی سوڕەتی ((زمر)) خوێندەوە کە دەفەرمووێ: ﴿ وَقَالُوا۟ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى صَدَقَنَا وَعْدَهُۥ وَأَوْرَثَنَا ٱلْأَرْضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَآءُ ۖ فَنِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَـٰمِلِينَ ﴿٧٤﴾ ﴾ الزمر: ٧٤

عبدالرحمن دەفەرمووێ: لەپاشان وەخەبەر هاتم. حەزرەتی سەفیان رضي الله عنه لە بارەی داوودی کوڕی ئەبوو هیندەوە دەفەرمووێ: جارێك داوود بەهۆی نەخۆشی تاعوونەوە بێ هۆش بوو، کاتێ وەهۆش هاتەوە گوتی: دوو نەفەر هاتن بۆ لام، یەکیان لەوی دی پرسی چیت لێ دەست کەوت؟ گوتی: تەسبیح و تەکبیرو چوونە مزگەوت و هێندێکیشی قورئان لە بەرە.

## فرسەتی تۆبەکەی لەدەست دەچێ

لە تەفسیری ئەو ئایەتەی سوڕەی ((نساء))دا کە دەفەرمووێ: ﴿ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ ﴿١٧﴾ ﴾ النساء: ١٧ . واتە لە ئاخر لەحزەدا تۆبە دەکەن. ((ابن ابی حاتم)) لە ابن عەباسەوە ریوایەت دەکا کە فەرموویەتی: لێرەدا مەبەست ئاخر لەحزەی پێش چاو پێکەوتنی فریشتەی مەرگە ((ابن ابی الدنیا)) دەڵێ: بینا لەسەر ڕیوایەتی بەکری کوڕی ((عبدالله)) ی مەزەنی رضي الله عنه وەختی

تۆبەکردن زۆرە، بەڵام کە چاوت بە فریشتەی مەرگ کەوت کاتی تەوبە تەواو دەبێ‌و لە دنیا بێ خەبەر دەبێ.

حەزرەتی مەعاوی یەی کوڕی ئەبوو سوفیان ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەناو بەنی ئیسرائیلیاندا پیاوێك بوو زۆر گوناهبار بوو نەوەت‌و حەوت کەسی کوشتبو، کاتێ بیری لە گوناهەکانی کردەوە چوو بۆ لای ڕاهیبێك‌و گوتی: هیچ کارێکی خراپ نەماوە نەی کەم، تەنانەت نەوەت‌و حەوت قەتڵم کردووە، ئایا ڕێگای ڕزگاربوونم هەیەو تۆبەم قەبوڵ دەبێ ڕاهیبەکە ڕێگەی نەجاتت نیە، کابرا بە وەڵامی ڕاهیب زۆر نائومێد بوو ئەویشی کوشت‌و ڕۆیشت، چوو بۆ لای ڕاهیبێکی ترو هەموو خەراپەکانی خۆی بۆ گێڕایەوەو گوتی: چارەیەکم بکە، چارەت نیە، کە نائومێد بوو ئەویشی کوشت‌و چوو بۆ لای یەکێ ترو باسی گوناهەکانی بۆکردو گوتی: چارەم چیە؟ ئەویش گوتی: هیچ چارەت نیە، کە لەویش نائومێد بوو ئەویشی کوشت‌و بوونە سەد نەفەر، چوو بۆ لای ڕاهیبی چوارەم باسی گوناهەکانی بۆ کردو داوای ڕێگای تەوبەی لێ کرد، ڕاهیبەکە گوتی: ئەگەر بڵێم یەکێك بۆ لای خواوە گەڕێ خوا بۆ لای ئەو ناگەڕێتەوە درۆ دەکەم، تۆ تۆبە بکەو بچۆ لە فلان دێردا لەگەڵ عابیدەکان خەریکی عیبادەت بە کابرا بە قسەی ڕاهیبەکە ئومێدی پەیدا کرد تۆبەی کردو بەرەو ئەو دێرە کەوتە ڕێ، لە نیوەی ڕێگادا خوا دەستووری بە ئیزرائیل دا کە گیانی بکێشێ، فەوری لە پاش مردنی فریشتەی عەزاب‌و فریشتەی ڕەحمەت لەسەر بردنی لێیان بوو بە کێشە، لە ناکاوێك فریشتەیەك پەیدا بوو گوتی: کێشەمەکەن، بەینی ئەو جێگایەی کە لێی هاتووەو ئەو جێگایەی کە بۆی دەچێ بپێون، ئەگەر لە دێی تۆبەکەرەکان نزیکتر بوو بە پیاوچاکی لەقەڵەم دەن‌و، ئەگەر وانەبوو بە پیاو خەراپی حیساب بکەن، کاتێ پێوایان بستێك لە دێی پیاو چاکەکان نزیکتر بوو، خوا عەفووی کردو فریشتەی ڕەحمەت بردیان.

((ابن ابی الدنیا)) دەڵێ: ئەبوو هورەیرە ﷺ فەرمووی: پیاوێك زۆر نەخۆش بوو ڕۆژێك لە دەوری دانیشتبووین، لەناکاو نەخۆشەکە بێ حەرەکە بوو، وامان زانی مرد، پارچەیەکمان پێداداو چاومان بەستن، کاتێ هەڵمان گرت بۆ شتن جووڵا، گوتمان: ((سبحان الله))وامان زانی مردووی، گوتی: بێ شك مردم خسئتیانمە قەبرەوە، پیاوێکی بۆن خۆشی جوان منی خستە قەبرەوە، لەناکاو ئافرەتێکی ڕەشی بۆن خۆش هات دەستی کرد بە ژماردنی گوناهەکانم، زۆر خەجاڵەت بووم‌و موزاکەرەم لەگەڵ کردو زۆر درێژەمان پێدا، ژنەکە گوتی: زۆر باشە وەر بۆ فلان جێگا، با کێشەکەمان لەوێ کۆتای پێ بێ، چوینە خانوویێکی گەورەب، سەکۆیەکی بوو لە گۆشەیەکی سەکۆکە نوێژگەو جێ نوێژ بوو، پیاوێك لەوێ نوێژی دەکردو لە نوێژەکەیدا سوورەی (نمل))ی دەخوێند لە جێگایەکدا لێی تێك چو پێم گوتەوە.

کە لە نوێژەکە بووەوە گوتی: ئەو سورەتەت لەبەرە؟ گوتم: بەڵێ. ئینجا لەبن سەرینەکەی کتێبێکی هێنایە دەرو دەستی کرد بە خوێندنەوەی، لەوکاتەدا ژنە ڕەشەکە هاتە لای‌و گوتی: ئەو پیاوە فلان کاری خراپ‌و فلان‌و فلانی کردووە، لەوکاتە پیاوە بۆن خۆشەکە هات‌و ژنەکەی بەدرۆ کردەوەو دەستی کرد بە بەیانی کارە باشەکانم. یەکێ لە نوێژکەرەکان گوتی: ئەو بەندەیە زوڵمی لەخۆی کردووە، بەلاّم خوا چاوپۆشی لێ کردووەو ئێستا وەختی مردنی نەهاتووە، ڕۆژی دووشەممە دەمرێ، دەفەرمووێ: کابرای نەخۆش گوتی: ئێوە لەبیرتان بێ، ئەگەر ڕۆژی دووشەممە مردم ئەوا هەرچی دیومە ڕاستەو نەجاتم دەبێ، بەلاّم ئەگەر ڕۆژی دووشەممە نەمردم، ئەوە هەرچی دیومەو گوتومە بەهۆی بزرکاندنی نەخۆشی یەوە بووە، تا دووشەممە حاڵی زۆر باش بوو،عەسری ڕۆژی دووشەممە وەفاتی کرد.

## دەرسی چواردە

## ئەرواح یەکتر دەناسن

((ابن عساكر)) دەڵێ: ئەبوو نەعیم فەرمووی: کاتێ حەزرەتی حەسەنی کوڕی عەلی نەخۆش کەوت نەوعە حالەتێکی بە سەردا هات. لەوکاتەدا یەکێ هاتە خزمەتی و گوتی: ئەی ئەبوو محمد! ڕەنگە لەبەر ئەوەی کە بەلای مەرگەوە دەچی ئاوا دەستە پاچە کەوتبی؟ ئەگەر لەبەر ئەوە نارەحەتی، نارەحەت مەبە، چونکە لەگەڵ باوك و دایکت و حەزرەتی عەلی و فاتمە یەکتر دەبینن و باوکە گەورەت و دایکە گەورەت پێغەمبەر و حەزرەتی خەدیجە دەبینی و چاوت بە مامەکانت حەزرەتی حەمزە و جەعفەر ڕووناك دەبێتەوە. شەرەفی مولاقاتی خاڵەکانت قاسم و تەیب و موتەهەر و ئیبراهیم بە نسیبن دەبێ و بە چاوپێکەوتنی پورەکانت ڕوقیە و ((ام کلثوم)) و زەینەب خۆشحاڵ دەبی. کاتێ حەزرەتی حەسەن زانی کە لەدوای مەرگ لەگەڵ ئەو خۆشەویستانەی چاویان بە یەکتر دەکەوێ نارەحەتیەکەی نەما.

ئەبوو نەعیم لە زمان لەیسی کوڕی سەعیدەوە ڕیوایەت دەکا کە لە وڵاتی شام پیاوێك شەهید کرا. باوکی ئەو شەهیدە هەموو شەوێکی جومعە کوڕەکەی دەهاتە خەو ژەنگی غەمی لە لەوحەی دڵی پاك دەکردەوە. جارێك وا ڕێکەوت شەوی جومعە نەهاتە خەوی. بۆ شەوی جومعەی داهاتوو کوڕەکەی لە خەودا دی گلەیی لێ کردو گوتی: کوڕم! ئەوە بۆ لە حەفتەی ڕابردوودا غایب بووی؟ بە غایب بوونەکەت زۆر نارەحەت بووم. کوڕەکە گوتی: بابە گیان! شەوی جومعەی گوزەشتە نەم توانی بە خزمەتت بگەم، چونکە دەستوور بە هەموو شەهیدەکان درابوو کە لەبەر ئەوەی بڕیار وایە عومەری کوڕی ((عبدالعزیز)) ﵁ تەشریفی بێ بە پیری یەوە بچین و چاومان پێ بکەوێ بۆ مولاقاتی وی ڕاگیرابووم. لەوشەوەدا عومەری کوڕی

((عبدالعزيز)) وەفاتی فەرموو. لەسەر شەرەفی وی دەستوور بە تەواوی شەهیدان درابوو کە پێشوازی لەو پیاوە چاکە بکەن.

**زەوی کافران ئەشکە نجە دەکاو فریشتە بە موسڵمان دەڵێ: وەك زاوا ئاسوودە بخەوە**

ترمزی لە ئەبوو هورەیرە ﵁ ڕیوایەت دەکا کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کاتێ مردوو دەخەنە قەبرەوە دوو مەلائیکەی ڕەشی چاو ئاوی یەکیان ناوی نەکیرو ئەوی تر ناوی مونکیرە دێنە لای و پرسیاری لێ دەوکەن و دەڵێن: لە بارەی پێغەمبەرەکە ڕەوەانە کرابوو بۆ لاتان دەڵێی چی؟ ئەگەر ئیماندار بێ دەڵێ: ڕەسولی خوا بوو، شاهیدی دەدەم کە خوا بێ شەریکەو محمد بەندەو پێغەمبەری خوایە، مەلائیکەتەکان دەڵێن: دەمان زانی ئاوا وەڵام دەدەیەوە. جا قەبرەکەی حەفتا بستی چوارگۆشە گۆشادو ڕووناك دەبێ و دەڵێن: بۆ خۆت بخەوە. دەڵێ: دەچمماڵەوە ئاگادار دەکەم لە حاڵی خۆم.
دەڵێن: ئاخر ئەوەی هاتە ئێرە ڕێگای گەڕانەوەی نیەو بڕۆ وەك بووکێك کە مێردەکەی نەبێ کەس حەقی هەڵستاندنی نیە ئاوا بخەوە جا تا ڕۆژی قیامەت بە ئاسوودەیی لە گۆڕدا دەمینێتەوە تا خوا زیندووی دەکاتەوە. بەڵام ئەگەر مردووەکە مونافق یان کافر بێ لە وەڵامی نەکیرو مونکەردا دەڵێ:ئەوەی لە خەڵکم بیستووە هەر ئەوە دەڵێم زیاتر نازانم، فریشتەکان دەڵێن: باشمان دەزانی ئاوا جواب دەدەیتەوە، جا بە زەوی دەگوترێ بیگوشە، زەوی وای دەکوشێ و گۆڕ فشاری دەدا پەراسووی تێك دەپەڕن و تا ڕۆژی قیامەت بە عەزابەوە لە گۆڕدا دەمینێتەوە. جا لەو حەدیسە موبارەکەردا وا دەر دەکەوێ کە ئەهلی ئیمان لە عالەمی بەرزەرخدا زۆر بە خۆشی دەژین و ئاگایان لە لە خۆیانەو لە نوێژ غافڵ نین و لە پرسیارو وەڵامی مەلائیکە ناترسن، چونکە حاڵیان باشە، بۆ ئەوەی مژدە بدەن بە ماڵەوە بە مەلائیکەتەکان دەڵێن: ئێستا ناخەوین دەچین ماڵەوە ئاگادار

دەکەینـەوە. کـە دەزانـن حاڵیـان باشـە لـە ڕۆژی قیامـەت پرسـیار دەکـەن بـۆ ئەوەی زوو بچنە بەهەشت . ئەوەی خوا ڕەحمی پێ بکا ئاگی لەخۆیەو خوا بـۆ وەڵامـی مەلائیکـە تـۆفیقی دەدا. هـەروەك لـە سـووڕەی ((ابـراهیم)) دا دەفـــەرمووێ: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ﴿٢٧﴾ ﴾ إبراهیم: ٢٧ تەبەڕانی دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە حەزرەتی عومەری رضي الله عنه فەرموو: ئەی عومەر! دەبێ ئەوکات حاڵت چۆن بێ کە خەڵك دەتخەنـە قـەبرەوەو گڵـت وەسـەر دەدەن و دەگەڕێنـەوە دوو مەلائیکـەی تـاقی کردنەوەکـە دەنگیـان وەك گرمـەی هـەورو تەماشـایان وەك بروسـکەیە؟ بڵـێ بزانم ئەو وەختە حاڵت چۆن دەبێ؟ حەزرەتی عومەر رضي الله عنه عـەرزی کـرد ئـەی ڕەسولی خوا! ئەو کاتە عەقڵمان دەمێنێ؟ حەزرەت ﷺ فەرمووی: بەڵێ. وەك ئینسان دەبێ، کاتێ حەزرەتی عومەر رضي الله عنه ئەوەی لە حەزرەت ﷺ بیست عەرزی کرد ئەگەر وابێ لەگەڵیان ڕێك دەکەوم.

## پرسینی ئەهلی بەرزەخ لە موسڵمانان

ئەحمەدی نەسائی لە ئەبوو هوڕەیرە رضي الله عنه ڕیوایەت دەکا کە حەزرەت ﷺ فـەرمووی: کـاتێ فریـشتە ڕوحـی مـردووی تـازە دەبـەن بـۆ لای ئـەڕواحی ئەوانەی لە پێش ئەودا مردوون، ئەوەندە خۆشحاڵ دەبن، ئەگەر یەکێك لە دنیادا چەند خۆشەویستی ون بووی بدۆزێتەوە ئەوەندە خۆشحاڵ نابێ. جا لێی دەپرسن فلان کەس حاڵی چۆنە؟ لە پاشان بە یەکتر دەڵێن: باشە جارێ سەبر بکەن لە پاشان لێی بپرسن، با کەمێك ئیسراحەت بکا، چونکە غەمی دنیای زۆر بووە، جا دەست دەکا بە قسان کە فلان کەس حاڵی ئاوایەو

### دیمەنی مەرگ

فیسار کەس ئاوایە، لەبارەی ئێوەشەوە کە زووتر مردووە دەڵێن: دیارە لەبەر ئەوەی نەهاتۆتە لای ئێمە بردوویانە بۆ دۆزەخ.

### موجاهیدو سنور پارێزو شەهید

ترمزی و ابن ماجە لە میقداسی کوڕی مەعدیکەریبەوە ڕیوایەت دەکەن کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: شەهید لای خوا شەش جائیزەی هەیە.

یەکەم: لەگەڵ ڕژانی یەکەم دڵۆپە خوێنی دەبەخشرێ و جێگای خۆی لە بەهەشت نیشان دەدرێ.

دووەم: لە عەزابی قەبر مەحفوز دەبێ.

سێیەم: لەکاتی نەفی سوور لێداندا ناخەجڵێ.

چواررەم: تاجی حورمەتی لەسەر دەنرێ کە هەر یاقوتێ کە پێیەوە هەموو دنیا دێنێ.

پێنجەم: حەفتاو دوو حۆری دەدەنێ.

شەشەم: شەفاعەتی بۆ حەفتا خزم قبوڵ دەکرێ.

لە کتێبی میشکاتی شەریفدا لە شێخی موسلیم نەقڵ دەکا کە سەلمانی فارسی لە حەزرەتەوە ﷺ ڕیوایەتی کردووە کە دەفەرمووێ: هەرکەسێك ڕۆژێك سنووری وەڵات بپارێزێ و دیفاع لە خاك و وەتەن بکا خێری لە مانگێك ڕۆژووی سوننەت و مانگێك شەونوێژ زیاترە، ئەگەر لەوکاتەشدا بمرێ تا ڕۆژی قیامەت هەر خێری پێ دەگا و ڕزقی شەهیدانی بە نسیب دەبێ و لە قەبردا لە ئەمانەتدا دەبێ.

نیسائی و تەبەڕانی لە ئەبوو ئەییوبەوە ﷺ ڕیوایەت دەکەن کە حەزرەت فەرمووی: ئەوەی لە ڕێگای خوادا بەرگری دوژمن بکا تا شەهید دەکرێ یا زاڵ دەبێ بەسەر دوژمندا لە گۆڕدا دووچاری فیتنە نابێ.

## هەر گۆشەیەك لە گۆڕستان بۆ پێشوازی لە موسڵمانان خۆی دەڕازێنێتەوە

بینا لەسەر ڕیوایەتی حاکمی ترمزیو (ابن عساکر)) ی ئیبن عەدی کە ابن عومەرەوە ﷺ ڕیوایەتیان کردووە حەزرەت ﷺ فەرموویەتی: وەختێ موسڵمانێك وەفات دەکا هەموو گۆشەیەکی گۆڕستان خۆی بۆ پێشوازی لەو ئیماندارە ئارایش دەداو هەمووشی ئارەزووی ئەوەیە کە لە وێدا بینێژن، بەڵام کە کافر دەمرێ هەموو گۆڕستان تاریك دەبێ و پەنا دەگرێ بە خواو هاوار دەکا لە وێدا نەینێژن.

هەروەها ئەبوو سەعید ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خەڵکێنە! یادی ئەو مەرگە بکەنەوە کە هەموو لەززەتێك لە بەین دەبا. قەبر هەموو ڕۆژێك پڕ بە دەم بە مردووانی خۆی دەڵێ: من ماڵی تەنیایی و غەریبیم من خانووی گڵ و کرمم. کاتێ ئینسانی موسڵمان دەخەنە قەبرەوەو قەبر بەخێر هاتنی دەکاو مژدەی دەداتێ و دەڵێ: لەوانەی بەسەرمدا دەڕۆیشتن تۆم لە هەمووان خۆشتر دەویست، ئیمڕۆ من ماڵی تۆم بە چاوی خۆت دەبینی. جا تا چاو هەرەکەت دەکا قەبرەکە پان دەبێ و بەهەشت دەرگای بۆ دەکاتەوەو بە چاو دەبینرێ.

ئەبوو هورەیرە ﷺ دەڵێ: جارێك لە خزمەت حەزرەتدا ﷺ لەگەڵ جەنازەیەك چووینە سەر قەبران. لە لای گۆڕێك دانیشتین و فەرمووی: ئەو

قەبرە هەموو ڕۆژێك بە دەنگی بەرز دەڵێ: ئەی ئەولادی ئادەم! بۆچی منت فەرامۆش کردووە؟ نازانی کە من خانەی تەنیایی، خانەی غەریبی، خانەی وەحشەت، خانەی کرمان‌و خانووێکی تەنگم؟ دیارە بۆ ئەو کەسەی کە خوا بفەرمووێ زۆر گوشاد دەبم. لە پاشان حەزرەت ﷺ فەرمووی: گۆڕ یا گوڵستانێکە لە بەهەشت. یان تەندوورێکی پڕ لە ئاگرە.

بینا بە ڕیوایەتی ئەبوو حەجاجی شیمالی کە ترمزی‌و ئەبوو یەعلاو ((ابن ابی الدنیا)) دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کاتێ مردوو دەخەنە قەبرەوە قەبرەکە پێ ی دەڵێ: ئەی نەوەی ئادەم! مەرگ بەر تۆ، چی تۆی تەفرەدا؟ ئایا نەت دەزانی کە من خانووی تەنیایی‌و کرم‌و تاریکیم؟ ئاخر چی تۆی وا فریو دا کە ئەوەندە بێ باك بی‌و بۆ بەسەر مندا ئاوا بە تەکەبورەوەو بە ناز دەڕۆیشتی؟ جا ئەگەر پیاوی چاك بێ مەلائیکە لەباتی ئەوە وەڵام دەدەنەوەو دەڵێن: ئەی قەبر! بزانە ئەو پیاوە ڕووی کرد بۆ چاکەو تەرکی خەراپە. جا قەبر دەڵێ: دیارە باش بووە، هەر ئێستا بۆی سەوز دەبم، فەوری لاشەکەی گەش دەبێتەوەو ڕوحی دەڕوا بۆ خزمەت خوا.

((عبدالله))ی کوڕی عوبەید دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: مردوو لە لە قەبردا دادەنیشێ‌و دەنگی پێی ئەو کەسانە دەبیستێ کە لەگەڵ جەنازەکەیدا چوونە سەر قەبران. قەبرەکە بە مردووەکە دەڵێ: ئەی فرزەندەی ئادەم! بمری باشترە، تۆ لە بۆنی ناخۆشی من‌و کرمی من نەدەترسای؟ بۆیە خۆت ئامادە نەکردووە.

((ابن ئەبی شیبە)) لە یەزیدی کوڕی شەجەرەوە ڕیوایەت دەکا کە حەزرەت ﷺ فەرموویەتی: قەبر بە مردووی کافرو بێ دین دەڵێ: ئەوە تەنیایی‌و تاریکی‌و وەحشەت‌و تەنگی‌و غەمی منت لە بیر خۆت بردبووەوە؟

## کردەوە دەکریّ بە جیسم

عەمەلی چاك‌و خەراپ وەك جیسم لیّ دەکەن‌و لە قەبرو ڕۆژی قیامەتدا، خۆشی‌و ناخۆشی بە خاوەنەکەیانم دەگەیەنن. هەر چەند کە کردەوە عەرەزە، بەلاّم قودرەتی خوا بە دوور نیە بیکاتە جیسم. ئیّمە دەبیّ ئیمانمان بە ئەحوالّی دوا ڕۆژ بیّ، با عەقلّی ناتەواوی ئیّمەش قبولّی بکا یان نا.

لە نەواسی کوڕی سەمعانەوە ڕیوایەت دەکەن کە پیّغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسانەی قورئان دەخویّنن‌و عەمەلی پیّ دەکەن لە ڕۆژی قیامەتدا قورئان شان بەشانیان دەڕواو سووڕەی ((بقەرە)) و سووڕەی ((ال عمران)) لە پیّشەوە دەڕۆن و پاریّزگاری لە قورئان خویّنەکە دەکەن.

ابن موبارەك لە زەیدی کوڕی ئەسلەوە ڕیوایەت دەکا کە لە ڕۆژی قیامەتدا کردەوەی موسلّمانان لەسەر شکلّ‌و ویّنەیەکی جوان لە تەنیشت خاوەنەکەی دادەنیشیّ، کە خاوەنەکەی بیّ قەرار بوو ئەو ئاگاداری دەکاو لە کاتی ترسدا سەبووری پیّ دەداو بە چاو پیّکەوتنی ئەو دیمەنە، موسلّمانەکە دەلّیّ: خوا جەزای بەخیّرت بداتەوە تۆ ڕەفیقیّکی زۆر باشی، ڕاستی بلّیّ: بزانم تۆ کیّی؟ عەمەل دەلّیّ: ئایا تۆ من ناناسی؟ من لە دنیاو لە قەبردا لەگەلّ تۆ مامەوە.

من کردەوەی تۆم تۆ کردەوەت چاك بوو، لەبەر ئەوەیە کە ڕەفتارم لەگەلّت باشە. وەرە سوارم بە، چونکە تۆ تا لەدنیا دا بووی من سواری تۆ بووم ئیّستا تۆ سواری من بە. عەمەلەکەی سواری دەکاو دەی با بۆ حزور خواو دەلّیّ: ئەی خوای گەورە! ئەوکەسانەی لە دنیادا تیجارەتیان کرد سوودیان دەست کەوت. ئەوەی پیشەیەك فیّربوو قازانجی کرد، بەلاّم ئەوە کەسیّکە هەر خەریکی من بووە، خوای گەورە دەفەرمووێ: بلّیّ بزانم چیت دەویّ؟ عەرزی خوای گەورە دەکا بەخشش‌و ڕەحمەتی تۆ. خوای تەعالا

دەفەرمووێ: ئەوا بەخشیم. جا ئەو کاتە لیباسی عیززەتی لەبەر دەکەن و تاجی ئیحترامی لەسەر دەنێنن کە هەر مرواریەکی روناکی دە رۆژە ڕێ دەڕوا لە پاشان عەمەلەکەی دەڵێ: خوایە ئەم پیاوە بەهۆی خەریك بوونی بەکاری چاکەوە دەست کورت بوو، نەی توانی یارمەتی دایك و باوکی بدا، لە کاتێکدا خەڵکی تر لە کەسب و کاری دنیا خۆشیان قازانجیان کرد و یارمەتی باوك و دایکیشیان دا. جا لەبەر ئەو داوایە ئەو نیعمەتەی دەدرێ بەو دەدرێ بە دایك و باوکەکەشی.

بەلام بە پێچەوانە عەمەل و کردەوەی خراپ دەبرێتە سەر ناشیرین ترین شکڵ و بۆنی زۆر ناخۆش دەبێ و دەچێ لە لای دادەنیشێ. کاتێ ترسی زۆر دەبێ کردەوەکەشی خۆی نیشان دەدا، بەچاو پێکەوتنی ئەو وەزعە کابرا دەڵێ: تۆ ڕەقیقێکی خەراپی بڵێ بزانم تۆ کێی؟عەمەلەکەی دەڵێ: تۆ من ناناسی؟ من کردەوەی تۆم تۆ ملت نەوی بکە با سوارت بم، چونکە لە ژیانی دنیادا تۆ سواری من بووی.

## وەزعی پیاوی بێپارەو پارەدار لە قیامەتدا

لە کتێبی ((الدیباج)) و ((شرح الصدور))دا لە زمان عەمری کوڕی ئەسلەم ریوایەت دەکەن کە قەبر هەڵکەنێك ڕووداوێکی ئاوای گێڕایەوە دەڵێ: جارێ سێ قەبرم بۆ سێ مردوو هەڵکەند، کاتێ دوانم هەڵکەندبوو خەریکی سێ یەمیان بووم، هەستم بە گەرمایەکی زۆر کرد، چادرێکم لەسەر قەبرەکە هەڵداو لە بنی دانیشتم. لەوکاتەدا دیمەنێکی عەجیبم دی، تەماشام کرد دوو نەفەر سوواری ئەسپێ سوور بوون هاتن و لە تەنیشت قەبری ئەووەڵ ڕاوەستان، یەکیان بەوی تری گوت، بنووسە. گوتی: چ بنووسم؟ گوتی : بنووسە فرسەخێك پان و فرسەخێك درێژ، لە پاشان هاتنە لای قەبری دووەم و یەکیان بەوی دی گوت: بنووسە: گوتی چ بنوسم؟ گوتی بنووسە تا

چاو دەبینێ، ئینجا هاتە لای قەبری سێ یەم یەکیان بەوی دی گوت : بنووسە. گوتی: چ بنووسم؟ گوتی: بنووسە بە ئەندازەی بەینی قامکی شادەو قامکی ناوەڕاست.

دەڵێ: لەپاش چاو پێکەوتنی ئەو دیمەنە چاوەڕوانی هاتنی سێ جەنازەکە بووم، جەنازەیەکیان هێنا زۆر کەمی خەڵك لەگەڵ بوو، پرسیم؟ ئەوە کێ یە؟ گوتیان: ئەوە پیاوێکی ئاو کێشی خێزان زۆری فەقیرە، هیچی نەبووە، ئێمە وەسائیلی کفن و دفنمان بۆ داوە. دەڵێ: بە بینینی ئەوە دەستم لە حەقی قەبر هەڵکەندنەکە هەڵگرت و گوتم: بۆ ماڵ و منداڵەکانی خەرج کەن و تەسلیم بە خاکیان کرد.

جا جەنازەی دووەمیان هێنا، تەنیا هەر ئەوانەی لەگەڵ بوو کە هەڵیان گرتبوو، هێنایانە لای قەبری دووەم کە دوو سوارەکە گوتیان: تا چاو حەڕەکەت دەکا. پرسیم ئەوە جەنازەی کێ یە؟ گوتیان: ئەوە جەنازەی ڕێبوارێکی بێ چارەیە لە ئەسپ کەوتۆتە خوارەوە، پارەی قەبرەکەی ئەویشم وەرنەگرت و تەسلیممان کرد.

ئینجا تا بانگی عیشا چاوەڕوانی جەنازەی سێ یەمم کرد، لە پاش نوێژی عیشا جەنازەیەکیان هێنا، کاتێ پرسیارم کرد گوتیان:ئەوە جەنازەی ئافرەتێکی زۆر موعتەبەرەو لە خانەوادەیەکی زۆر ناسراوو دەوڵەمەندە. خەڵکی بێ حەددو حیساب لەگەڵ بوو، لەو قەبرەیاندا ناشت کە دوو سوارەکە گوتیان: بە ئەندازەی بەینی دوو قامك بێ.

**تێبینی**

بەڵام ئەوە مەعنای وا نیە کە ئەگەر پیاوێکی چاك بمرێ و خەڵکی زۆر لەبەر خۆشەویستی لەگەڵی بچنە سەر قەبران ئەوە نیشانەی خراپی یەتی؟ بەڵکو نیشانەی خوا لێ ڕازی بوونیەتی.

## عەزابی قەبر بۆ جیسمو جانە

ئـاگر پەرسـتێك هاتـە خزمـەت حـەزرەتی عومـەر ﷺ سـێ کاسـە سـەری بەدەسـتەوە بـوو گـوتی: ئـەی عـومر! ئاغاکـەی ئێـوە پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرمووێ: ئـەوەی لـە کـاتی مەرگیـدا موسـڵمان نـەبێ بـە ئـاگری دۆزەخ دەسـووتێ، ئـاگر پەرسـتەکە کـە ئـەو ئایەتـەی سـوورەتی ((غافر))نیشی خوێندەوە کە دەفەرمووێ ﴿ ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۚ ﴿٤٦﴾ ﴾غافر: ٤٦ حەزرەتی عومەر ﷺ فەرمووی: بێ شك فەرموودەی ئاغای ئێمە پێغەمبەر ﷺ ڕاستە. ئاگر پەرستەکە هەرسێ کاسە سەرەکەی هێنایە دەرو گوتی: ئەوەیان کاسـەی سـەری باوکمو ئەوەیان دایکمو ئەوەیان ئـی خوشکمە، هەر سێکیان لە کاتی مەرگدا مەجووسی بوون. کاتێ دەستیان لێ دەدەم هەست بەگەرمی ناکەم کەچی بە قسەی پێغەمبەری ئێوە ﷺ دەبێ گەرم بن.

حەزرەتی عومەر ﷺ ناردی بەدوای عەزرەتی عەلی ﷺ کاتێ تەشریفی هـات حەزرەتی عومەر ﷺ بە مەجووسی یەکەی گوت: دەی دووبارە ڕەخنەکەت بگـرەوە. کـابرا عـەینی قسـەی کـردەوە. حـەزرەتی عـەلی ﷺ کـە گـوێی بـۆ قسەکانی گرت داوای پارچە ئاسنێكو بەردێکی کرد.

کاتێ هێنایان بە مەجووسی یەکەی گوت: دەستیان لێ دەو بڵێ داخۆ ساردە یـان گەرمـە. دەسـتی لێ دانو گـوتی: زۆر باشـە سـاردن؟ حـەزرەتی ﷺ فـەرمووی: : زۆر باشـە دە ئێـستا ئاسـنەکە لەبەردەکـە ڕاکێـشە، کـاتێ

مەجووسیەکە ئاسنەکەی لە بەردەکە ڕاکێشا ئاگری لێ بووەوە، حەزرەتی عەلی رضي الله عنه فەرمووی: ئەی مەجووسی! هەروەك خوای تەعالا بە قودرەتی خۆی ئاگری لە بەینی ئاسنو بەردا درووست کردووە ئاواش دەتوانێ لە کاسەی سەردا درووستی کاو تۆ نەزانی گەرمە. ئەو کاسە سەرانەی تۆ لات وایە ساردن خوای تەعالا وایان دەخاتە ناو ئاگرەوە کە تۆ هەستی پێ نەکەیو ئەوان لە ئاگری غەزەبی خوادا بسووتێن، کابرای ئاگر پەرست بێدەنگ بوو.

## خۆ نەپاراستن لە میز دەبێتە عەزابی قەبر

ابن عومەر رضي الله عنه ڕووداوێکمان ئاوا بۆ دەگێڕێتەوە. دەڵێ لە سەفەردا بە لای قەبرێکی زەمانی جاهیلییەتدا ڕۆیشتم لە ناکاوێك یەکێك لە قەبرەکە هاتە دەرەوە، بلێسەی ئاگر دەوری دابوو، زنجیری ئاگری لە ملدا بوو، دۆدانە ئاوێکم پێ بوو، کەچاوی بە من کەوت گوتی: ئەی عەبدی خوا! چۆڕێکم ئاو بدەیە، هەر لەو کاتەدا یەکێ تر هەر لەو قەبرە هاتە دەرەوە گوتی: ئەی عەبدی خوا ئاوی مەدەیە ئەوە کافرە هات زنجیرەکەی گرتو بردییەوە قەبرەکەوە.

ابن عومەر : رضي الله عنه دەفەرمووێ: کە ئەوەم دی ڕۆیشتمو شەو چوومە ماڵی پیرێژنێك لە نزیك ماڵەکەیان قەبرێك بوو، شەو لە قەبرەکەوە گوێم لێ بوو دەی گوت: ((میز)) لە پیرێژنم پرسی ئەوە قەبری کێ یەو دەڵێ چی؟ گوتی: ئەوە قەبری مێردەکەمە، کە میزی دەکرد خۆی پاك نەدەکردەوە، هەمیشە پێم دەگوت: تۆ لە جانەوەران بەدتری، چونکە تەنانەت کە وشتر میز دەکا قاچ لێك بلاو دەکاتەوە تا پیس نەبێ بەلام تۆ هیچ گوێی نادەیتێ. ئامۆژگاری

منی وەرنەدەگرت. لەبەر ئەوەیە لەو وەختەوە مردووە هەمیشە هاواردەکاو دەڵێ: میز کام میز؟ ئەو میزە کە ئیمڕۆ بە هۆی بێ موبالاتیم عەزابی پێوە دەکێشم. جا ئەی ئەوانەی خۆتان بە پیشکەوتو دەزانن و بە پێوە میز دەکەن و میز شەڵوارەکەتان تەڕ دەکاو بە قول و قاچتان هەڵدەپڕژێ، هیچ نەبێ ئەوە بزانن کە کاتێ سەگ میز دەکا قاچێك بەرز دەکاتەوە تا پیس نەبێ. ئایا ئێوە لەسەگێش خۆتان بە کەمتر دەدەنێن؟

ابن عومەر ﷺ دەفەرمووێ: گوتم ئەی باشە بۆ دەڵێ: مەشکە کام مەشکە؟

پیرێژن گوتی: ڕۆژێك پیاوێکی تینوو هات داوای ئاوی لێ کرد ئە ئیشارەی بۆ مەشکە بەتاڵێك کردو گوتی: ئەوە ئاوە بڕۆ وەخۆ. کاتێ کابرای تینوو چوو ئاو وەخوا قەترە ئاوێکی تێدا نەبوو، کابرا لە تینوان بەلادا هات و مرد. جا لەبەر ئەوەیە لەو کاتەوە مێردەکەم مردووە دەڵێ: مەشکە کام مەشکە، ئەو مەشکەی بۆتە هۆی عەزابی من.

ابن عومەر ﷺ دەفەرمووی: کاتێ لە سەفەرەکەم گەڕامەوە ئەو ڕووداوەم بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە. فەرمووی: ئامۆژگاریتان دەکەم کەس بە تەنیا نەچێتە سەفەر.

## دەرسی پازدە

## پیاو بە ناهەق کوشتن هۆی عەزابی قەبرە

سەدەقەی کوڕی خالید لە بەعزە موشایەخێکی ((دیمشق)) وە ڕیوایەت دەکا کە فەرموویانە جارێك دەچووین بۆ حەج یەکێك لەوانەی کە لەگەڵمان بوون لە ڕێگا فەوتی کرد پاچ و خاکەنازێمکان لە خەڵکی ناوچەکە وەرگرت و قەبرێکمان بۆ هەڵکەندو خستمانە ناویەوە. لە پاشان زانیمان کە پاچەکەمان لە قەبرەکەدا لەبیرکردووە. هەڵمان دایەو تەماشامان کرد مل و هەردوو دەستی مردووەکەیان بە پاچەکەوە بەستووە، کە ئەو دیمەنە وەحشەت ناکەمان بینی قەبرەکەمان پڕکردەوە، نەمان توانی پاچەکە بێنینەوە دەرەوە، بە پارە خاوەن پاچەکەمان ڕازی کرد. کاتێ هاتینەوە لە ژیانی کابراو ئەحوالی کابرامان پرسی: گوتی: جارێك مێردەکەم لەگەڵ پیاوێکی دەوڵەمەند چوو بۆ سەفەروو لە ڕێگادا کوشتی و هەرچی پێی بوو هێنایی و بە پارەی ئە هاتبوو بۆ حەج.

## حیکایەت

## کاسەی سەر پاشایەك

لە کتێبی ((موختەسەری مودهیشدا)) لە ابن جەوزی ڕیوایەت دەکاو دەڵێ: جارێك حەزرەتی عیسا علیە سلام لەگەڵ حەواری یەکانی دەرچوو بۆ جێگایەك، لە ڕێگادا چاویان بە کاسە سەرێك کەوت، داوایان لە حەزرەتی عیسا کرد کە داوا لە خوا بکا کە ئەو کاسە سەرەیان بۆ زیندوو بکاتەوەو بەسەرهاتی خۆیان بۆ وەگێڕێ و پێی عیبرەت گرتوو بن، حەزرەتی عیسا دوو ڕکات نوێژی کردو لەبەر خوا پاڕایەوە کاسە سەرەکە زیندوو بووەوەو گوتی: ئەی ڕوح الله بفەرموو دەڵێی چی؟ خوای گەورە دەستووری پێ داوم وەڵامی

پرسـیارەکانت بدەمـەوە، حـەزرەتی عیـسا فـەرمووی: تـۆ لەسـەر زەوی چ کەسێك بووی؟ کاسـە سـەرەکە گـوتی: مـن پاشـای ڕووی زەوی بـووم، هـەزار ساڵ ژیام و هەزار کوڕم لە پاش بەجێ ما و هـەزار شـارم گـرت هـەزار لەشـکرم شـکاند هـەزار پاشـام کوشـت ئـاخری کـە دنیـام گـرت دوچـاری مـەرگ بـووم: ئـاخری زانـیم کـە هـیچ سـەروەتێك لـە زوهـدو پـەرهێزکاری باشـتر نیـەو لـە حـیرس و تەماعـدا نابوودیـەو ڕازی بـوون بـە ڕەزای خـوا لـە هـەموو شـتێك باشترە.

لە تەئریخی نەیشاپووردا دەڵێ: سەعیدی کوڕی موسەییب ﷺ دەفەرمووێ:

جارێك لەگەڵ حەزرەتی عەلی ﷺ چووینە گۆڕستانی مەدینـە. حـەزرەتی عـەلی لەپاش سەلام لە قەبرستانەکە فەرمووی: ئێوە خۆتان باسی خۆتان دەکەن ئا ئێمە باستان بکەین؟ سەعید دەڵێ: گوێمان لە دەنگی ((وعلیکم السلام)) بوو، یەکێك دەی گوت: ئەی ئەمیری موسڵمانان! تۆ بۆمان باس بکە داخۆ لەدوای ئێمـە چـی ڕوو دەدا؟ حـەزرەتی عـەلی ﷺ فـەرمووی: گـوێ بگـرن ژنـەکانتان شوویان کـردەوە، مـیرات گـر ماڵـەکـەیان بـەش کـردن، منداڵـەکانتان بـوون بـە هەتیوو، دوژمنانتان خانووە قایمـەکانی ئێـوەی داگیر کـردووە، بـە بیـستنی ئەو قسانە مردووێك ئاوای باسی خۆی کرد.

کفنـەکانمان دڕاون، مووەکانمـان هـەڵوەریون، چـەرم و پێـستمان ڕزیـوە، چاومان بوونـە ئـاو و بەسـەر ڕوخسارماندا هاتنـە خـوارەوە، چڵك بـە کوونـە لوتمانـدا دێتـە خـوارەوە، ئـەوەی لـە پـێش خۆمانـدا ناردمـان دەسـتمان کەوتـەوەو ، ئەوەی بە جێمـان هێشت بوو بە زەرەر، خولاسـە چیمان چاند ئەوەمان دوریەوە.

## داوا لە بەینی ڕوح و بەدەندا

ابن مەندە دەڵێ: ابن عەباس دەفەرمووێ: ڕوح داوا لە جیسم دەکا و دەڵێ: ئەوەی کردت تۆ کردت. جیسم دەڵێ: تۆ دەستووردت دەدا، ئەوەی تۆ پێت باش بوو من ئەوەم دەکرد. جا بۆ دادگەری لە بەینی ڕوح و جیسمدا خوای تەعالا فریشتەیەك دەنێرێ و دەڵێ: حاڵی ئێوە وەکو حاڵی شەل و کوێرەکە وایە.

شەلێك بە کوێرێکی گوت بوو چاوم لە میوەیەکە، بەلاّم ناتوانم بۆی بچم و دەستم بگاتێ، کوێرەکە گوتی: وەرە شەر شانی من و بیچنە، شەلە چووە سەر شانی کوێرەو میوەکەی چنی لە پاش باسی ئەو تەمسیلە فریشتەکە بە ڕۆح و جیسم دەڵێ: بڵێن بزانم کاوەتان لە ئەندازە تێ پەڕی؟ ڕوح و جیسم دەڵێن: هەردووکمان بەرامبەرین. جا فریشتەکە دەڵێ: ئێوە هەردووکتان دەستوور بە گیانی خۆتان داوەو جیسم بۆ گیان وەك ولاّغی سواری وایەو گیان سواریەتی.

ئەنەسی کوڕی ماڵیك ﷺ دەفەرمووێ: لە ڕۆژی قیامەتدا ڕوح و بەدەن کێشەیان دەبێ، بەدەن دەڵێ: من وەکو (با) وابووم، ئەگەر ڕوح نەبوایە پەلەقاژەم بۆ نەدەکرا. ڕوح دەڵێ: منیش وەکو (با) وابووم . ئەگەر بەدەن نەبووایە توانای ئەوەم نەبوو دەست بۆ هیچ کارێك بەرم. جا مەلائیکە وێنەی شەل و کوێرەکەیان بۆ دێنێەوە و وەك یەکیان حیساب دەکەن

## حیکایەتی ئافرەتێکی بێ گوناە

لە ((رشفة الساوی))دا دەفەرمووێ: ڕەیسی کوڕی سولەیمان دەڵێ: جارێك لەگەڵ براکانم و کۆمەڵێك خەڵك دەچوین بۆ حەج. کاتێ گەیشتینە شاری کوفەو چووینە بازاڕ بۆ شت کڕین، بەلای وێرانەیەکدا ڕۆیشتین ئێسترێکی

## دیمەنی مەرگ

تۆپیوی لێ بوو، ئافرەتێکی لیباس شڕی دڕاو چەقۆیەکی بەدەستەوە بوو، لە کەلاکەکەی کوت کوت دەکردو دەی خستە ناو زەمبیلەیەکەوە، گوتم: ئەو ژنە گۆشتی مردارەوەبوو بۆ دەباتەوە، نابێ بێ دەنگ بم.

هیچ عەجایب نیە کە ئەو ژنە کاروان سەردار بێ‌و ئەو گۆشتە حەرامە دەرخواردی موشتەریەکانی بدا؟ بەدزیەوە دوای کەوتم بە جۆرێك نەم بینێ، ژنەکە چوو بۆ بەر دەرگایەکی بەرزی خانووێکی گەورەو لە دەرگای دا، لە ژوورەوە گوتیان کێ یە؟ گوتی: بیکەنەوە منی بەدبەختم. دەرگاکە کرایەوەو چوار کچ هاتنە دەرەوە ئاساری نەگبەتیان پێوە دیار بوو، ژنەکە چووە ژوورەوەو گۆشتەکەی دا بە کچەکان، بەدزیەوە لە درزی دەرگاکەوە دەم ڕوانی، خانووەکە لە ژوورەوە وەك وێرانە وابوو. ژنەکە بە گریانەوە بانگی کچەکانی کردو گوتی: گۆشتەکە لێنێن شوکری خوا بکەن، ئیختیاری بەندەکان بەدەست خوایەو دڵیان لە ژێر قەبزەی قودرەتی ئەودایە. کچەکان گۆشتەکەیان کوت کوت کردو وەسەر ئاگریان نا. بە چاوو پێکەوتنی ئەو دیمەنە زۆر نارەحەت بووم و لە دەرەوەڕا هاوارم کرد. ئەی بەندەی خوا بۆ خاتری خوا ئەو گۆشتە مەخۆ، گوتی: تۆ کێی؟ گوتم: غەریبەم، ئەی ئادەمی نەناسراو! تۆ چیت لە ئێمە دەوێ؟

گوتم: لەلای هێندێك مەجووسی نەبێ گۆشتی مردار لەلای کەسی تر حەڵاڵ نیە. گوتی: ئێمە لە نەجیب زادەی خانەوادەی پێغەمبەرین، باوکی ئەو کچانە زۆر نەجیب بوو، دەی ویست ئەو کچانە بدا بە چەند پیاوێکی نەجیبی وەك خۆی. فریا نەکەوت بە شوویان بداو وەفاتی کرد، میراتەکەی زوو تەواو بوو، ئێمە دەزانین مردارەوەبوو حەرامە، بەڵام زەروورەت حەڵاڵە، چوار ڕۆژە برسیمانە.

ڕەبیع دەفەرمووێ: بە بیستنی داستانی دەردناکی ئەوانە دەستم کرد بە گریان‌و بە نارەحەتی گەڕامەوە بە براکەم گوت: من لە حەج پەشێمان

بوومەوە، زۆرم لەگەڵ خەریك بوو باسی گەورەیی حەجی بۆ کردم دەی گوت: حاجی کە لە حەج گەڕایەوە خوا لە هەموو گوناهەکانی خۆش دەبێ، زۆری لەو بابەتەی گوت: گوتم: بێ دەنگ بە ئەو قسانە مەکە. لیباسەکانمو خاولی ئیحڕامو کەلو پەلی سەفەرو شەش سەد درەمم پێ بوو، چووم بایی سەد درەمم ئاردو سەد درهەم قوماشم کڕیو باقی پارەکەم خستە ناو ئاردەکەوەو بردم بۆ ماڵی پیرێژنەکە، ژنەکە شوکری خوای کردو گوتی: ئەی کوڕی سولەیمان بڕۆ خوا لە تەواوی گوناهی ڕابردووو داهاتووت خۆش بێو سەوابی حەجت پێ ببەخشێو بتباتە بە هەشتو پاداشتێکت بداتەوە بە چاوی خۆت بیبینی. کچە گەورەکەیان گوتی:خوا دوو بەرامبەر پاداشتت بداتەوە، دووەمیان گوتی: خوا زۆر زیاتر لەوەت بداتەوە کە دات بە ئێمە. سێ یەمەکەیان گوتی: خوا لە ڕۆژی قیامەتدا لەگەڵ بابە گەورەی ئێمە حەشرت بکا. چوارەمەکەیان گوتی: کە لە هەموان چوکەتر بوو، ئەی خوای گەورە ئەوەی چاکەی لەگەڵ ئێمە کرد زوو پاداشتی بدەوەو لە گوناهی ڕابردووی و ئایندەی ببەخشە.

ڕەبیع دەفەرمووێ: کاروانی حەجاج وەڕێکەوتو من ناچار لە کوفە مامەوە تا حاجی دەگەڕێنەوە، کاتێ گەڕانەوە گوتم: با بچم بە پیریانەوەو داوای دۆعای بەخێریان لێ بکەم. وەختێك چاوم بە کاروانێکی حاجیان کەوت لەبەر ئەوەی خۆم نەچووبووم بۆ حەج فرمێسکم هاتنە خوارەوە، کاتێ مولاقاتم کردن گوتم: خوا حەجتان قبوڵ کاو پاداشتی خەرجیەکەتان بداتەوە کە لەو ڕێگایەدا کردووتانە. یەکیان گوتی: لەو دۆعایەدا مەبەستت چیە؟ گوتم: ئەوە دۆعای کەسێکە کە لە سەعادەتی حەج کردن بێ بەش بووە، گوتیان: زۆر عەجایبە کە دەڵێی نەچووم بۆ حەج، ئایا تۆ لە دەشتی عەرافات لەگەڵ ئێمە نەبووی؟ لەگەڵ ئێمە ڕەجمی شەیتانت نەکرد؟ لەگەڵ ئێمە تەوافت نەکرد؟ لەوکاتە دا کاروانی شارەکەی خۆمان پەیدا بوو، بە هاوشاریەکانم گوت: خوا ڕەنجتان بە زایع نەدا، ئەوانیش دووبارە گوتیان: تۆ لە عەرەفات

لەگەڵ ئێمە نەبووی؟ ڕەجمی شەیتانت لەگەڵ نەکردین؟ ئێستا چۆن ئینکاری دەکەی؟ یەکیان هاتە پیشەوەو گوتی: برادەر بۆ دەڵێی نەهاتووم چ خەبەرە؟ ئاخر تۆ لە ((مەککە)) و ((مەدینە))لەگەڵ ئێمە نەبووی؟ کاتێ لە زیارەتی قەبری حەزرەت ﷺ لە دەرگای جوبرەئیلەوە هاتینە دەرەوەو لەبەر هوجومی خەڵك تۆ ئەو کیسەت بە ئەمانەت لای ئێمە دانا کە لەسەری مۆرکرابوو ((من عاملنا ربح)) ئەوەی موعامەلی لەگەڵ ئێمەدا بکا قازانج دەکا. ئەوە کیسەکەت. دەڵێ: ((واللە هی)) قەتم ئەو کیسە نەدی بوو، وەرم گرت و چوومەوە نوێژی عیشام کردو وێردو ئەوڕادم تەواو کرد، شەو تا بەیانی بیرم دەکردەوە دەم گوت: ئاخر ئەوە چیە؟ لەو بیرکردنەوەدا خەو بردمیەوە، لە خەوەکەدا بە خزمەت حەزرەت ﷺ گەیشتم سەلامم کردو دەستم ماچ کرد، لە کاتێکدا زەردەخەنەی لەسەر لێوان بوو جوابی سەلامەکەی دامەوەو فەرمووی:

ئەی ڕەبیع! ئاخر ئێمە چەند شاهێدیت بۆ بێنین شاهێدی بدەن کە تۆ حەجت کردووە؟ تۆ کە بە قسەی خەڵك باوەڕ ناکەی گوێ بگرە قەزیەکە ئاوایە، کە کاتێ تۆ لە حەجەکەت پەشێمان بویەوەو پارەو کەل و پەلی حەجەکەت بەخێردا بەو ئافرەتە کە لە ئەولادی من بوو، داوام لە خوای تەعالا کرد پاداشتت بداتەوە، خوا مەلائیکەتێکی بە وێنەی تۆ خەڵق کردو ئەمری پێ کرد هەموو ساڵێك تا ڕۆژی قیامەت لەباتی تۆ حەجت بۆ بکاو لە دنیاشدا ئەو پاداشتەی دا بەتۆ کە لەباتی شەش سەد درهەم شەش سەد دیناری بۆ ناردی، چاوت ڕووناك. جا حەزرەت ﷺ ئەو کەلیمەیەی فەرموو: ((من عاملنا ربح)).

ڕەبیع دەفەرمووێ: کە لەخەو وەخەبەر هاتم کیسەکەم کردەوە تەماشام کرد شەش سەد سکەی تەلای تێدا بوو.

## حیکایەتی پاشای خێر خوازان

((ابن عەباس)) نەقڵ دەکا کە جارێك حەزرەتی حەسەن‌و حوسەین زۆر نەخۆش بوون، حەزرەتی عەلی‌و حەزرتەی فاتمە لەسەر خۆیان نەزر کرد کە ئەگەر حەسەن‌و حوسەین چاك وەبن لە شوکردانەدا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بن. لە سایەی خواوە چاك بوونەوە. حەزرەتی عەلی‌و حەزرەتی فاتمە دەستیان کرد بە ڕۆژوو گرتنەکە، لە کاتێکدا هیچیان بۆ بەربانگ‌و پارشێو نەبوو لەگەڵ ئەوەشدا هەر بەڕۆژوو بوون. بەیانی حەزرەتی عەلی چوو بۆ لای جوولەکەیەك ناوی ((شەمعون) بوو، داوای لێ کرد نەختێکیان خوری بداتێ تا کچی پێغەمبەر ﷺ بەکریێ بۆی بڕێسێ.

شەمعوون بوخچەیەکی خوری دایە کە بە سێ ساع ((جۆ)) بڕێسێ. حەزرەتی فتمە ئەو ڕۆژە سێ یەکی ڕست‌و ساعێکی جۆ وەرگرت‌و کردی بە ئاردوو کردی بە پێنج نان. یەك بۆ خۆی. یەك بۆ حەزرەتی عەلی. یەك بۆ حەسەن‌و یەك بۆ حوسەین‌و یەك بۆ کەنیزەکەکەی کە ناوی ((فضە)) بوو.

کاتێ حەزرەتی لە دوای نوێژی مەغریب لە مزگەوت هاتەوەو سفرەیان ڕاخست، خەریك بوو دەست بەرێ پارویێك بکا، یەکێك لە دەرگای داو گوتی: ئەی ئەهل‌و بەیتی محمد گەداو مسکینم خواردنێکم بدەنێ. خوا لە سفرەی جەننەت خواردنتان بداتەوە حەزرەتی عەلی دەستی کێشایەوەو پرسی بە فاتمە کرد، فاتمە فەرمووی: دەبێ نانەکەی بدەیتێ. حەزرەتی عەلی پێنج نانەکەی دان بە گەداکەو خیان بە برسی مانەوە.

ڕۆژی دووەم حەزرەتی فاتمە سێ یەکی تری خوریەکەی ڕست‌و ساعێکی جۆ وەرگرت‌و کردی بە ئاردو کردی بە پێنج نان. کاتێ حەزرەتی عەلی لە پاش نوێژی مەغریب هاتەوەو سفرەیان هێنا نان بخۆن هەتیوێك لە دەرگای داو گوتی: برسیمە، هەموانیان نانەکەیان دا بە هەتیوەکەو ڕۆژوویان بە ئاو شکاند.

## دیمەنی مەرگ

بەیانی ڕۆژی دوا حەزرەتی فاتمە باقی خوریەکەی ڕستو ساعێکی جۆ وەرگرتو کردی بە ئاردو کردی بە پێنج نانو لە پاش نوێژی مەغریب بۆ نان خواردن دانیشتن. ئەسیرێك تازە ئازاد ببوو، لە دەرگای دا گوتی: زۆر داماوم برسیمە، هەموان نانەکەیان دایە.
ڕۆژی چوارەم هەرچەند بەڕۆژوو نەبوون، بەلاَم هیچ نەبوو بخۆن، حەزرەتی عەلی لەگەڵ کوڕەکەی چوونە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا ئەوەندەیان برسی بوو نەیان دەتوانی بە ڕێگادا بڕۆن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بە چاو پێکەوتنی ەزیەتو ناڕەحەتی تۆ زۆر ناڕەحەت دەبم. با بچین بۆ لای فاتیمە. پێغەمبەر ﷺ لەگەڵیان تەشریفی هات بۆ لای فاتمە، لەوکاتەدا لە نوێژدابوو لە برسان چاوی زەقو سکی تێك قوپاوو. پێغەمبەر ﷺ فاتمەی دەباوەش گرتو بەخۆیەوە کوشیو لەبەر خوا پاڕایەوە. فەرمووی حەزرەتی جوبڕەئیل ئەو ئایەتەی سوورەی ((دهر)) هێنا کە دەفەرمووێ: ﴿ وَيُطْعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ﴿٨﴾ ﴾ الإنسان: واتە خواردنی خۆیان کە پێی موحتاجن دەدەن بە مسکینو هەتیبوو ئەسیر. جوبڕەئیل مژدەی ڕازی بوونی خوای پێ ڕاگەیاندنو پیرۆز بایی لێ کردن. عەلامەی سیوطی لە ((در المنثر))دا لەسەر ڕیوایەتی ((ابن مردویە)) بە نەقڵ لە ((ابن عباس))ەوە دەڵێ: ئەو ئایەتە لەسەر شەڕەفی حەزرەتی عەلیو حەزرەتی فاتمە نازل بووە.

## باسی ژنێکی چاك

لە کتێبی ((روض))دا لە زمان پیاوێکی گەورەدا دەڵێ: جارێك تەوافم دەکرد، لەناکاو کچێکم دی منداڵێکی ساوای بەشانەوە بوو دەی گوت ئەی خوای

ڕەحیم! ئەی خوای کەریم! زەمانی ڕابردووی من موجبی شوکرانەی تۆیە، لێم پرسی ئەوەی لە بەینی تۆو مەولای تۆ ڕوویداوە چیەو چۆنە؟ گوتی: جارێك لەگەڵ جەماعەتێك بازرگان لە کەشتیدا بووم، تۆفان هەستاو کەشتی غەرق بوو، منو ئەو منداڵەمو حەبەشی یەك لەسەر تەختەیەك نەبێ کەس دەرنەچوو.

کە ڕۆژ ڕووناك بووەوە حەبەشی یەکە لەسەر تەختێك بوو، چاوی بە من کەوتو پاڵی بە تەختەکەیەوە ناو هاتە سەر تەختەکەی منو دەستی کرد بە لەخشتە بردنم، گوتم: لە خوا بترسەو بزانە ئێمە لە چ مووسیبەتێك داین؟ ئەگەر بێ ئەمری خواش بکەین زۆر زەحمەتە ڕزگارمان ببێ، جا واوەیلا ئەگەر گوناه بکەین؟

گوتی: ئەو قسانە مەکە، بەخوا ئەو کارەی هەر دەکەم، ئەو منداڵەم لە باوەشدا خەوتبوو لەسەر خۆ نەقورچێکم لێ گرت دەستی کرد بە گریان، بە حەبەشی یەکەم گوت: زۆر باشە تۆزێك سەبر بکە با ئەو منداڵە بنوێنم. ئەوکاتە ئەوەی خوا بۆ منی قەرار دابێ دەبێ، بەزۆر منداڵەکە کە دەگریا لە باوەشیدەرهێنامو خستیە دەریاوە، گوتم: ئەی ئەو زاتەی دەچیتە بەینی ئینسانو ئەوەی لە دڵی دایە، منو ئەو حەبەشی یە لێك دوور خەوە، تۆ توانات بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، گوتی: بەخوا هێشتا قسەکەم تەواو نەکردبوو، جانەوەرێکی زۆر گەورە دەمی کردبووەوە سەری لە دەریا هێنایە دەرێو حەبەشی گرتو بردی و خوا منی لە دەستی نەجات دا، بێ شك خوا قادرە بەسەر هەموو شتێکدا. لە پاشان شەپۆلی دەریا تەختەکەی منی بردە جەزیرەیەكو لە تەختەکە هاتمە خوارێو گوتم: تا خوا بە دادم دەگا لێرەو بە ئاوو گیا ژیان دەبەمە سەر، تەنیا بە خوا دەکرێ ڕزگارم بکا، چوار ڕۆژ تێ پەری، ڕۆژی پێنجەم کەشتی یەکی گەورە لەسەر دەریا وەدیار کەوت، چوومە سەر تەپۆڵکەیەكو سەرپۆشەکەم ڕاوەشاند، کەچاویان پێ کەوتم سێ نەفەریان بە بەلەمی بچووك هاتن، لەگەڵیان ڕۆیشتم، کە تەماشام کرد منداڵەکەم کە حەبەشی یەکە خستبوویە دەریاوە لە باوەشی یەکیاندابوو، هەرکە چاوم پێکەوت پەلامارم داو دەباوەشم گرتو گوتم ئەوە منداڵی منە، ئەوە جگەرگۆشەی منە. گوتیان: ئەوە شێت بووی؟ عەقڵت گۆڕاوە؟ گوتم: نە شێت بوومو نە عەقڵم گۆڕاوە. بەسەرهاتی من زۆر سەیرە، تەواوی

## دیمەنی مەرگ

بەسەرهاتی خۆم بۆ گێڕانەوە، زۆریان لا عەجایب بوو گوتیان: تۆ بەسرهاتێکی عەجایبت گێڕایەوە ئێستا ئێمەش شتێکی ئاوات بۆ دەگێڕینەوە تۆ زۆرت لا عەجایب دەبێ.

ڕۆژێك بە ئارەزوو کەشتیمان لێ دەخوڕی هەوای زۆر سازگار بوو، لەوکاتەدا جانەوەرێك لەدەریا دەرکەوت، منداڵێکی لەسەر پشت بوو، لەو حاڵەدا گوێمان لە دەنگێك بوو گوتی: ئەگەر ئەو منداڵە لەسەر پشتی ئەو جانەوەرە هەڵنەگرن کەشتی یەکەتان غەرق دەبێ یەکمان هەستا چوو ئەو منداڵەی لەسەر پشتی هێناو جانەوەرەکە چوە دەریاوە. بەسەرهاتی تۆو ئەوەی ئێمە زۆر عەجایبە، ئومێدەوارین لەوڕۆ بەدواوە هیچمان تووشی گوناه نەبین ، هەمووانیان تۆبەیان کرد. خوای گەورە چەند میهرەبان و ئاگاداری عەبدو بەندەکان و یارو یاوەری لێ قەوماوانە.

## دەرسی شازدە

## بەسەرهاتی گەنجێکی لەخواترس

دەڵێن لە زەمانی خەلافەتی حەزرەتی عومەردا ﷺ گەنجێکی لە خوا ترس لە مزگەوتێکدا عیبادەتی دەکرد، حەزرەتی عومەر ﷺ لە زۆری عیبادەتی ئەو کوڕە سەرسام مابوو، باوکی کوڕەکە زۆر پیر بوو، کوڕەکە لەپاش نوێژی عیشا خزمەتی باوکی دەکرد، شەوێك لە ڕێگادا ئافرەتێك عاشقی بوو، هەموو شەوێك کوڕەکەی بانگ دەکرد بۆ ماڵەوەو داوای کاری خراپی لێ دەکرد.

خولاسە شەوێك کوڕەکە لەگەڵی ڕۆیی، ژنەکە چوە ژوورەوەو کاتێ کوڕەکە خەریك بوو بچێتە ژوورەوە ئەو ئایەتی سورەی ((اعراف))ی هاتەوە یاد کە دەفەرمووێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ إِذَا مَسَّهُمۡ طَٰٓئِفٞ مِّنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ ﴿٢٠١﴾ ﴾ الأعراف: ٢٠١ واتا بەڕاستی ئەوانەی ئەهلی تەقوان هەر کاتێ شەیتان وەسوەسەی دان گورج یادی خوا دەکەنەوەو خوا فریایان دەکەوێ‌و چاویان دەکرێتەوە.

لەوکاتەدا ئەوەندە لە خوا ترسا بەلادا هات‌و بێهۆش کەوت. کەشەو زۆر درەنگ بوو باوکی زۆری بۆ گەڕا، تەماشای کرد بێ هۆش کەوتووەو هەڵی گرت‌و بردی یەوە ماڵ. کاتێ وەهۆش هاتەوە، باوکی گوتی: ڕاستی بڵێ چیت بەسەر هات؟ کوڕەکە ئایەتەکەی خوێندەوەو وەفاتی کرد. خەڵك شتیان‌و کفن‌و دفنیان کرد، بەیانی ڕۆژی دوایی یەکێك ئەو بەسەرهاتەی بۆ حەزرەتی عومەر ﷺ گێڕایەوە، چوو بۆ سەرە خۆشی بۆ لای باوکەکەی‌و

فەرمووی: بۆچی ئەوکاتە بە منت نەگوت: گوتی: ئەی ئەمیری موسڵمانان! شەو بوو بە باشم نەزانی تۆ زەحمەت بدەم، حەزرەتی عومەر ﷺ فەرمووی: بمبە بۆ سەر قەبرەکەی، کاتێ چوونە سەر قەبرەکەی فەرمووی: وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ﴿٤٦﴾ ئەو ئایەتەی سورەی ((الرحمن)) خوێندەوە کە دەفەرمووێ: ئەوەی لە خوا بترسێ دوو بەهەشتی دەدرێتێ. کورەکە لە گۆڕەکەیدا دووجار گوتی: ئەی عومەر! بێ شك خوا دوو بەهەشتی داومێ.

## گڵ هاوێشتنی فریشتە بۆ لای خەڵك

لە کتێبی ((مسند الفردوس))دا دەڵێ: ئەنەسی کوڕی ماڵك ﷺ ڕیوایەت دەکا کە خوای تەعالا مەلائیکەیەك دەنێری بۆ سەر قەبران، کاتێ جەنازەیەکیان تەسلیم بەخاك کردو گەڕانەوە، ئەو مەلائیکە مستێك خاك هەڵدەگرێ و بەسەر خەڵکەکەیدا هەڵدەداو دەڵێ: بڕۆنەوە بۆ لای دنیاکەتان خوا یادی مردووەکەتان لە لەوحی دڵتاندا دەکوژێنێتەوە. جا ئەوان وا خەریکی کاری دنیایان دەبن و مردووەکە فەرامۆش دەکەن وەك قەت پەیوەندیان بە یەکترەوە لەگەڵ مردووەکە نەبووبێ.

## باسی سێ برا

بینا لەسەر ڕیوایەتی ((ابن عساکر)) سەدەقە کوڕی یەزید لە شاری ((طرابلس)) دا سێ قەبری دی لەسەر سەکۆیەکی بەرز بوون، لەسەر قەبری یەکەمیان نووسرابو، ئەوەی بە یەقین بزانێ ڕۆژێك مەرگ دەگاتە سەری و ولآتمان لێ داگیر دەکاو دەمان خاتە قەبرەوە، ناتوانێ بە ئاسوودەیی بژی.

لەسەر قەبری دووەم نووسرابوو ئەوەی بە یەقینی بزانیٚ لە هەموو زەڕڕەو ئەندامێکی پرسیار دەکرێتەوەو هەموو کردەوەی پاداشتی هەیە ناتوانیٚ بە ڕەحەتی بژی. لەسەر گۆڕی سیٚ یەم نووسرابوو، ئەوەی لیٚ ی یەقین بیٚ کە قەبر جوانیەکەمان لە بەین دەباو وێنەو ئەندامەکانمان وورد دەکا، ناتوانیٚ بە ڕەحەتی بژی. دەڵیٚ: زۆرم لا عەجایب بوو، چوومە ئەو دێیە کە لەویٚ نزیك بوو، لە پیرەمێردێکم لە بارەی ئەو قەبرانەوە پرسی.

گوتی: ئەوە سیٚ برا بوون. یەکیان خزمەتی پاشای دەکردو سەرلەشکر بوو، دووەمیان تاجیرێکی زۆر دەوڵەمەند بوو. سیٚ یەمیان دەروێشێکی فەقیر بوو، شەوو ڕۆژ خەریکی عیبادەت بوو. کاتیٚ وەختی مەرگی دەروێش هات هەردوو براکەی هاتنە لای‌و گوتیان: ئەگەر دەت هەویٚ وەسیەت بکەی ئێستا وەختیەتی. گوتی: نەماڵی دنیام هەیە، نەقەرزداری کەسم، بەڵام دەم هەویٚ کە مردم لەسەر ئەو تەپۆڵکە بمنێژن‌و لەسەر قەبرەکەم بنوسن، کەس ناتوانیٚ بە ڕ ەحەتی بژی، ئەگەر لێی یەقین بیٚ لە ڕۆژی قیامەتدا لە هەموو زەڕڕەیەکی بەدەنی پرسیار دەکریٚ‌و پاداشتی کردەوەی دەخرێتە دەستی.

گوتی: لەپاشان تا سیٚ ڕۆژ وەرن بۆسەر قەبرەکەم، چونکە ئامۆژگاری لیٚ وەردەگرن. لەپاش مردنی هەردوو براکەی سیٚ ڕۆژ چوونە زیارەتی گۆڕەکەی. ڕۆژی سێیەم ئەو برایەی کە سەرلەشکر بوو ویستی بڕوا لەناو قەبرەکەوە گوێی لە ڕوخانی دیوارێك بوو لە ترسان لەرزی‌و بەترسەوە هاتەوە ماڵەوە. شەو براکەی لەخەودا دی، گوتی: براکەم! ئەوە چ دەنگێك بوو؟ گوتی: مەلائیکەیەك هات‌و گوتی: فلاَن ڕۆژە ستەم دیدەیەك کە لای تۆ هاواری کردو فریای نەکەوتی، ئەوەی گوت‌و بە گورزەیەك لێی دام، ئەوە دەنگی ئەو گورزە بوو. بەیانی بازرگانەکەو خزم‌و دۆستانی بانگ کردو گوتی: من لە ناوتاندا نامینێمەوەو کاریشم بە وەزیفەی پاشا نیە، تەرکی دنیای کردو چوو بۆ سەر کێوێك و خەریکی خوا پەرستی بوو.

## دیمەنی مەرگ

لەکاتی سەرە مەرگیدا برا بازرگانەکەی هات و گوتی: براکەم ئەگەر پێت خۆشە زوو وەسیەت بکە. گوتی: نەسەروەتم هەیەو نە قەرزدارم کە مردم لای براکەم بمنێژەو لەسەر قەبرەکەم بنووسە کەس ناتوانێ لە ژیاندا لەحزەیەك ئارام بێ کە یەقینی وابێ مەرگی لە پێشەو ولاتمان داگیر دەکاو دەمان خاتە قەبرەوە. ئەوەشت لەبیر نەچێ لە پاشان سێ ڕۆژ وەرە سەر قەبرەکەم.

لەسەر وەسیەتەکەی سێی ڕۆژ چوە سەر قەبرەکەی ، کاتێ ڕۆژی سێ یەم خەریك بوو وەگەڕێ، لەناو قەبرەکەی گوێی لە دەنگێك بوو زۆر ترساو هاتەوە، شەو لە خەودا براکەی دی لێی پرسی حاڵت چۆنە؟ گوتی: باشم لەبەر ئەوەی تۆبەم کردبوو، خوا لەهەموو گوناهەکانم خۆش بوو. دەڵێ: گوتم. ئەی براکەی دیم چۆنە؟ گوتی: ئەو لەگەڵ پیاو چاکان بەسەر دەباو خاوەن مەقامی بەرزە.ئینجا پرسیم ئەی من چم بەسەر دێ؟ گوتی: هەرکەس پاداشتی ڕەفتاری خۆی وەردەگرێ. تۆ دەبێ بە فرسەتی بزانی و کردەوەی چاك بکەیە زەخیرە بۆ دواڕۆژت.

کە ڕۆژ بووەوە ڕووی لە دنیا وەرگێڕاو هەموو سەروەتەکەی لەناو فەقیرو دەست کورتاندا دابەش کردو باقی تەمەنی خەریکی خوا پەرستی بوو لە کاتی سەرەمەرگدا کوڕەکەی گوتی: بابە گیان! وەسیەت بکە، گوتی: ماڵی دنیام نیە وەسیەت بکەم، بەلاّم کە مردم لای دوو مامەکانت بمنێژەو لەسەر قەبرەکەم بنووسە کەس ناتوانێ لە ژیاندا بە ڕەحەتی بژی، ئەگەر یەقینی وابێ قەبر جوانیەکە لەگەڵ خاك یەکسان دەکاو وێنەو ئەندامەکانی ورد دەکا، گوتی: لەیادت بێ سێ ڕۆژ وەرە سەر قەبرەکەم. کوڕەکە لە پاش مردنی سێ ڕۆژ چوو بۆ سەر قەبرەکەی و ڕۆژی سێ یەم دەنگێکی زۆربەسامی لە قەبرەکەوە بیست، بە غەمناکی گەڕایەوەز شەو باوکی لەخەودا دی دەی گوت: تۆش بەو زووانە دێی بۆ لای ئێمە، ئەسبابی سەفەر

ئامادە بکەو شتی ئەو ماڵەی بۆی دێی پێکەوەنێو وەك ئەهلی دنیا بێ خەیەڵ مەبە، با لەکاتی مەرگدا پەشێمان و شەرمەندە نەبی، زۆر پەلە بکە.

ڕاوی دەڵێ: بەیانی ئەوشەوە چووم بۆ لای خەونەکەی بۆ گێڕامەوە و گوتی: تەنیا سێ مانگ یا سێ ڕۆژم ماوە، چونکە باوکم سێ جار گوتی: پەلە بکە، ڕۆژی سێیەم کەس و کاری کۆکردەوەو لە دوا خواحافیزی ڕووی کردە قیبلەو شادەی هێنا و وەفاتی کرد.

## ئەحواڵی ڕۆژی قیامەت

**پێشەکی:**

هەرچی هاتە دنیاوە دنیایی بەجێ هێشتو ڕێگای ئەو دنیای گرتە بەر، واتە لەپاش تێپەڕبوونی تەمەنی شیوی خەتەرناکی مەرگ دەبڕیٚو دەگاتە بەرزەخ، کە لەوێدا هەم ڕەنجو عەزابو هەم ڕاحەتو ئارام. خولاسە هەرکەسێك دێتە ئەو دنیایە ناچارە ڕۆژێك بڕوا.

کاتێ مەرگ هات هەموو ئەسپابی جوانی بەجێ دەمێنێ. جا هەروەك تەمەنی ئەجیننەو ئینسان ئەندازەیەکی هەیە، تەمەنی ئەو دنیاش دیاری کراوە. کاتێ تەمەنی دنیا تەواوبوون، مەرگ دەگاتە سەری. جا هەروەك بە ڕۆیشتن لەم دنیایە دەڵێن مەرگ، بە نابوودی دنیاش دەڵێن: قیامەت. خوای گەورە فەلسەفەی ژیانو مەرگی ئاوا بەیان کردووە. ژیانو مەرگی خەڵق کردر بۆ تاقی کردنەوە داخۆ کێ لە ئێوە کاری چاك دەکا. واتە زنجیرەی ژیانو مەرگ لەبەر ئەوەیە تا خوای تەعالا کردەوەی ئێوە تاقی بکاتەوەو ببینێ کێ لە ئێوە دەست بۆ کاری خەراپ دەباو کێ کاری چاك دەکا.

خوای تەعالا لە ژیاندا لە پێشەوە فرسەتی کاری چاكو خەراپی داینو بەنیشان دانی ڕێگای ڕاست ئێمەی خستۆتە بەر تیشکی تاقی کردنەوەو ئینجا ژیانی دووەمی بە وجود هێناو بە هۆی پێغەمبەرانەوە بە ئاشکرا باسی کردووەو فەرموویەتی: ئەی ئینسانینە! ئێوە مەحکوم بە مەرگو زیندووبوونەوەی دوا مەرگنو ناچارن لە ڕۆژی قیامەتدا لە حزور خوادا پرسیاری کردەوەتان لێ بکرێ.

لە دوای دەوری بەرزەخ، لە کاتێکدا ژیانێکی تایبەتی درا بە جیسمو خوای تەعالا هەموو مەخلوقاتی بۆ موحاسەبە بانگ کرد، ئەوە ڕۆژی قیامەتە. ژیانی ئێرە لەگەڵ دوو ژیانەکانی تر جیاوازی هەیە، لێرەدا هەموو

کردەوەیـەك بەتاڵـە، واتـا هـیچ کردەوەیـەك نابێتـە هـۆی عـەزاب یـا مـوجبی سەواب، چونکە دەفتەری عەمەلی هەموو ئینسانێك ئەبەستریٚ.

ئەوەی مزگـەوتی درووسـت کردبـیٚ دەڕوخـیٚ، ئـەوەی مـەدرەسـەی درووسـت کردبـیٚ لەگـەڵ خـاك یەکـسان دەکـریٚ. هـەر کتێبێکـی نووسـرابیٚ دەفـەوتیٚ: تـەواوی خـزمو ئـەولادو دۆسـتو قوتـابی لـە جێگایـەك کۆدەبنـەوە. هـەموو ئومێدێکی ئایندە دەپچڕیٚ. هەرچاکەیەك کردبێتی، یان لەبەر وی کرابیٚ، لـە دەفتـەری ئەعمالیـدا نووسـراوە. لـە ڕۆژی قیامەتـدا داواکـارو داوا لیٚ کـراو بـۆ مەحکەمـە لـە حـزور خـوادا ڕادەگیرێـن، چـونکە خـوا نـای هـەویٚ لـە دنیـادا پاداشتی چاکە یان خەراپە بداتەوە بە خەڵك، جا لەبەر ئەوەیە ئینسان تـا لـە دنیـادا بـیٚ خـەریکی ئـەنواعی کردەوەیـەو ژیـان دەباتـە سـەر. لەوانەیـە بـە گەنجی گوناه بکاو ئاخری تۆبە بکاو خوا ڕەحمی وەجۆش بیٚو عەفووی بکا.

## ئەحوالی ڕۆژی قیامەت

## بەکورتی باسی قیامەت

چـل سـاڵ، یـا چـڵ مـانگ یـا چـل حەفتـە، لـە پـاش بـەرپابوونی قیامەتـدا حـەزرەتی ئیسرافیل بۆ یەکـەم جـار فـوو بـە نـەفخی سـووردا دەکـاو دەنگـی ئەوەنـدە وەحـشەتناكو ترسـناك دەبـیٚ کـە هـەموو گیانـداران، ئـادەمیزادو چەڕندەو پەڕندە، واتا تەواوی ئەوانەی لەسەر پشتی زەوی دەژینو ئەوانـەی لـەژێر زەوی دا دەخـزنو ژیـان دەبەنـە سـەر، دەکەونـە تـرسو وەحشەتەوەو دەلەرزن.

ئەندامەکانیان دەلەرزیٚ، ڕەنگی ڕوونیان دەپەڕیٚ، دڵیان زۆر لێدەدا، چاویان قـووڵ دەبـنو لـەو حاڵەتـەدا مـەرگ هـەمووانیان دەگرێتـەوە: ﴿ يَوْمَ تَرْجُفُ ٱلرَّاجِفَةُ ﴿٦﴾ تَتْبَعُهَا ٱلرَّادِفَةُ ﴿٧﴾ قُلُوبٌ يَوْمَئِذٍ وَاجِفَةٌ ﴿٨﴾ أَبْصَـٰرُهَا خَـٰشِعَةٌ ﴿٩﴾ ﴾ النازعـات:

٦ - ٩ وەك لە سورەی ((نازعات)) دا دەفەرمووێ: ڕۆژێکە هەرچی لەبەریدا بێ تەکان دەخواو لە بەین دەچێو لە پاشان دووبارە دەستوور دەدرێ بە ئیسرافیل نەفخی دووەم لێدەداو بەینی ئەو دوو نەفخانە چل ساڵە. بەو نەفخە هەموو گیان لەبەرێك زیندوو دەبێـەوەو دنیایەکی نوێ درووست دەکرێ، لەو ڕۆژەدا چەند دڵێك زۆر دەترسن، چەند چاوێك بە مۆڵەق دەوەستن.

﴿ بِيَدِكَ ٱلْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٦﴾ ﴾ آل عمـــــران: ٢٦ هـــــەر ئـــــەو ئیسرافیلەو هەر ئەو نەفخی سوورەیە کە یەکەم جار دنیا وێران دەکاتەوە.

سووڕەی الحج ئایەی ١٨ ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ ۩ ﴿١٨﴾ ﴾ الحـج: ١٨ وەسووڕەی مائدە ئایەی ١ ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَحْكُمُ مَا يُرِيدُ ﴿١﴾ ﴾ المائـدة: ١ جا ئەو کەسانەی لە دنیای فانیدا بە عەلاوەی تاعەت بێ ئەمری نەفسی خۆشیان کردووە، لەپاش نەفخی سوور بە ئارامو ڕەحەتو بێ ترس و خەتەر بە خۆشی و شادی لە گۆڕدا ڕاست دەبنـەوە﴿ أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ﴾ یـونس: ٦٢ ﴿ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاعِمَةٌ ﴿٨﴾ لِّسَعْيِهَا رَاضِيَةٌ ﴿٩﴾ ﴾ الغاشية: ٨ - ٩ لەوکاتەدا زیندوو دەکرێنەوە دەڵێن: ﴿ قَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرْقَدِنَا ۜ هَٰذَا ﴿٥٢﴾ ﴾ یس: ٥٢ ئەی هاوار بەماڵمان کێ ئێمەی لە جێ خەوەکەمان وەخەبەر هێنا؟

کاتێ هەموو کەس زیندوو کرایەوە دەستە دەستە دەکرێن، مەسیحی بەجیا، کەلیمی بەجیا، خەراپ بەجیا، موسڵمان بە جیا، ئینجا پەیرەوانی پێغەمبەرانیش دەکرێن بە دوو بەش، چاك بەجیاو خەراپ بەجیا، نوێژکەر لە جێگایەك، ڕۆژوو گر لە جێگایەك، ئارەق خۆر بەجیا، حەرام خۆر بەجیا، دز بە جیا، ڕێگر بە جیا خولاسە هەر جۆرە ئینسانێك لە جێگای خۆی

ڕادەگیرێ‌و پاسەوانی خۆیان لەسەرە دەیان بەن بۆ بارەگای خوا. ﴿ يَوْمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ فَتَأْتُونَ أَفْوَاجًا ﴿١٨﴾ ﴾ النبأ: ١٨ لەپاشان ئاسمانەکان شەق دەکرێن تا مەلائیکە دەفتەری ئەعمالی خەڵکبەدەستەوە بگرن‌و بەوێدا بێنە خوارەوە. ﴿ وَفُتِحَتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتْ أَبْوَٰبًا ﴿١٩﴾ ﴾ النبـأ: ١٩ ئـەو قەڵـشینی ئاسمانـەکانیش دەکرێن بـە ڕێگـای چوونە بەهەشت. زانایـانی ئـاینی سـەبەبی لـەت بـوون‌و قەڵشینی ئاسمانەکانیان ئاوا ڕوون کردۆتـەوە، خـوای تـەعالا گـەورەی یـەکی تایبـەتی دەدا بـە عـەرش‌و دێتـە خـوارەوە بـەهۆی بـەرخوردی لەگـەڵ ئاسمانـەکان خـۆی بـۆ ڕانـاگرن‌و شـەق دەبـن. جـا مەلائیکەتـەکان دەفتـەری ئـەعمال دەدەنـەوە بـەو کەسـانە کـە لـە دنیـادا کردویـانن‌و ئاوایـان تەسـلیم دەکەنەوە، لە پێشدا ئـەو دەفتـەری ئەعمالـە دەدەنـە دەسـتی ڕاسـتی ئەوانـەی فەرمانبـەردار بـوون‌و لـە پاشـان دەیـان دەنـە دەسـتی چـەپی ئەوانـەی بـێ ئـەمریان کـردووە. بـە دەسـتەی یەکـەم دەڵـێن﴿ وَأَصْحَٰبُ ٱلْيَمِينِ ﴾ بـە دەسـتەی دووەم دەڵـێن﴿ وَأَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ ﴾ الواقعـة: ٢٧ ﴿ وَأَصْحَٰبُ ٱلْيَمِينِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلْيَمِينِ ﴿٢٧﴾ ﴾﴿ وَأَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ ﴿٤١﴾ ﴾ الواقعة: ٤١ لە جێگایـەکی تـردا لە قورئانی پیرۆزدا ئاوای شەرح داوە، ئەوەی نامـەی ئـەعمالی درایـە دەسـتی ڕاسـت دەڵـێ: بگـرە نامـەی عەمـەلم وەخوێنـە، بەڕاسـتی دەم زانـی حیـسابم چۆنە. لـە ژیـانێکی ڕەزامەندیـدا لـە بەهەشـتی بـەرزدا میـوەی نزیکـی بخـۆو بخۆرەوە بە هۆی ئەوەی لە ڕۆژانی دنیادا ناردووتە.

بۆچـی دەفتـەری ئـەعمالی پیـاو چاکان دەدرێتەدەسـتی ڕاسـت؟ لەبـەر ئـەوەی دەسـتی ڕاسـت لـە دەسـتی چـەپ چاکترەو ئـەوەش مـەعنای وایـە چاکـەی لـە خەراپە زۆرترە،

خـوای گـەورە دەفـەرمووێ: ﴿ فَأَمَّا مَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴿٦﴾ فَهُوَ فِى عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ﴿٧﴾ ﴾ القارعـة: ٦ - ٧. جـا کـاتێ یـەکێك لـە ئـەهلی بەهەشت ئارەزووی بوو بۆ خۆی میوەی بەهەشت بخوا بە بێ ئەوەی بۆی بچنن چۆن دەچێتە دەمیەوە؟ یا دارەکانی بەهەشت گیاندارن‌و ئەگەر گیانداریش بن بێ ئەوەی کابرای بەهەشتی ئیشارەیان بۆ بکاو بانگیان کا بۆ لای خۆی چۆن دەزانن؟

خـوای تـەعالا هێزێکـی تایبـەتی دەدا بـە دانیـشتوانی بەهەشت وەك هێـزی بـەرق‌و توانـای ئیرادەی وەك پلاکـی کارەبـا دەبـێ. هـەروەك کـاتێ ویـستمان ژوورەکـەمان ڕووناك بێ بەهۆی چراوە ڕووناکی دەکەینەوە، هـەروەك بمـان هـەوێ پانکـە هەڵکـەین دەسـت بـە پلاکەکـەی دادێنین. ئـەوانیش هەرچـی ئارەزوو بکەن دەستیان دەکەوێ، تەنیا بە ئارەزوو کردنیان.

ئەو کەسانەی نامەی عەمەلیان دەدرێتە دەستی چەپ بە حەسرەتی زۆرەوە دەڵێن: خۆزگە نامەی ئەعمالیان نەدانیایەوە و لەکردەوەی بەدی خۆمان بێ خەبەر بووینایە. لەبەر ئەوەی بە چاو پێکەوتنی دەفتەری ئەعمالیان کردەوە خراپـەکانیان دەکەوێتـەوە یـادوو عـەزابی ڕوحـی دەکێـشن‌و بـە حەسـرەتەوە دەڵـێن: بریـا نامـەی ئـەعمالم نەدرایـەو نـەم زانیبایـە حیـسابم چیە؟ خۆزگـە لـەدوای مـردنم زینـدوو نەکرامایـەوەو مـاڵ‌و سـامانم سـوودی نـەبوو توانـاو دەسەڵاتیشم نەما.

ئەگەر گوناهکار ئینکاری گوناهەکانیان بکەن لە حزور خوادا چ دەبێ؟

یەکەم: بەچاو پێکەوتنی نامەی ئەعمالیان وەحشت دەیـان گـرێ‌و شـەرمەندە دەبن، چونکە لەگەڵ نامەی عەمەلیان لەکاتی گوناە کردنەکە نیشان دەدرێ، چۆن ئەگەر یەکێك زینا بکا یا دزی بکـاو یـەکێ تـر وێنـەی بگـرێ‌و لای قـازی لە وەختی مەحکەمەدا کابرا ناتوانێ حاشا بکا ئەویش وایە.

دووەم: هەر چاکەو خەراپەیەك لەهەر جێگایەك بکرێ ئەو جێگایە لە بارەگای خوا ئاشکرای دەکا. ﴿ يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا ﴿٤﴾ ﴾ الزلزلة: ٤ ئەوە وەکو ئەوە وایە کە قورئان خوێنێك شریتێك بە غەڵەت پڕ بکاتەوەو لە دوای لێدانەوەی بڵێ: چاك زەبت نەکراوە، ئایا ئەوە خەتای ئەوەیە کە تەسجیلی کردووە؟ یان خۆی خەراپی خوێندووە؟ ئەگەر خۆشی قبوڵی نەکا، خەڵك بە ڕاستگۆی دەزانن؟ بێ گومان نا. جا هەروەها ئەگەر کەسانێك هەر ئینکاری کردەوەکانیان بکەن و بڵێن: ئەوە کردەوەی ئێمە نیە، خوای تەعالا کارێك دەکا زمانیان ببەسترێ.

﴿ ٱلْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَىٰٓ أَفْوَٰهِهِمْ وَتُكَلِّمُنَآ أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٦٥﴾ ﴾ يس: ٦٥ ڕۆژی قیامەت بە ئەندازەی پەنجا هەزار ساڵ درێژ دەبێ ﴿ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ ﴿٤﴾ ﴾ المعارج: ٤ بەڵام خوای تەعالا تەواوی مەخلوقاتی خۆی لەماوەی حەوت هەشت سەعاتدا موحاسەبە دەکاو بە پەرهێزکاران و فەرمانبەرداران و ئەسحابی یەمین دەڵێ: ﴿ يَـٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً ﴿٢٨﴾ فَٱدْخُلِى فِى عِبَـٰدِى ﴿٢٩﴾ وَٱدْخُلِى جَنَّتِى ﴿٣٠﴾ ﴾ الفجر: ٢٦ - ٣٠ ئێستا ئەوان بەرەو بەهەشت دەکەونە ڕێ بەهەشت دەبینن، بەڵام بەڕێگای نازانن. جا دێنە خزمەت ئادەم و عەرزی دەکەن ئەی باوکی ئێمە کارێك بکە ڕێگای بەهەشتمان بۆ بکرێتەوە حەزرەتی ئادەم دەفەرمووێ: من شایستەی ئەوە نیم بچن بۆ لای ئیبراهیم خولاسەی کەلام لە ئاخریدا لەسەر داواکردنی پێغەمبەری خۆمان پردێك لەبەینی بەهەشت و دۆزەخدا دەبەسترێ بەناوی پردی سیراط دەبێ بۆ چوونی بەهەشت بەسەرید بڕۆن و لەو کاتەدا ئیجازە دەدرێ بە پێغەمبەران کە شیفاعەت بۆ ئوممەتەکانیان بکەن. لە پێش هەموانیاندا پێغەمبەری ئێمە بۆ خۆیی و ئۆممەتەکەی دەپارێتەوە . لەو ڕۆژەدا غەیری پێغەمبەران کەس مەجالی

قسەی نیە. پێغەمبەرەکانیش بەزۆری هەر دەڵێن ((اللهم سلم سلم)) واتا ئەی خوایە بەخێرو سەلامەت وەیان پەڕینە. ئەی خوایە تەنیا تۆ دەتوانی وەیان پــەڕێنیو دەیــان پەڕێنیــەوە. جــا ئــەو موســڵمانانەی بــە قــسەی پێغەمبەرەکانیان کردووە لەسەر شەفاعەتی پێغەمبەر هەرکەسە بە گوێرەی کردەوەو دەرەجەی لە پردی سیرات دەپەڕنەوە. بەعزێك لە ماوەی چاو لەسەر نانێكو هێندێك وەکو بەرق (کارەبا) و بەعزێك وەك باڵداران بەسەر پردی سیراتدا دەپەڕنەوە.

(فضیل) کوڕی (عیاض) رضي الله عنه دەفەرمووێ: مەسافەی پردی سیرات سێ هەزار ساڵ ڕێیە. هەزار ساڵ هەورازەو هەزار ساڵ لابەلاو هەزار ساڵ سەرەو خوارە. خولاسە پەڕینەوە بەسەر پردی سیراتدا ئەوەندە خەتەرە تەنانەت پێغەمبەرانیش هەر دەپاڕێنەوە و دەڵێن((اللهم سلم سلم))ئەو خەڵکە لەدوای پەڕینەوە دەستە دەستە دەیان نێرن بۆ بەهەشت. تا ئەوان نزیك دەبنەوە، دەرگــای بەهەشــت دەکرێــەوە تــا فــەوری بــچنە ژوورەوە. فریــشتەکانی دەرگاوانی بەهەشت پێشوازیان دەکەنو سەلامیان عەرز دەکەنو دەڵێن: بەخێر هاتن بۆ هەتا هەتایە بچنە بەهەشتەوە.

## دەرسی حەڤدە

## کاتیٚ خەڵك لەقەبردا زیندو دەکریٚتەوە

ئەبوو لەیسی سەمەرقەندی دەفەرمووێ: کاتیٚ ڕۆژی قیامەت خەڵك لە قەبرەکانیان دیٚنە دەریٚ حەفتا ساڵ ڕادەوەستن کەس موبالاتیان پیٚ ناکا. ئەوەندە دەگرین فرمیٚسکیان تەواو دەبن. لەباتی فرمیٚسك خویٚن دەباریٚنن. لەپاشان بانگیان دەکەن بۆ مەیدانی مەحشەرو مەلائیکە لە ئاسمانەکان دەست دەکەن بە هاتنە خوارەوە مەلائیکەی هەر ئاسمانیٚك بەسەف لە پاش مەلائیکەی ئاسمانەکەی تر ڕادەوەستن. جا ئەوەیە کە خوای گەورە لە سورەی ((فرقان)) دا دەفەرمووێ: ﴿ وَيَوْمَ تَشَقَّقُ ٱلسَّمَآءُ بِٱلْغَمَٰمِ وَنُزِّلَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ تَنزِيلًا ﴿٢٥﴾ ٱلْمُلْكُ يَوْمَئِذٍ ٱلْحَقُّ لِلرَّحْمَٰنِ ۚ وَكَانَ يَوْمًا عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ عَسِيرًا ﴿٢٦﴾ وَيَوْمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيْهِ يَقُولُ يَٰلَيْتَنِى ٱتَّخَذْتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلًا ﴿٢٧﴾ يَٰوَيْلَتَىٰ لَيْتَنِى لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا ﴿٢٨﴾ لَّقَدْ أَضَلَّنِى عَنِ ٱلذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَآءَنِى ۗ وَكَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ لِلْإِنسَٰنِ خَذُولًا ﴿٢٩﴾ ﴾ الفرقان: ٢٥ - ٢٩ فەرمووی لەوکاتەدا خوای تەعالا دەفەرمووێ: ئەی ئەجیننەو ئینسان! لە دنیادا ئامۆژگاریم کردبوون، ئیمڕۆ ئەوە کردەوەکانتان هاتوونە لاتان. جا ئەوەی لە نامەی عەمەلیدا چاکە ببینیٚ ئەوە شوکرانەی خوا دەکاو ئەوەی چاکەش نەبینیٚ، لۆمەی خۆی دەکا. لەپاشان خوای تەعالا دەستوور دەدا عەزاب دیٚنە پیشەوە، کە بەچاو پیٚکەوتنی هەموو کەس ئەژنۆی دەشکیٚ. خوای گەورە لە سوورەی ((جاثیە)) دا ئاوای باس دەکاو دەفەرمووێ: پاشایەتی ئاسمانو زەوی هەر بۆ خوایەو لە ڕۆژی قیامەتدا خراپەکار زەرەر دەکەنو دەبینیٚ هەموو نەتەوەیەك بەچۆکدا هاتووەو بانگ دەکریٚ بۆ وەرگرتنی نامەی عەمەلو جەزای کردەوەت لەو ڕۆژەوە دەدریٚتەوە. جا ئەوانەی ئیمانیان هیٚنا بوو کاری چاکیان کردبوو، خوای گەورە دەیا باتە ژیٚر سیٚبەری ڕەحمەتی خۆیو

ئەوەیە بە ئارەزوو گەویشتن، بەلاّم کافرەکان دەڵێن: ئایا ئایەتیان بۆ نەخوێندنەوەو سەرکەشیتان کردو گومڕاو موجریم بوون‌و خراپەکەیان چاو پێدەکەوێتەوەو ئەوەی گاڵتەیان پێ دەکرد دەورەیان دەداو پێیان دەگوترێ: هەروەك ڕۆژی خۆی ئێمەتان لەبیر دەبردەوە، ئێمڕۆ لە بیرتان دەبەینەوەو جێگاتان دۆزەخەو کەس فریاتان ناکەوێ، لە تۆڵەی ئەوەدا کە گاڵتەتان بە ئایەتی قورئان دەکردو دنیا تەفرەی دابوون.

ئیمڕۆ ڕزگارتان نابێ عوزرتان لێ وەرناگیرێ. لە پاشان ئەمر دەکرێ بە گیان لەبەران ببنەوە بە خاك. جا لەوکاتەدا کافرەکان دەڵێن ﴿ ٱلْكَافِرُ يَٰلَيْتَنِى كُنتُ تُرَٰبًۢا ﴿٤٠﴾ ﴾ النبأ: ٤٠ واتە خۆزگە دەبوومەوە بە خاك؟ لە حەدیسێکی کەدا حەزرەت ﷺ فەرموویەتی: لە مەیدانی مەحشەردا خەڵك وەك چۆن بە ڕووتی لەدایك دەبن ئاوا بەڕووتی دەوەستن. حەزرەتی عایشە رضی الله عنها عەرزی کرد یا ڕەسول الله! کاتێ ئەوان خۆیان بە ڕووتی دەبینن دەبێ چەند خەجاڵەت بن؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:لەو ڕۆژەدا خەڵك ئەوەندە ناڕەحەت هۆشی تەماشاکردنی یەکتریان نیە، هەموویان هەر تەماشای لای سەرەوە دەکەن، هەرکەسەی بە ئەندازەی گوناهەکانی لە ئارەقدا غەرق بووە.

ئیوایە تاقاپانی، ئیوایە تا ئەژنۆیانی، ئیوایە تا ملی لە ئارەقی خۆیدا غەرق بووە. مەلائیکە بەدەوری عەرشی خوادا سەف دەبەستن. ئینجا یەك یەك خەڵك بانگ دەکەن، ئەوەی ناویان برد لەناو خەڵکەکە دێتە دەرێ‌و دێتە پێشەوە، کاتێ هێنایانە عوزور خوا، بانگ دەکەن کێ حەقی لەسەر فلاّن کەسە با بێتە پێشەوە، یەکە یەکە ناوی ئەو کەسانە دەخوێننەوە کە داوای لێ دەکەن، یان زوڵمی لێ کردوون‌و حەقی ئەوانە لە چاکەکانی ئەو دەدەنەوەو ئەگەر چاکەشی نەبوو، گوناهی ئەوان لەسەر ئەم دەنووسن، جا لەو کاتەدا پێی دەڵێن: دەبڕۆ دەباوەشی دایکتەوە هاوڕی یە.

لەبەر سەختی موحاسەبە هیچ مەلائیکەیەك و پێغەمبەرێك نیە کە نەترسێ. مەگەر ئەو کەسانە کە خوای تەعالا ئاگاداریان بکا. ئینجا هەموو کەس لە چوار شت پرسیاری لێ دەکرێ. تەمەنی لە چ کارێکدا بردووتە سەر. ئەندامەکانی لە چ کارێکدا بەکاری هێناوە. پارەی چۆن پەیدا کردووەو چۆن سەرفی کردوووە؟

عەکرمە رضي الله عنه دەڵێ: لەو ڕۆژەدا باوك وە کوڕی خۆێ دەڵێ: من باوکی تۆم تۆ قەرزاری منی کوڕەکە ئیعتیراف بە چاکەکانی باوکی دەکا و باوکە کە دەڵێ: من تەنها پێویستیم بە ئەندازەی مسقاڵە زەڕڕەیەك بە چاکەی تۆیە، بەڵکو بەخۆی ئەو نەختە چاکەی تۆوە لینگە تەرازووی کردەوەی چاکم بێتە خوارێ. کوڕەکە دەڵێ: باوکە خۆشم بەو موسیبەتەوە گرفتارم نازانم چ بەڵایەکم بەسەر دێ؟ بەداخەوە ناتوانم چووکترین کردەوەی چاکی خۆمت بدەمێ. ئینجا کابرا ئەو چاکانەی کە لەگەڵ ژنەکەیدا کردبووی بە ڕوویدا دەداتەوە داوای خێرێکی لێ دەکا. ئەویش هیچی ناداتێ. جا ئەوەیە کە خوای تەعالا لە ئایەتی سووڕەی ((فاطر)) دا دەفەرمووێ: ﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ وَإِن تَدْعُ مُثْقَلَةٌ إِلَىٰ حِمْلِهَا لَا يُحْمَلْ مِنْهُ شَيْءٌ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰٓ ﴿١٨﴾ ﴾ فاطر: ١٨ وە لە سوڕەی ((عبس)) لەبارەی ڕۆژی قیامەتدا دەفەرمووێ: ﴿ فَإِذَا جَآءَتِ ٱلصَّآخَّةُ ﴿٣٣﴾ يَوْمَ يَفِرُّ ٱلْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ ﴿٣٤﴾ وَأُمِّهِۦ وَأَبِيهِ ﴿٣٥﴾ وَصَٰحِبَتِهِۦ وَبَنِيهِ ﴿٣٦﴾ لِكُلِّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ ﴿٣٧﴾ ﴾ عبس: ٣٣ - ٣٧ لەبارەی تەفسیری ئەو ئایەتانەدا و ((قوتادە)) فەرموویەتی : لەڕۆژی قیامەتدا پیاو بەوە زۆر نارەحەتە کە چاوی بە دۆستێك بکەوێ، دەڵێ: نەبادا داوای شتێکم لێ بکا. خوای تەعالا لە قورئانی پیرۆزدا بەچەند جۆر باسی ڕۆژی قیامەتی کردووە. بۆ وێنە لە رکوعی شەشی سوڕەی ((بقرە)) دا دەفەرمووێ: ﴿ وَٱتَّقُواْ يَوْمًا لَّا

تَجۡزِي نَفۡسٌ عَن نَّفۡسٖ شَيۡـٔٗا ﴿٤٨﴾ ﴾ البقرة: ٤٨ لەو ئایەتە شەریفەدا تەواوی ڕێگای یارمەتی بەستراوە، چونکە تۆ هەر لە چوار ڕێگاوە دەتوانی یارمەتی بدەی.

یەکەم: یەکێك خەریك بێ زەرەرت پێ بگەیەنێ‌و بە زۆرو توانا مەنعی بکەی.

دووەم: پێش بە عەزابەکە بگری.یان بە پادشتی ماڵی یا گیانی مەنعی بکەی کە لە ئایاتەکەدا هەر چواری مەنع کرد. دەبێ ئەوە بزانین کە هیچ پێغەمبەرێك یا وەلی یەك یا فریشتەیەك ناتوانێ عەزاب لەسەر کافر لابا. لەبارەی موسڵمانی گونە کاریشەوە ئایەت‌و حەدیسی زۆر هەیە کە ماوەیەکی دیاری کراو عەزاب دەدرێن‌و لەپاشان شیفاعەتیان بۆ دەکرێ. هەر وەك لە سوورەی ((طـه))دا دەفەرمووێ: ﴿ يَوۡمَئِذٖ لَّا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ إِلَّا مَنۡ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَرَضِيَ لَهُۥ قَوۡلٗا ﴿١٠٩﴾ ﴾ طـه: ١٠٩ بەلام کەس نازانێ داخۆ ئەنبیا و ئەولیا ئیجازەی شەفاعەتی کێ یان پێیە؟ هەرچەند هەموو کەس دەبێ ئومێدی بە کەرەمی خوا بێ بەلام لەبەر ئەوەی کەس لێی یەقین نیە، ناخۆشترین ڕۆژ ڕۆژی موحاسەبەیە، دەبێ بۆ بەرگری لە ناخۆشی ئەو ڕۆژە ئەوەی بۆت دەکرێ لە دنیادا بیکەی، دیارە خێرو سەدەقە دەورێکی تایبەتی هەیە. لەوبابەتەوە پێغەمبەر فەرموویەتی: خۆتان لە ئاگری دۆزەخ بپارێزن با بەنیو دەنکە خورماش بێ. لە ((اتحاف)) دا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: چۆن ئاگر بە ئاو دەکوژێتەوە ئاواش سەدەقە گوناهان لە بەین دەبا و لە ڕۆژی قیامەتدا هەر کەسە لە ژێر سێبەری سەدەقەی خۆیدا ڕادەوەستێ. لەو ڕۆژەدا کە خەڵك لەبەر گەرمای زۆر غەرقی عەرەقن تا سەدەقەت زۆرتر بێ سێبەری زۆرترە.

لە میشکاتدا دەفەرمووێ: حەزرەت ﷺ فەرموویەت: سەدەقە پێشی قەهرو غەزەبی خوا دەگرێ‌و دەبێتە هۆی دەفعی سووئی خاتیمە. لە ((احیا)) دا دەفەرمووێ: حەزرەتی لوقمان وەسیەتی بۆ کوورەکەی کردو گوتی: هەرکاتێ خەتایەکت کرد سەدەقەیەك بکە.

مەشهورە کە جارێك خوای تەعالا ئافرەتێکی خەراپی بە هۆی ئاودان بە سەگێکی تینووەوە بەخشی‌و لە گوناهانی خۆش بوو.

لە ئیحیادا لە عوبەیدی کوڕی عومەیری ڕیوایەت دەکاو دەڵێ: لە مەیدانی مەحشەردا خەڵك زۆر برسی‌و تینوو ڕووت‌و قوت دەبن، بەلاّم ئەوەی لەبەررازی خوا برسیەکی تێرکردبێ خوا تێری دەکا. لەبەر خوا تینووێکی ئاودابێ لەو ڕۆژەدا خوا تێراوی دەکا. ئەوەی لە دنیادا لەبەر ڕەزای خوا لیباسی دابێ بە یەکێك لەو ڕۆژەدا لیباسی دەداتێ. لە ڕۆژی قیامەتدا کاتێ ئەهلی دۆزەخ بە ئەمری خوا بە سەف ڕادەوەستن‌و یەکێ لە ئەولیای خوا بە لایاندا دەڕوا یەکیان دەڵێ: لای خوا شەفاعەتم بۆ بکە، ئەولیاکە دەڵێ: تۆ کێی؟ دۆزەخیەکە دەڵێ: تۆ من ناناسی فلان کاتە لە دنیا ئاوم دا بەتۆ.

لە حەدیسێکی تردا دەفەرمووێ: لە ڕۆژی قیامەتدا کاتێ ئەهلی بەهەشت‌و ئەهلی دۆزەخ بە سەف ڕادەوەستن، یەکێ لە جەهەننەمیەکان چاوی بە یەکێك لە بەهەشتی یەکان دەکەوێ‌و وە یادی دەخاتەوە کە من لە دنیادا فلاّن چاکەم لەگەڵ کردی، ئەویش دەستی دەگرێ‌و دەی با بۆ بارەگای خوا! عەرزی دەکا ئەی خوایە! ئەو پیاوە لە فلاّن جێگا چاکەی لەگەڵ کردم، خوا دەی بەخشێ.

لە حەدیسێکی دی دا هاتووە لە ڕۆژی قیامەتدا بانگ دەکرێ ئەی فەقیرانی ئوممەتی محمدی لە کوێن؟ هەستن لە مەیدانی مەحشەردا بگەڕێن. ئەوەی لە دنیادا بۆ ڕەزای خوا پاروەە نانێکی یا پیاڵە ئاوێکی یا لیباسێکی داوە بە

ئێوە، دەستی بگرن و بی بەن بۆ بەهەشت. بە بیستنی ئو ئیعلامیەو ئاگاداریە، تەواوی فەقیرانی ئوممەتی پێغەمبەر هەڵدەستن، یەک یەک دەستیان دەگرن و دەیان بەن بۆ بەهەشت. لە حەدیسێکی دی دا هاتووە کە لە ڕۆژی قیامەتدا جارچی جاڕ دەداو دەڵێ: لە کوێن ئەو کەسانەی چاکەیان لەگەڵ مسکین و فەقیراندا دەکرد؟ وەرن بەبێ ترس و غەم بڕۆن بۆ بەهەشت. ئەوەی لە دنیادا یەکێکی لە مووسیبەتێك ڕزگار کردبێ، خوا لەو ڕۆژەدا مووسیبەتێکی لەسەر لا دەبا. ئەوەی چاوپۆشی لە گوناهی موسڵمانێك کردبێ، خوا لەو ڕۆژەدا چاوپۆشی لێ دەکا. ئەوەی یارمەتی برسی یەکی بێ چارەی دابێ، خوا لە ڕۆژێکدا پایەداری دەکا کە کێو لەو ڕۆژەدا خۆی بە پێوە ڕاناگرێ.

## ڕۆژی قیامەت دەبێتە ڕۆژی جەزا

حەزرەتی عایشە رضی الله عنها دەفەرمووێ: پیاوێك هات خزمەت پێغەمبەر ﷺ وە عەرزی کرد ئەی پێغەمبەری خوا! من غولامم زۆرن درۆم لەگەڵ دەکەن، خیانەت دەکەن، بێ ئەمریم دەکەن، منیش لێیان دەدەم و قسەی ناشرینیان پێ دەڵێم، لە ڕۆژی قیامەتدا چۆنم موعامەلە لەگەڵ دەکرێتەوە؟

حەزرەت ﷺ فەرمووی:

لە ڕۆژی قیامەتدا درۆ و خیانەت و بێ ئەمری ئەوان و قسەو توڕەبوونەکەی تۆ وەزن دەکرێ، ئەگەر خەراپی ئەوان لە قسەکانی تۆ زۆرتربوو، ئەوە تۆڵەت بۆ دەکرێتەوە، ئەگەر تووڕەبوون و قسەکانی تۆش زیاتربوو، ئەوە تۆڵەت لێ دەکەنەوە. ئایا ئێوە ئەو ئایەتەی سوڕەی ((انبیا)) تان نەخوێندۆتەوە کە دەفەرمووێ ﴿ وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ (٤٧) ﴾ الأنبياء: ٤٧ ئەو

ئایەتەو چەندین ئایەتو حەدیسی دی لەسەر سەختی حیسابی ڕۆژی قیامەت هاتوون کە لێرەدا باس کردنیان زۆر دەخایەنێ. با تا فرسەت لە دەست دایە خۆمان بۆ ئەو ڕۆژە ئامادە بکەین، چونکە ئەگەر فرسەت لە دەست چوو پەشێمانی نەبێ هیچمان لە دەست نایە

**شەفاعەت لە مەیدانی مەحشەردا**

پێغەمبەر ﷺ لە دەدیسێکدا دەفەرمووێ: زۆرتر لە لای فەقیران دانیشەو خزمەتیان بکە، چونکە فەقیر زۆر دەوڵەمەندن. یەکێ عەرزی کرد ئەی رەسولی خوا! دەوڵەمەندی یەکەیان چیە؟ فەرمووی: لە ڕۆژی قیامەتدا پێیان دەگوترێ هەڵسن دەستی ئەو کەسانە بگرن کە لە دنیادا پاروە نانێکیان داونێ، یا چۆرە ئاوێك، یان لیباسیان بۆ کردوونو بیان بەن بۆ بەهەشت.

لە ((کەنز))ا دەفەرمووێ: ئەوەی گیاندارێکی برسی تێربکا خوای تەعالا لەباشترین خواردنی بە هەشت تێری دەکا. دەفەرمووێ: لە هەرماڵێکدا خواردن بەخێر بدرێ بە خەڵك، خێرو بەرەکەت بە پەلە ڕوو دەکاتە ئەو ماڵە. ((عبدالله))ی کوری موبارەك رحمە الله کە خەڵکی بانگ کرد بۆ خورما خواردن دەی فەرموو: ئەوەی دەنکێك زیاتر بخوا درەمێکی زیاتر دەدرێتێ.

لە ڕۆژی قیامەتدا مەلائیکەیەك جار دەدا کوا ئەوانەی ئەحواڵ پرسی غەریبانو فەقیرانیان دەکرد با بێن لەسەر مینبەری نوور دانیشن و لە خزمەت خوادا قسە بکەن، لەکاتێکدا خەڵك زۆر نارەحەتە. لە فرمایشتێکی تردا دەفەرمووێ: زۆر حۆری بەهەشت، حەقە مارەییەکەیان مستێك خورما، یان شتێکی ترە کە دەدرێ بە فەقیرانر. دەفەرمووێ: هیچ سەدەقەیەك لە تێرکردنی برسی یەك باشتر نیە. ئەوەی کە بەبێ شك دەبێتە هۆی لێ خۆش بوون، تێرکردنی برسی یانە. لە حەدیسێکی دی دا دەفەرمووێ: لە لای خوا

خۆشەویستترین کردەوە ڕازی کردنی یەك نەفەر موسڵمان یان لا بردنی غەمێکی، یان قەرز بۆ دانەوەی یان کە برسی بوو تێریکەی.

## شادیو نا شادی

لە ڕۆژی مەحشەردا هەموو کۆدەبنەوە. لە ڕۆژی مەحشەردا ناوچەوانی پیاو چاکان شادو خەندانو ناو چاوانی کافرو بێ دینان گرژو نائومێد دەبن. خوای تەعالا لە سووڕەی ((ال عمران))دا دەفەرمووێ: ڕۆژی حەشر ڕۆژێکە چەند ڕوو لەو ڕۆژەدا سپی دەبنو چەندیش ڕەش دەبن. بەوانەی ڕوویان ڕەش بووە دەڵێن: ئایا لە دوای ئیمان هێنان خۆتان کافر کرد، دە بیچێژن عەزاب بەهۆی خۆ کافرکردنتانەوە، بەلاّم ئەوانەی ڕوویان سپی یە ئەوان لە ژێر سێبەری ڕەحمەتی خوادان هەتا هەتایە.

وەلە سووڕەی ((عبس))دا دەفەرمووێ: چەند دەمو چاوێك لەو ڕۆژەدا تاریك و تۆزاوین بەهۆی کوفرو بێ ئیمانیانەوە، بەلاّم لەو ڕۆژەدا ناو چاوانی پیاو چاکان بە هۆی ئیمانو کردەوەی چاکەوە وەك ڕۆژ ڕووناك دەبێو ئاساری خۆشیو شادیان بە ناوچەوانەوە دیارە. بەلاّم ئەوانەی لە دنیادا خۆیان لەبیر خۆیان بردوەتەوەو لە نووری ئیمانو کردەوەی چاکە دووری یان کردو پەنایان بردە بەر تاریکی کوفرو فیسقو فجورو نامەردی، ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا ڕوو ڕەش دەبنو زۆر بە زەلیلیو پەشێمانیەوە حەشریان دەکرێو بە هۆی کردەوەی خراپیانەوە زۆر ناڕەحەت دەبنو لە حاڵی ترسو وەحشەتدا بیردەکەنەوە کە بەو زووانە تووشی ئافرەتێکی گەورە دەبن.

حەزرەت ﷺ فەرمووی: لە ڕۆژی قیامەتد حەزرەتی ئیبراهیە علیە سلام تووشی باوکی ئازەر دەبێ ناوچەوانی ڕەشو تۆزاوی دەبێ. بە باوکی دەڵێ:

من پێم نەگوتی بێ ئەمری خوا مەکە؟ دەڵێ: ئیمڕۆ بە قسەت دەکەم. لە پاشان حەزرەتی ئیبراهیم عەرزی بارەگای ئەقدەس دەکاو دەڵێ: خوایە! تۆ قەولت پێ دابووم کە لە ڕۆژی قیامەتدا ڕیسوام نەکەی، جا ڕیسوایی لەوە گەورەتر چ دەبێ کە باوکم ئەوا بەهیلاك دەچێ. خوا دەفەرمووێ: من بەهەشتم لە کافران حەرام کردووە.

ئینجا خوا لە ئیبراهیم دەپرسێ ئەوە چیە لەبەر پێت دایە؟ حەزرەتی ئیبراهیم تەماشا دەکا چاوی بە وێنەیەکی خوێناوی دەکەوێ، ئینجا مەلائیکە قاچی وێنە خوێناویەکە دەگرن‌و دەی خەنە دۆزەخەوە. خوای تەعالا ئازەر دەباتە سەر وێنەی خوێناوی، تا حەزرەتی ئیبراهیم هەست بە ڕیسوایی نەکاو بە چاو پێکەوتنی باوکی دڵی نەسووتێ.

ئەی خوای گەورە! باوکی چ کەسێك دوچاری ئەو ئەنجامە نافەرجامە بوو؟ باوکی حەزرەتی ئیبڕاهیم کە باوکی پێغەمبەران‌و دۆستی خوایەو ئەو کەسەیە کە خوا ئەمری کرد بە پێغەمبەر کە وەدوای حەزرەتی ئیبڕاهیم کەوێ‌و ئەو کەسەیە کە ماڵی کەعبەی درووست کرد، کەچی شەفاعەتی بۆ باوکە کافرەکەی قبوڵ نەکرا.

لە کوێن ئەو کەسانە فەخر بە خزمایەتی پیاوانی گەورەی ئایینەوە دەکەن‌و لەگەڵ کردەوەی بەدی خۆیان لایان وایە خزمایەتی پیاوی چاك ڕزگاریان دەکا؟ وانیە حەزرەتی ئیبراهیم ئازەری باوکی بۆ ڕزگار نەکرا.

## دەرسی هەژدە

## باسی حیسابو وەزنی ئەعمال

لە ڕۆژی قیامەتدا لە پێشدا حیسابی نوێژکردن لەگەڵ موسلماناندا دەکەن داخۆ ئەو موسلمانە چەند نوێژی کردووەو چەندی چواندووە. لە چەند نوێژدا تەواوی ئادابیی زاهیریو باتینیو چەند ئەرکانی ئیسلامی بەجێ گەیاندووەو چەندی نوێژی سوونەت کردووە. ئەگەر نوێژی فەرزی تەرك کردبێ لە باتی هەر فەرزێك حەفتا سوونەتی لێ کەم دەکەنەوە. نوێژ دێتە سەر وێنەی ئینسان. ئەو نوێژانەی کە بەبێ خضوعو خشوعو بێ موبالات کرابن وەك ئینسانی بێ دەستو پێو ئەوانەی تەواویش ئەنجام درابن زۆر جوانو ڕێك و پێك دەبن. لە پاشان باسی عیبادەتی بەدەنی تر وەك ڕۆژووو حەجو زەکاتو جیهادو زوهدو تەماعی دنیاو زانیاریو نەخۆشیو خواردنو خواردنەوەو کڕینو فرۆشتنو حەقی خەڵك دەکرێ.

حەقی ستەمدیدە لە ستەمکاران بە جۆرێك دەستێننەوە، ئەگەر زاڵمەکە کردبوو بە ئەندازەی حەقی مەزلومەکە چاکەکانی دەدەن بە مەزلومەکەو ئەگەر چاکەشی نەبوون گوناهی مەزلومەکەی لە سەر دەنووسن. بەڵام عەقیدەو ئیمان لە زاڵمان ناستێندرێ.

لەو ڕۆژەدا ئێوایە بە پیشتیوانی کەرەمی خوا زۆر ئومێدەوارەو بە بێ چاوەڕوانی پاداشتی چاکەی خۆی دەدا بە داماوێك. وەکو لە ڕیوایەتێکدا هاتووە کە دەڵێ: لەکاتی موحاسەبەدا دوو نەفەر دەگەنە یەك، یەکیان چاکەو خراپەی بەرامبەر یەك دەبنو ئەوی تریان هەر یەك چاکەی دەبێ. لە لایەن خواوە بە یەکەمەکەیان دەگوترێ چاکەیەك پەیدا بکە تا لینگە تەرازووی خێرت قورس ببێ و بچیە بە هەشت. ئەو بێچارەیە داوا لە هەموو کەس دەکا چاکەیەکی نادەنێ، دەگەڕێتەوە، کاتێ کابرای دووەم ئەوە

دەزانێ دەچێ بۆ لای و دەڵێ: برادەر! من تەنیا چاکەیەکم هەیە، خەڵك لەو هەموو چاکانە کە هەیانە یەك چاکەیان نەدات بە تۆ کە تەنیا موحتاجی یەك چاکە بووی، جا من کە زۆر موحتاجم کێ چاکەم لەگەڵ دەکا؟ ها وەرە ئەو چاکەی من بۆ خۆت بەرە با تۆ ڕزگارت بێ، خواش بۆ من کەریمە.

لەوکاتەدا خوای گەورە دەفەرمووێ: ئەو دوو نەفەرانە بەرن بۆ بەهەشت و یەك دەرەجەیان بدەنێ. لەوڕۆژەدا تەواوی چاکەی گەورە و بچووك دەخرێتە تەرازووی موحاسەبەوە، بەلام هەموو کردەوەیەك لەگەڵ عەقیدە وەزن دەکرێ، تا عەقیدەی باشتر بێ چاکەکانی سەنگین تر دەبەن، هەروەك لە ڕیوایەتێکدا هاتووە، کاتێ نەفەرێك نەوەدو نۆ خەراپەو تەنیا یەك چاکەی هەیە، عەرزی خوا گەورە دەکاو دەڵێ: ئەی خوای گەورە! لەبەرامبەر ئەو هەموو خەراپانە چاکەیەك چیە وەزن بکرێ؟ دیارە من لایەقی دۆزەخم، بە بێ وەزنی ئەعمال ڕەوانەی دۆزەخم کە؟

ئینجا خوای گەورە دەفەرمووێ: ئەمن زاڵم نیم، ئەوە دەبێ بە تەرازوە بکێشرێ. جا کاتێ وەزنی ئەعمالی دەکەن ئەو چاکەیەی قورس دەبێ بەسەر خەراپەکانیداو دەی بەن بۆ بەهەشت.

((شا رفیع الدین)) رحمە الله دەفەرمووێ: بە عەقیدەی من ئەو چاکە وەك شەهیدی لە ڕێگای خوادا وایە کە هەموو گوناهێك لە بەین دەبا. هەرچەند لە بارەی پردی (صراط)و وەزنی ئەعمال عولەمای دین ئیختیلافی عەقیدەیان هەیە، بەلام ئەوەی ڕوون و ئاشکرایە ئەوەیە کە لە ڕۆژی قیامەتدا تەرازووی زۆر دادەندرێ، هەروەك ئەو ئایەتەی سوورەی ((انبیاء)) کە دەفەرمووێ: ﴿ وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾ الأنبیاء: ٤٧ هەروەها لەوانەیە پردی سیراتیش زۆر بن و هەر ئوممەتەی بەسەر پردێکدا وەپەرێ..

لە پێش ئەوەدا ئەمری پەڕینەوە بەسەر پردی سیڕاتدا بدرێ، تاریکی تەواوی دەشتی مەحشەر دادەگرێ. لە پاشان دەستوور دەدرێ بە هەموو پێغەمبەرێك لەگەڵ ئوممەتەکەیدا وەرێ کەون. ئەوەی خاوەن ئیمان بێ دوو چرای بۆ ڕادەگیرێ، یەکێ لە پیشەوە دەڕواو یەکێ بەدەستی ڕاستەوە دەبێ. ئەوەی مەقامی نزمتر بێ هەر چرایەکی بۆ ڕادەگیرێ. ئەوەی کە زۆر ئیمانی زەعیف بوو بێ، هەر بەر پێی خۆی دەبینێ. لەوە بەرەو خوار وەك چرا فتیلەیەکیان بۆ ڕاگری جار جار هەڵبێ‌و وەکوژێتەوە، لەوکاتەدا ئەوەی موناڧق بووبێ، بە یارمەتی ڕووناکی خەڵك دەڕۆن بە ڕێگادا دەنا بۆ خۆیان ڕووناکی یان نیە. تا دەگەنە دۆزەخ، تەماشا دەکەن ئەوە پردی سیڕاتە. لە موو باریك ترو لە شیر تیژترە.

ئەمریان پێ دەکرێ بەسەریدا وەپەڕن‌و بچن بۆ بەهەشت. کاتێ لە مەیدانی مەحشەردا دەگەنە لای پردی سیڕات گوێیان لە دەنگێك دەبێ دەڵێ: ئەی خەڵکینە! چاوتان بگرن تا حەزرەتی فاتمەی کچی پێغەمبەر دەپەڕێتەوە. لە پاشان هێندێك وەك بەرق(کارەبا) و بەعزێك وەك با و هێندێك وەك ئەسپ‌و بەعزێ وەك وشترو هێندێك بە ڕۆینی عادەتی‌و بەعزێك زۆر بە زەحمەت دەپەڕنەوە. ئینجا لە دۆزەخەوە چەند قولابی گەورە سەر وەدەر دەنێن، هێندێکیان برینداردەکەن‌و بەعزێکیان ڕادەکێشن بۆ دۆزەخ. لەوکاتەدا کردەوەی چاك وەك نوێژو ڕۆژو سڵاوەت و چاکە فریای خەڵك دەکەون، بەتایبەتی سەدەقە دەبێتە پەردە لە بەینی خاوەنەکەی‌و ئاگری دۆزەخداو حەیوانی قوربانی دەبێتە ولاغی سواری بۆ خاوەنەکەی ، لەوکاتەدا لە ترسان کەس دەنگی لێوە نایە تەنیا پێغەمبەرەکان لە بارەگای ئوممەتەکانیاندا دەڵێن ((رب سلم سلم))

((ابن عباس)) ﵁ دەفەرمووێ: لەڕۆژی قیامەتدا دنیا وەك پیرێژنێکی پێری ناشرینی چاو دەرپەڕیو دان زل دێتە بەر چاوی خەڵك‌و لە خەڵك دەپرسێ

ئەوە دەناسن؟ خەڵکەکە دەڵێن: پەنا بەخوا ئەوە چ بەڵایەکە؟ ئینجا پێیان دەڵێن: ئەوە ئەو دنیایەیە کە لەبەر وی خەڵکتان کوشت، حەقی خزمتان نەدا، حەسوودیتان بە خەڵکەوە دەبردو ئێوەی تەفرە دا.

جا کە ئەو پیرێژنە دەخەنە جەهەننەمەوە هاوار دەکا دەڵێ: ئەوانیش بێنن، ئەوانەی کە لە دنیادا دوام دەکەوتن بیان نێرن بە دوامدا. ئینجا خوای گەورە دەفەرمووێ: پەیڕەوەکانی بنێرن بۆ دۆزەخ.

## موجازاتی زەکات نەدەر

وەك لە چەند ئایەتی سوورەی ((ال عمران))دا دەفەرمووێ: با وا نەزانن ئەوانەی بەخیلی دەکەن‌و زەکات نادەن لەو ماڵەی کە خوا داویەتی بەوان کە ئەوەیان قازانجە، بەڵکو ئەو بۆچوونانەیان زۆر خەراپە، بەو زووانە دەبێتە تەوق‌و دەچێتە ملیانەوەو ئاسمان‌و زەوەی ملکی خوایەو خوا ئاگای لە هەموو کردەوەیەکیانەو هەمووی دەبینێ. لە حەدیسی بوخاریدا دەڵێ:

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوەی خوای تەعالا سەروەتی زۆری دابێتێ‌و زەکاتی لێ نەدا، لە ڕۆژی قیامەتدا لە سەروەتەکەی مارێکی کەچەڵ درووست دەکا، دوو نوختەی ژەهری ڕەشی بەبن زمانیەوەیە، دەچێ هەردوو دەماری ملی دەگرێ‌و دەڵێ: من سەروەت‌و گەنجینەکەوی تۆم.

## موجازاتی خێر نەکەر

ئەو کەسانەی پوڵ و پارە کۆدەکەنەوەو خێری پێوە ناکەن لە ڕێگای خوادا، ئەو مژدەیان بدەیە بە عەزابی زۆر سەخت، وەك لە سوورەی ((تۆبە))دا دەفەرمووێ: لە ڕۆژێکدا ئاگری دۆزەخیان بۆ خۆش دەکەن‌و هەر چووار لایان داغ دەکەن. دووبارە وەك لە سوڕەی (حاقە)دا دەفەرمووێ: ئەمما ئەوانەی نامەی عەمەلیان دەدرێتە دەستی چەپ دەڵێ: بریا نامەی

عەمەلمان دەدرایەتە دەستی چەپو. نەمان زانیایە حیسابمان چۆنە؟ بریا حوکمەکەم وابووایە؟ماڵەکەم فریام نەکەوت. دەسەڵاتیشم نەما.

دەڵێن: بیگرنو زنجیری بکەنو بیخەنە ناو ئاگری دۆزەخەوە بە زنجیرەکەوە کە درێژی حەفتا گەزە وەی بەستن، چونکە ئیمانی بەو خوایە گەورە نەبوو، ڕەغبەتی نەبوو خواردن بدا بە فەقیران، کەواتە نابێ ئیمڕۆ جێگای خۆش بێو دەبێ خۆراکی ئاوی کێمو زوخاو بێ، کە گوناهکار نەبێ کەس نایی خواتەوە. کە ناوی (غسلین)ە . ((ابن عباس)) دەڵێ: ئاوی زەردی برینان ناوی (غسلین)ە

ئەبوو سەعیدی خدری دەڵێ: حەزرەت ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر دۆڵچەیەك پڕ بکەن لە ئاوی غیسلینو لە دەشتێك ڕۆی کەن، بۆنی ناخۆشی دنیا پڕدەکا. لە ((دارالمنثور))دا دەڵێ: زانایان گوتویانە: ئەو زنجیرە لە کۆمیانەوە دەچێو لە دەمیانەوە دێتەوە دەرێو توونديان دەپێچێ تا تەکان نەخۆن. کەواتە زۆر پێویستە تا دەتوانن لە نانداں بە خزمو کەسو کارو فەقیرو هەژار کۆتایی مەکەن.

### موجازاتی ئەوانەی خۆیان بۆ زینا ئارایش دەکەن

لە کتێبی ((دارالمنثور))دا دەفەرمووێ: جارێك حەزرەت ﷺ لە باسی میعراجدا فەرمووی: کۆمەڵێکم خەڵك دی بە مقەست گۆشتیان لێ دەکردتنەوە، لە جوبرەئیلم پرسی ئەوانە کێین؟ گوتی: ئەوانە ئەو کەسانەن کە بۆ کاری خەراپ خۆیان ئاریش دەدا. ئینجا چاوم بە چاڵێك کەوت بۆنێکی ناخۆشو دەنگی دادو فریادی لێ دەهات، لە جوبرەئیلم پرسی ئەوانە کێن؟ گوتی: ئەوانە ئەو ژنانەن کە خۆیان بۆ کاری خەراپ ئارایش دەداو زینایان دەکرد. لە پاشان چەند ژنو پیاوم دی هەڵیان واسی بوون،

گوتم: ئەوانە کێن؟ جوبرەئیل گوتی: ئەوانە ئەو کەسانەن کە غەیبەتی خەڵکیان دەکردو عەیبیان لە خەڵك دەگرت. یارەبی خوا بە گەورەیی خۆی لەو هەموو نەخۆشیانە ڕزگارمان بکا.

## موجازاتی ئەوەی ماڵی هەتیو غەصب دەکا

لە حەدیسدا هاتووە کە لە ڕۆژی قیامەتدا هێندێك کە لە قەبرەکەیان دێنە دەرێ ئاگریان لە دەم دەبارێ. یەکێ پرسی ئەی ڕەسولی خوا! ئەوانە کێن؟ لە وەڵامدا حەزرەت ﷺ ئەو ئایەتەی سوورەی (نیسا)ی خوێندەوە کە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلْيَتَٰمَىٰ ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ نَارًا ۖ وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا ﴿١٠﴾﴾ النساء: ١٠ لە شەوی میعراج حەزرەت ﷺ تووشی کۆمەڵێك بوو، لێویان وەك لێوی وشتر گەورەبوو، هەر یەکەی مەلائیکەی بەسەرەوەبوو، لێویان لێك دەکردەوەو بەردی گەورەی ئاگردارییان بەزۆر دەخستە دەمیانەوەو لە دواوەیان دەهاتە دەرەوەو بە شیددەت هاواریان دەکرد. حەزرەت ﷺ لە جوبرەئیلی پرسی ئەوانەکێن؟ فەرمووی: ئەوانە ئەو کەسانەن لە دنیادا ماڵی هەتیوانیان داگیر دەکرد، ئێستا ئاگریان دەرخوارد دەدەن.

لە حەدیسێکی کەدا هاتووە دەڵێ: چوار نەوعە ئینسان هەیە کەخوا نەدەیان باتە بەهەشت، نە نیعمەتی بەهەشتیان بە نسیب دەکا. یەکیان ئارەق خۆرەو یەکیان سوو خۆرەو یەکیان ئەو کەسەیە کە ماڵی هەتیو بە ناهەق دەخواو چوارەمیان ئەوەیە بێ دڵی دایك‌و باوك دەکا.

## پاداشتی عالمی بێ عەمەل

لە کتێبی تەرغیبدا دەفەرمووێ:پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە ڕۆژی قیامەتدا یەکێك دێنن و وەهای دەهاوێتە ناو جەهەننەمەوە ڕیخۆڵەی لە سکیدا دێتە دەرەوەو وەك کەر بەدەوری ڕیخۆڵەکانیدا هەڵدەسووڕێ و خەڵك لە دەوری کۆ دەبنەوەو دەڵێن: ئەوە چ بەڵایەکت بەسەر هاتووە؟ خۆ تۆ ئامۆژگاری خەڵکت دەکردو لە خەراپەت دوور دەخستنەوە. لە وەڵامدا دەڵێ: من ئامۆژگاری ئێوەم دەکرد بەڵام خۆم عەمەلم پێ نەدەکرد.

لە حەدیسێکی دی دا دەفەرمووێ: لە شەوی میعراجدا چەند کەسێکم دی لێویان بە مقەستی ئاگرینی دۆزەخ دەبڕین، لە جوبرەئیلم پرسی ئەوانە کێ،؟ گوتی: ئەوانە چەند واعیزی ئۆممەتی تۆن کە ئامۆژگاری خەڵکیان دەکردو خۆیان عەمەلیان پێ نەدەکرد.

لە حەدیسێکی کەدا فەرمووی: زەبانیە عالمی بێ دین لە پێش کافراندا دەبەن بۆ دۆزەخ و دەڵێن ئاخر چی بووە کە ئێمە لە پێش کافراندا دەستگیر دەکەن؟ لە وەڵامدا دەڵێن: عالم وجاهیل وەك یەك نین. بە عیبارەتێکی تر پێیان دەڵێن: ئێوە دوا ڕۆژتان دەزانی کەچی کاری خەراپیشتان دەکرد.

لە فەرمایشتێکی دی دا دەفەرمووێ: بەعزێکیان دەخەنە ناو جەهەننەمەوە کە بەهۆی بۆگەنی ئەوانەوە حاڵی جەهەننەمان ناخۆش دەبێ و پێیان دەڵێن: ئەوە چ گوناهێکتان کردووە تووشی ئەو دوا ڕۆژە ناخۆشە بوون؟ موسیبەتی خۆمان کەم بوو هی ئێوەشی هاتە سەر؟ ئەو بۆگەنەی ئێوە ئێمەی نارەحەت کرد. ئەوانیش لە وەڵامدا دەڵێن: ئێمە ئەو عالمانەین کە لە عیلمەکەمان ئیستیفادەمان نەکرد.

## پاداشتی نوێژ نەکەر

لە حەدیسێکدا دەفەرمووی: ئەوەی موبالات بە نوێژ دەکا خوای تەعالا لە پێنج ڕێگەوە ڕەحمی پێ دەکا.

یەکەم: دەست تەنگی نابینێ.واتە قەناعەت دەکا.

دووەم: لە عەزابی قەبر بەدوور دەبێ.

سێیەم : دەفتەری ئەعمالی دەدرێتە دەستی ڕاستی . وەك لە سوورەی (حاقە)دا باس کراوە.

چوارەم: وەك بەرق بەسەر پردی سیراتدا دەڕۆن.

پێنجەم: لەکاتی موحاسەبەدا مەحفوز دەبن.

بەڵام ئەوەی لە نوێژان بێ موبالات بێ، بە پازدە جۆر عەزاب دەدرێ. پێنج جۆری تایبەتی دەبێ بە دنیاوەو سێ جۆری پەیوەندی بەکاتی نەزعەوەیەو سێ تایبەتی بەکاتی داخل بوونی قەبرەوەو سێشیان لەوکاتەدا کە لەڕۆژی مەحشەردا لە قەبر دێتە دەرەوە.

ئەو پێنج عەزابەی پەیوەندیان بە دنیاوەیە بریتین لەوانە:

یەکەم: بەرەکەتی لە ژیاندا نامێنێ. دووەم: نووری پیاوچاکانی لە ناوچەواندا نامێنێ. سێیەم: پادشتی چاکەی نادرێتەوە. چوارەم: دۆعای گیرا نابێ. پێنجەم: وەبەر دوعای پیاوچاکان ناکەوەێ.

ئەو سێ عەزابەی کاتی گیانت دانیش بەو جۆرەن.

یەکەم: بە زەلیلی گیان دەدا. دووەم: لەبرسان دەمرێ. واتا قەت چاوی پڕ نابێتەوە. سێ یەم: بە تینوایەتیەوە گیانی دەردەچێ، ئەگەر ئاوی دەریای بدەنێ تینوایەتی ناشکێ.

## دیمەنی مەرگ

سێ جۆرە عەزابی قەبرەکەشی،

یەکەم: قەبرەکەی ئەوەندە تەنگ دەبێتەوە پەراسووی تێك دەپەڕن. دووەم: قەبرەکەی پڕ دەبێ لە ئاگر. سێیەم: مارێکی گەورە لە قەبرەکەیدا بریندراری دەکاو دەڵێ: من ئەو مارە کەچەڵەم کە لێی دەترسای. دەنگی وەك گرمەی هەور وایە دەڵێ: خوا منی لەسەر تۆ داناوە کەلەبەر نوێژ نەکردنت، لەبەر نوێژی بەیانی تا ڕۆژ هەڵاتو لە نوێژی نیوەڕۆ تا عەسرو لە نوێژی عەسر تا مەغریبو لەبەر نوێژی مەغریب تا عیشاو لەبەر نوێژی عیشا تا بەیانی پێتەوە دەدەم. بە یەك پێوەدانی حەفتا گەزی بە عەرزیدا دەباتە خوارەوە، تا ڕۆژی قیامەت ئەوە حاڵی دەبێ. پەنا بەخوا.

ئەو سێ نەوعە عەزابەش کە لەقەبر دێتە دەرەوە ئاوان. یەکەم: عەزابی زۆر سەخت دەبێ. دووەم: خوا قەهری لێ دەگرێ. سێیەم: دەی بەنە دۆزەخ. بینا لەسەر ڕیوایەتێك سێ خەتی لە ناوچەوان دەنووسرێ. خەتی یەکەم: دەنووسرێ ئەی ئەو کەسەی حەقی خوات فەوتاندز دووەم دەنووسێ: ئەی خوا غەزەب لێ گرتوو. سێ یەم دەنووسێ: لەبەر ئەوەی لە دنیادا حەقی خواتن فەوتاند ئیمڕۆ لە ڕەحمەتی خوا بێ بەش دەبی.

## پاداشتی خۆ بەزل گر

بینا بە ڕیوایەتی عومەری کوڕی شوعەیب رضي الله عنه خۆشەویستی خوا فەرموویەتی: لە ڕۆژی قیامەتدا ئەوانەی تەکەبووریان کردووەو خۆیان بە زل دەگرت وەك مێروو وەبەر پێیان دەدرێنو ئاگری دۆزەخ چواردەوریان دەداو لە زیندانێکی تایبەتیدا عەزابیان دەدەنو ئاگریان لەدەور دەکەنەوەو زوخاوی برنیانیان پێ دەخۆنەوە، واتە زۆریان ناڕەحەتو زەلیل دەکەن.

بەڕیوایەتی ئەبوو هورەیرە ﷺ لە حەدیسی قودسیدا هاتووە دەفەرمووێ: کیبرو عەزەمەت وەك دوو سەرپۆشی من وان، ئەوەی دەی هەوێ لەمنیان بفڕێنێ دەی خەمە جەهەننەمەوە. بە عیبارەتێکی تر مەعنای وایە ئەو دوو سیفەتە تایبەتین بە خواوە هەر خوا شایستەی عەزەمەتو گەورەییە.

حارسی کوڕی وەهەب دەڵێ: پێغەنبەر ﷺ فەرمووی: ئایا ئاگاداری حاڵی ئەهلی دۆزەختان ناکەم؟ ئەوەی دڵ ڕەق بیٚو خۆی بە ماڵی حەرام قەڵەو بکاو خۆی بە زل بگریٚ، ئەوە خوا سەرەوبن دەی خاتە جەهەننەمەوە.

ابن عومەر ﷺ دەڵێ: سەرداری دوو عالەم حەزرەتی (محمد مصطفی) ﷺ فەرمووی: خۆتان لە تەکەبوور بپارێزن، چونکە تەکەبوور گوناهێکە لە پێش هەموو کەەسدا شەیتانی زەلیل کرد. لە حیرسو تەماع خۆتان بپارێزن، چونکە حیرسو تەماع ئەوەندە بەدن ئادەمیان لە بەهەشت دەرکرد. خۆتان لە حەسادەت بپارێزن، چونکە حەسادەت ئەو بەلاّ بەدەیە کە بەدەستی قابیل هابیلی بە کوشت دا. واتە شەیتان لەبەر تەکەبور سوجدەی نەبردوو، ئادەم لەبەر تەماع لە داری گەنمی خواردو قابیل لەبەر حەسادەت براکەی خۆی کوشت. ئاگاتان لەخۆتان بیٚ زۆر لەو شتانە خۆتان بپارێزن با تووشی ئەو پاداشتانە نەبن، کە ئەوان تووشیان بوون.

### دەرسی نۆزدە

## پاداشتی ئەوەی خۆی لە میز پاک ناکاتەوە

شەفعی کوڕی ماتیعی ئەصبوحی دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە دۆزەخدا پیاوێك ریخۆڵەکانی خۆی ڕادەکێشێ، خەڵکی جەهەننەم زۆریان بەلاوە سەیر دەبێ، دەڵێن: ئەوە تۆ لە دنیادا چ کارێکت دەکرد؟ لە وەڵامدا دەڵێ: لەکاتی میزکردندا بێ موبالات بووم‌و لەهەر جێگایەك ئارەزووم بووایە میزم دەکرد.

## پاداشتی ڕۆژوو نەگرتن

(ابن خزیمە) لە ئەبوو ئوبامەوە ڕیوایەت دەکا کە پێغەمبەر ﷺ لە خەویدا دی چەند کەسێکیان سەرەو بن هەڵواسیون‌و خەێنیان لێ دەتکێ، حەزرەت ﷺ پرسی ئەوانە کێن؟ گوتیان: ئەوانە ئەو کەسانەن کە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانیان نەدەگرت.

عەلای کوڕی حارس دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوەی ئینسانی بێ گوناه تاوانبار بکاو ئەوەی غەیبەتی خەڵك دەکا لە ڕۆژی مەحشەردا وەك سەگ حەشری دەکرێ.

((ابن عباس)) دەڵێ: سەرداری دوو عالەم حەزرەتی ((محمد)) ﷺ فەرمووی: لەشەوی میعراجدا چەند کەسێکم دی گۆشتی مرداریان دەخوارد. گوتم: ئەوانە کێن؟ گوتیان: ئەوە ئەو کەسانەن کە غەیبەتی خەڵکیان دەکرد. کۆمەڵێکی تری دی بە نینۆك سەرو ڕووی خۆیان دێنایە خوارەوە، پرسی ئەوانە کێن؟ حەزرەتی جوبرەئیل عەرزی کرد ئەوە ئەو کەسانەن غەیبەتی

خەڵکیان دەکرد و ئابڕوویان دەبردن. هێندێکم دین بە زمان هەڵواسرابوون گوتم ئەوانە کێن؟ گوتیان: ئەوە ئەو کەسانەن عەیبی خەڵکیان ئاشکرا دەکرد.

جابیری کوڕی (عبدالله) دەڵێ: جارێکیان لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بوین بایێکی زۆر بۆن ناخۆش هات، فەرمووی: دەزانن ئەوە چ بایەکە؟ ئەوە بۆنی بەدی ئەو کەسانەیە کە غەیبەتی موسڵمانان دەکەن، فەرمووی: غەیبەت لە زیناش بەدترە، ئەوەی زینا بکا پاش تۆبە عەفوو دەکرێ. بەڵام غەیبەت گۆ تا ئەوەی غەیبەتی کردووە نەی بەخشێ خوا نای بەخشێ.

حەزرەتی حەسەن رضي الله عنه دەفەرمووێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەرگای بەهەشت دەکەنەوە یەکێك بانگ دەکەن، کاتێ لە دەرگاکە نزیك بووەوە دەرگاکە پێوە دەدرێتەوە، ئینجا لە دەرگایەکی دی یەوە بانگی دەکەن تا دەچێ ئەویش دادەخرێتەوە. تا نا ئومێد دەبێ. ئەو ە پاداشتی ئەو کەسەیە کە لە دەنیادا گاڵتە بە خەڵك دەکا.

فەرمووی: خەراپترین ئینسان ئەو کەسەیە دووڕوو بێ، ئینسانی دوو ڕوو لە ڕۆژی قیامەتدا دوو ڕووی ئاگرینی بۆ درووست دەکەن. فەرمووی زۆر لەوە دەترسم کە ئوممەتەکەم تووشی کردەوەی قەومی (لوط) بن، چونکە خوای گەورە بەری دەبێ لەوکەسانەی ئەو کردەوە دەکەن و مەلائیکەی حەوت ئاسمان لەعلەت لە لە حەوت تاقم دەکەن.

یەکەم لە هەتیو باز.

دووەم: لەو کەسەی بەناوی غەیری خواوە حەیوان سەردەبڕێ.

سێ یەم: لەو کەسەی کاری وا لەگەڵ حەیوانات دەکا.

چوارەم: ئەوەی دایك و کچ بەسەریەکەوە مارە بکا.

پێنجەم: ئەوەی بێ ئەمری دایك و باوك بکا.

شەشەم: ئەوەی بەینی دوو ملك ببەزێنێ.

حەوتەم: ئەو غولامەی خۆی بە غولامی یەکێ تر لەقەڵەم بدا.

((عبدالله)) ی کوڕی ئەبی ئەوفا دەفەرمووێ: پیاوێك ناوی عەلقەمە بوو، زۆر نوێژو ڕۆژوو پاك بوو، لەکاتی سەرەمەرگدا هەر چەند خەڵك شادەیان پێ دێنا بۆی نەدەهات. ژنەکەی یەکێکی نارد بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ و عەرزی کرد. حەزرەت ﷺ فەرمووی: دایكو باوکی ماون؟ گوتیان: قوربان دایکی ماوە، بەلام نای دوێنێ. پێغەمبەر ﷺ ناردی بۆ لای دایکی عەلقەمە فەرمووی: دەم هەوێ چاوم پێی بکەوێ، جا ئەو دێتە لامان، یا ئێمە بچین بۆ لای؟ دایکی عەلقەمە عەرزی کرد دایكو باوکم بە قوربانت بێ من دێمە خزمەتی. هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و حەزرەت لەبارەی عەلقەمەوە پرسیاری لێ کرد. لە وەلامدا گوتی قوربان! کوڕێکی زۆر چاكو پیاو چاکە، بەلام لە مەقابیل ژنەکەیدا گوێ ناداتە منو بە قسەی من ناکا. لەبەر ئەوەیە زۆری لێ تووڕەم. حەزرەت ﷺ فەرمووی: باشتر وایە عەفووی بکەی، گوتی: عەفووی ناکەم. حەزرەت ﷺ ڕووی کردە بیلالو گوتی: کۆمەڵە دارێك کۆوەکەو عەلقەمە بسووتێنە، دایکی عەلقەمە کە ئەوەی بیست ڕەنگی گۆڕاو گوتی: کوڕەکەم دەسوتێنن؟ فەرمووی: بەڵێ. عەزابی ئێمە زۆر کەمترە لە عەزابی خوا، فەرمووی: بەخوا تا تۆ لێی تووڕەبی نە نوێژی قبوڵ دەبێ، نە خێرو خێراتی. پیرێژن گوتی: قوربان! تۆ ئەو خەڵکە شاهید بن ئەوا عافووم کرد. پێغەنبەر ﷺ ڕووی کردە خەڵکەکەو فەرمووی: ئێستا بزانن داخۆ شادەی بۆ دێ یان نا؟ عەرزیان کرد ئەی ڕەسولی خوا! شادەی هێناو

وەفاتی فەرمووە. پێغەمبەر ﷺ دەستووری دا زوو کفن و دفنی بکەن و لەگەڵ جەنازەکەی تەشریفی چوو بۆ سەر قەبران و فەرمووی: لە موهاجیرو ئەنساردا هەر کەسێك بەقسەی دایکی نەکا خواو مەلائیکەی خواو هەموو خەڵك لەعنەتی لێ دەکەن و خوا فەرزوو سووننەتی لێ قبوول ناکا تا تۆبە نەکاو چاکە لەگەڵ دایکی دا نەکا. هەرچۆنێك بێ دەبێ دڵی بەدەست بێنێ، چونکە ڕەزای خوا بە ڕەزابوونی دایکەوەیەو تووڕەبوونی خوا لەگەڵ تووڕەبوونی دایکە.

لە پاداشتی کوشتنی یەك نەفەر موسڵمانی بێ گوناهدا، شێخی تەبەڕانی لە ئەبوو سەعیدەوە ڕیوایەت دەکا کە حەزرەت ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر دانیشتوانی ئەرزو ئاسمان موسڵمانێك بە ناهەق بکوژن خوای تەعالا لە ڕۆژی قیامەتدا هەموانیان سەرەوبن دەخاتە دۆزەخەوە.

ئیبنو عەباس دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ دەی فەرموو: لە ڕۆژی قیامەتدا کوژراو یەخەی کوژەرەکە دەگرێ لە کاتێکدا خوێنی لێ دەتکێ و لە نزیك عەرشی خوا هاوار دەکا دەڵێ: ئەی خوایە! ئەوەیە کە منی بەناهەق کوشت. فەرمووی: خوا بە دادی دەگاو کابرای قاتیل دەبەن بۆ جەهەننەم.

شێخی موسلیم و بوخاری لە ئەبوو هورەیرەوە ؓ ڕیوایەت دەکەن کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەوەی لە دنیادا خۆی بکوژێ، لە ڕۆژی قیامەتدا ئەمری پێ دەکرێ خۆی بکوژێتەوە. جا ئەگەر خۆی بەردابووەوە، خۆی بەردەداتەوە، ئەگەر خۆی خنکاندبوو، خۆی دەخنکێنێتەوە، ئەگەر بە تفەنگ یان خەرنجەر، یا چەقۆ خۆی کووشتبوو هەر بەو شتە خۆی دەکوژێتەوە.

## دیمەنی مەرگ

جابیر دەفەرمووێ: کابرایەك بە تیر خۆی کوشت، پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر نەکرد.

جەندەب دەڵێ: کابرایەك بریندار بوو خۆی کوشت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوای گەورە دەفەرمووێ: ئەی بەندەی من! تۆ لە گیان داندا پەلەت کرد لەبەر ئەوە منیش بەهەشت لە تۆ حەرام دەکەم .

ئەبو قوللابە لە سابیتی کوڕی زوحاك ڕیوایەت دەکا کە حەزرەت ﷺ فەرمووی: ئەوەی بە درۆ سوێند دەخواو دەڵێ ئەگەر درۆ بکەم جوولەکە بم خوا دەیکاتە جوولەکە. ئەوەی خود کوشی بکا تووشی عەزابی سەخت دەبێ. ئەوەی لە عنەت لە موسڵمانێك بکا وەك بیکوژێ وایە. ئەوەی یەکێ کافر کا وەك قاتڵی وایە.

حەزرەتی عایشە رضی اللە عنها دەفەرمووێ: پێغەمبەر ﷺ لە حوجرەکەی مندا دوعای لە حاکمی زاڵم کردو فەرمووی: ئەی خوایە! ئەوەی دەبێتە ئەمیرو وەلی ئەمری ئوممەتەکەم ئەگەر زولمی لێ کردن عەزابی بدە. لەعنەتی خوا لەو حاکمەی زوڵم لە ئۆممەتم دەکا. فەرمووی: ئەوەی دەبێتە حاکم یا قازی لە ڕۆژی قیامەتدا دەستیان لە گەردن یاندا دەیان هێنن بۆ بارەگای خوا، جا ئەگەر ڕیشوەیان نەخواردبێ و بە عەداڵەت قەزاوەتیان کردبێ ئەوە ئازاد دەکرێن و ئەگەر خیانەتیشیان کردبێ دەیان خەنە دۆزەخەوە.

ئیبنو ئەبی الدنیا لە ئەبوو ئومامەوە ڕیوایەت دەکا کە حەزرەت ﷺ فەرموویەتی: بەعزێ لە ئوممەتم شەوو ڕۆژ خەریکی ئارەق خواردنەوەو لەهو لەعب دەبن، ڕۆژێك دەبن بە مەیمون و بەرازو بە زەوی دا بڕۆنە خوارەوەو ڕۆژێك لە ئاسمانەوە سەنگ باران بکرێن و یا خەڵك بڵێ: ئەو شەو

فلاّن ناحیە ڕۆچوو، یا فلاّن دێیە ئاساری نەما وەك قەومی لوت بەردباران بكرێن یا وەك قەومی عاد بەباو تۆفان لەبەین بچن. یان بەهۆی عەرەق خواردنەوەو سوو خواردن و لیباسی ئاوریشم لەبەركردن و گۆرانی ژنان لەناو كۆمەڵداو بەهۆی بیّ موبالاتی بە خزمایەتیەوەو كەسایەتیەوە فەرمووی: سیّ نەفەر ناچنە بەهەشت، یەكەم ئارەق خۆر، دووەم ئەوەی گویّ نەداتە حەقی خزمایەتی، سێیەم ئەوەی عەقیدەی بە جادوو بیّ، فەرمووی: ئەوەی قورئانی لەبەر بیّ بە بیّ موبالاتی و بە عەمدی لەبیر خۆی لەبەرێتەوە ئەوە لە كاتی موحاسەبەدا لە ڕۆژی قیامەتدا دەم و دانی هەڵدەوەریّ. فەرمووی: گوناه لەوە گەورەتر نیە كە سوورەتێك یان چەند ئایەتێك لەبەر بكەیت و بە عەمدی لەبیر خۆیەتی بەرەوە.

فەرمووی: هەركاتیّ ئەو پێنج كارە خەراپە لەناو ئوممەتم پەیدا بوون زوو لە بەین دەچن. یەكەم كە لە لەعنەتیان لە یەكتر كرد. دووەم ئارەقیان خواردەوە. سیّ یەم پیاوانیان لیباسی ئاوریشمیان لەبەر كرد. چوارەم ژنانیان بەزۆری گۆرانیان گوتن. پێنجەم هەتیو بازی و وێك كەوتنی پیاو لەگەڵ پیاو و ژن لەگەڵ ژن.

كاتیّ موسڵمانان دەگەنە سەر پردی سیڕات مونافقەكان تووشی تاریكی دەبن هاوار دەكەن ئەی برادەرینە! تۆزێك سەبر بگرن با ئێمەش بتوانین بەهۆی ڕووناكی ئێوەوە وەڕیّ كەوین. لە وەلاّمدا دەڵێن: تۆزێك بگەڕێنەوە بۆ دواوە لەو جێگایەی ئێمە ڕووناكیمان لیّ هێناوە هێندێك ڕووناكی بێنن. كاتیّ دەگەڕێنەوە، زیاتر دوچاری تاریكی دەبن بە ناچاری دووبارە دەگەڕێنەوە تەماشا دەكەن لە ئاخری پردی سیڕاتدا دیوارێكی گەورە كراوەو دەرگاكەی داخراوە. بە زەلیلی بانگی موسڵمانەكان دەكەن ئاخر ئێمە لە دنیا لەگەڵ ئێوە نەبووین؟ ئەی بۆچی بەجێتان هێشتین؟

لە وەڵامیاند دەڵێن: بە ئاشکرا لەگەڵ ئێمە بوون، بەڵام بە نهێنی لەگەڵ کافران بوون، باش وایە بچنەوە لای ئەوان. جا بلێسەی ئاگر دێ‌و دەیان با، کاتێ موسڵمانەکان بەسەر پردی سیراتد دەپەڕنەوە، دەڵێن: بیست بوومان بەسەر جەهەننەمدا دەڕۆین، ئەی بۆ نەمان دی؟ ئینجا پێغەمبەر ﷺ دەرگای بەهەشت دەکاتەوەو لە ئەحواڵی ئوممەتی دەپرسێ کە چواریەکی ئەهلی بەهەشتن. کاتێ ڕوون دەبیتەوە کە هەزاران هەزار لە دۆزەخدان زۆر ناڕەحەت دەبێ‌و عەرزی بارەگای ئەقدەس دەکا ئەی خوای گەورە ئوممەتم لە عەزابی دۆزەخ نەجات بدە. تا حەوت ڕۆژ سەر لە سووجدە هەڵناگرێ‌و حەمد و سەنای خوا دەکا.

ئینجا خوای گەورە ئەوەی بە ئەندازەی دەنکە جۆیەك ئیمانی لەدڵدا بووبێ لە جەهەننەم بیهێنە دەرەوە. ئینجا بە چاو لێ کردن لە حەزرەت ﷺ، پێغەمبەرەکانیش شیفاعەت بۆ ئوممەتەکانیان دەکەن. جا پێغەمبەر ﷺ بە ئەمری خوا چەن مەلائیکە لەگەڵ خۆی دەبا و لەگەڵ پەیڕەوەکانی دەچنە تەنیشت دۆزەخ. دەفەرمووێ: هەرکەسێك عەلامەت و نیشانەی خزم‌و دۆستی خۆی بلێ تا ئەو مەلائیکەتانە بۆیان لە دۆزەخ بێننە دەرەوە. ئینجا شەهیدیش شیفاعەت بۆ حەفتا کەس دەکا و زانا حەقی شیفاعەتی دەدرێتێ.

کاتێ حەزرەت ﷺ ئەو دەستەی لە ئوممەتەکەی لە دۆزەخ ڕزگارکردو تەشریفی هاتەوە بەهەشت. دووبارە ئەحواڵی ئوممەتی دەپرسێ دەڵێن: ئەی ڕەسولی خوا! ئێستاش چەند هەزار نەفەر لە دۆزەخ دایە، دووبارە لەبەر خوا دەپاڕێتەوەو خوا ئەمر دەکا ئەوەی بە ئەندازەی مسقاڵە زەڕرەییەك ئیمانی بووە ڕزگاری بکەن. جا حەزرەت ﷺ لەگەڵ عولەما و ئەولیا و شوهەدادا

دەچن‌و حەزرەت ﷺ دەفەرمووێ: خزم‌و دۆستی خۆتان وەناسن‌و تا ڕزگاریان بکەین. هەر کەس خزم‌و ناسیاوی خۆی بانگ دەکاو دێنەوە بۆ بەهەشت. دووبارە پێغەمبەر ﷺ پرسیار دەکاو خوا شەفاعەتی قبولْ دەکاو دەفەرمووێ: ئەوەی بەقەد نیو مسقاله زەڕڕە ئیمانی بووبێ ڕزگاری بکەن ئەو دەفعە کەس لە خوا پەرستان لە دۆزەخدا نامینێتەوە مەگەر ئەوەی پەنای بۆ حەزرەت ﷺ نەهێنابێ. تەنانەن پێغەمبەر ﷺ شەفاعەت بۆ ئەو کەسانەش دەکا کە لە ڕێگای ڕاست لایان دابوو، بەلاّم خوای گەورە دەفەرمووێ: تۆ کارت بەسەر ئەوانەوە نەبێ خۆم دەیان بەخشم جا لەو کاتەدا کێشە لەبەینی کافرو خواپەرستاندا پەیدا دەبێ، بە لۆمەوە بەیەکتر دەڵێن: ئێوە کە لە باسی خوا کێشەتان لەگەڵ دەکردین‌و دەتان گوت ئێمە ڕاستین خۆ قسەکەتان ڕاست نەبوو، ئەوە نیە هەردوولامان وەك یەك گرفتار بووین؟ ئینجا خوای گەورە دەفەرمووێ: ئەوان شیرك‌و تەوحید وەك یەك حیساب دەکەن. قەسەم بە عیززەتی خۆم وانیە، خوای گەورە بەدەستی قودرەتی خۆی ئەوەی لە دنیادا یەکتاپەرست بووبێ لە دۆزەخ ڕزگاری دەکا، بەلاّم بەدەنیان وەك خەڵوزی ڕەش وادەبێ، لەبەر ئەوە دەیان بەن لە ئاوی کەوسەردا دەیان شۆن‌و تەڕو تازە دەبنەوە. هەرچەند لە پاش ماوەیەك دەچنە بەهەشت، بەلاّم داغێکی ڕەشیان بە گەردەنەوە دەمێنێ‌و لەناو خەڵکدا بە جەهەننەمیان ناو دەبەن، تا لای خوای گەورە داوا دەکەن ئەو داغەیان پێوە نەمێنێ‌و ئەو ناوەیان لەسەر لاچێ. خوای گەورە ئاواتیان دێنێتە دی.

## گفتوگۆ لە بەینی ئەهلی دۆزەخ‌و بەهەشتدا

کاتێ لە بەهەشتدا هەرکەس جێگای خۆی گرت لەوەختی چاو پێکەوتندا دەڵێن: لەناو جەهەننەمیاندا فلاّن کەس کێشەی لەگەڵ ئێمە دەکرد دەبێ

ئێستا حاڵی چۆن بێ؟ لە ناکاوێك پەنجەرەیەك لە بەهەشت دەکرێتەوەو تەماشای جەهەنەم دەکەن، کابرا دەناسنەوە، کابرا هاوار دەکاو داوای ئاوو نیعمەتی بەهەشتیان لێ دەکا، لە وەڵامدا دەڵێن: ئاخر خوا نازو نیعمەتی بەهەشتی لە تۆ حەرام کردووە. ڕاستیمان پێ بڵێ: بزانین ئەو وەعدانەی خوا ڕاست بوون یان نا؟ چونکە ئەو وەعدانەی خوا دابووی بە ئێمە هەموویان ڕاست بوون. جا وەك ئەو باسە لە سوورەی (اعرف)دا باس دەکا، کابرا زۆر پەشیمان دەبێتەوەو بەهەشتیەکان پێی پێدەکەنن و پەنجەرەکە پێوە دەدرێتەوە.

خوای گەورە لە سورەی (سبأ) دا دەفەرمووێ: ئەگەر دەتدی ئەو کاتەی زاڵمەکان گرفتاری عەزابی خوا دەبن و لەگەڵ ژێردەستەکانیان دەکەونە کێشە، ژێردەستەکان دەڵێن: ئەگەر ئێوە نەبونایە ئێمە ڕزگارمان دەبوو، گەورەکان دەڵێن: وانیە ئێمە ڕێگای هیدایەتی ئێوەمان نەگرتبوو، خۆتان گوناهکاربوون. ژێر دەستەکان دەڵێن: نەخێر حیلەی شەوو ڕۆژی ئێوە ئێمەی کافر کرد.

پەیرەوەکانیان دەڵێن: ئێوە ڕۆژی ئێمەتان ڕەش کردو لە خواتان دوور خستینەوە. گەورەکان وەڵام دەدەنەوە ئێمە کەی گوتمان خۆتان کافر بکەن؟ کەی ڕێگای خوا پەرستیمان لێ گرتن؟ خۆتان کوفرتان کردو خۆتان گوناهبارن دەڵێن: بەڵێ. بە ئاشکرا مەجبورتان نە دەکردین، بەڵام فێڵ و تەڵەکەی ئێوە ئێمەی لە خواو پێغەمبەر دوور خستەوە.

قورئان ڕووداوەکانی مەحشەر بە ئاشکرا باس کردووەو ئەو کەسە بەدبەختە پەند وەرناگرێ و لە فەرمانی خوا لا دەدا.

## ئەحواڵی دۆزەخ

### پێشەکی

لەچەند لاپەڕەکانی داهاتوودا باسی ڕووداوەکانی جەهەننەم بە سادەیی دەکەم کە لە قورئان و حەدیس وەرگیراون. زۆر لە موسڵمانان لە قسەی ڕۆژانەیاندا باسی جەهەننەم دەکەن، بەڵام لەبەر ئەوەی لە مووسیبەت و عەزابی دۆزەخیان غافڵن، نازانن چۆن خۆیان لە عەزابی وەحشەتناکی دۆزەخ ڕزگار بکەن.

ئەگەر لەبارەی دۆزەخەوە ئاگاداری تەواو پەیدا بکەن ڕێگای نەجات دەدۆزنەوە. ئەگەر ئەو کتێبە وەخوێنن، یان بۆیان وەخوێنن دەتوانن بیر لە ئەحواڵی دۆزەخ بکەنەوەو خۆیان لە گوناه بپارێزن و نەفسیان ڕێگای کاری چاکەیان لێ نەگرێ.

## دەرسی بیست

## قوولی دۆزەخ

تەرغیب لە ((ابن حبان)) ڕیوایەت دەکا کە کە ئەبوو مووسای ئەشعەری ﷺ ل پێغەمبەرەوە ﷺ نەقڵی کردووە کە فەرموویەتی: ئەگەر بەردێك بخەنە، بهاوێنە جەهەننەمەوە بە حەفتا ساڵ دەگاتە بنی. شێخی موسلیم لە ئەبوو هورەیرەوە ڕیوایەت دەکاو دەفەرمووێ: ڕۆژێك لە خزمەت حەزرەت ﷺ بووین گوێمان لە دەنگی شتێك بوو کەوتە خوارەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەزانن ئەوە دەنگی چی بوو؟ عەرزیان کرد خواو پێغەمبەری خوا باشتر دەزانن، فەرمووی: ئەوە بەردێك بوو خوا ناردبووی بۆ ناو دۆزەخ، ئێستا گەیشتە بنی جەهەننەم، ئەوە دەنگی کەوتنەکەی بوو.

ترمزی دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: چواردەوری دۆزەخ دیوارە، هەر دیوارەی بە ئەندازەی چل ساڵ ڕێ یە. لەبارەی دەرگاکانی دۆزەخیشەوە، خوای تەعالا لە سوورەی (حیجر)دا دەفەرمووێ: ﴿ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوْعِدُهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٤٣﴾ لَهَا سَبْعَةُ أَبْوَابٍ لِّكُلِّ بَابٍ مِّنْهُمْ جُزْءٌ مَّقْسُومٌ ﴿٤٤﴾ ﴾ الحجر: ٤٣ - ٤٤ بەڕاستی دۆزەخ وەعدەگای هەموو کەسە. حەوت دەرگای هەیە، هەر دەرگای بۆ کۆمەڵێکی دیاری کراوە.

لە تەڕغیبدا دەفەرمووێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەزار ساڵ ئاگریان لە دۆزەخا کردەوە تا سووربوو، هەزار ساڵی تریان سووتاند تا سپی بوو، هەزار ساڵی تریان سووتاند تا ڕەش بوو.

## دیمەنی مەرگ

بە ڕیوایەتی موسلیمو بوخاری پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو ئاگرەی دنیا بەشێکە لە حەفتا بەشی ئاگری جەهەننەم، ئەسحاب عەرزیان کرد قوربان! بۆ سووتانی گوناهکارێك ئەو ئاگرە بەسە، فەرمووی ئاگری دۆزەخ شەستو نۆ دەرەجە لەو ئاگرە گەرم ترە فەرمووی :ئەگەر ئەهلی جەهەننەم بخەنە ناو ئەو ئاگرەوە خەویان لێ دەکەوێو هەست بە ئاسوودەیی دەکەن. فەرمووی: لە دۆزەخدا ئەوەی عەزابی زۆر سووك بێ دەستی ئاگرینو سەری وەك دیزە دەکولێ، وا دەزانێ عەزابی لەهەموو کەس زیاترە، کەچی عەزابی لە هەموو کەس سووك ترە.

### قاتەکانی دۆزەخ

جەهەننەم حەوت تەبەقەیەو هەر تەبەقەی درگایەکی هەیە. قاتو تەبەقەی یەکەم بەتایبەتی بۆ موسڵمانە گوناهکارەکانو ئەو کافرانەیە کە هەرچەند موشریك بوون، بەڵام پارێزگاریان لە پێغەمبەران دەکرد. تەبەقەکانی تریش بۆ موشریكو ئاگرپەرستو مولحید مەسیحیو جوولەکەو موناقیقانو ناویان ((جەحیم))و ((جەهەننەم))و ((سەعیر))و ((سەقەر))و ((لظى))و ((هاویە))و ((حە طە مە)) یە وە هەر یەکیان زۆر گەورەنو عەزابی جۆراوجۆرایان هەیەو خانووەکانیان ژێ جیاوازن خانوویەك ناوی غەیبە ڕۆژی چوارسەد جار جەهەننەمیەکانی تر پەنا دەگرن لە خوا لە عەزابی ئەو جێگایە ،چونکە عەزابی زۆر بە شیددەتە، جێگایەکی تر ناوی (زمهریر)ە و زۆر ساردە. شوێنێکی دی ناوی (چاڵی غەمانە) . جێگایەکی تر بە (گوڵی ژەهر) بەناوبانگە. جێگایەکی دی ناوی (صعود) ە زۆر بەرزە، کافران دەبەن لەویدا بەریان دەدەنەوە بۆ ناو دۆزەخ. حەوزێك ناوی (حەمیم)، ئاوەکەی ئەوەندە گەرمە کاتێ گەیشتە لێوان، لێوی سەرەوە ئەوەندە داوسێ، چاو ولووتی ون دەبنو لێوی خوارەوەشی تاسەر سینگو ناوکی دادەشۆڕێو زمانی دەسووتێو دەمی چوك دەبێتەوە. ئەگەر بە قوڕگیدا بڕوا تا

خوارەوەی سی یەکانی و مەعیدەو ڕیخۆڵەکانی لەت لەت دەکا. حەوزێکی دی ناوی(غسان) ە پڕە لە ئارەق و خوێنی کافران، زۆر جیگای سامناکتری دیش لە دۆزەخدا هەن.

بەدەنی دۆزەخیان گەورە دەکرێ تا توانای ئەو هەموو عەزابەیان هەبێ، چونکە بە ئەنواعی عەزاب عەزابیان دەدەن. سەرەڕای ئەوەش عەزابی برسیی یەتی لە هەمووان خەراپترە. هاوار دەکەن لە برسان میوەی داری (زقوم)یان بۆ دێنن کە زۆر تاڵ و دڕکاوییەو لە ناوەڕاستی جەهەننەمدا دەڕوێ کاتێ دەی خۆن لە قوڕگیان دەمێنێ و هاوار دەکەن دەڵێن: لە دنیادا ئەگەر پاروومان لە قوڕگ بگیرایە بە ئاو دەمان بردە خوارەوە، داوای ئاو دەکەن، دەستوور دەدرێ لە (جەحیم) ئاویان بۆ بێنن، کە ئاوی (جەحیم)یان دانێ لێویان بەر دەبێتەوە بۆ سەر سینگیان و زمانیان دەگیرێ و قوڕگ و ڕیخۆڵەیان لەت لەت دەبێ و بە خوارەوەیاندا دێـە خوارێ. زۆر ناڕەحەت دەبن، لای داڕۆغەی دۆزەخ دەڵێن: بمان کوژە با لەو موسیبەتە نەجاتنمان بێ.

لەپاش هەزار ساڵ جوابیان دەدەنەوەو دەڵێ: هەتا هەتایە لێرە دەمێننەوە. ئینجا لەبەر خوا دەپاڕێنەوە کە بمرن و ڕزگاتریان بێ. لە پاش هەزار ساڵ وەڵامیان دەدرێتەوە کە ئەوە جێگاتانە بێ دەنگ بن. ئینجا بۆ خۆیان بە خۆیان دەڵێن: سەبر نەبێ هیچ چارەیەکمان نیە. ئەوەیە نموونەیەك لە چۆنیەتی عەزابی کافران لە ڕۆژی قیامەتدا.

## چۆنیەتی چوونی دۆزەخیان بۆ دۆزەخ

چۆنیەتی چوونی جەهەننەمیان بۆ جەهەننەم لە ئایەتی خوای گەورە لە قورئاندا باس کراوە، لە سوورەی (مریم) دا دەفەرمووێ: ﴿ وَنَسُوقُ ٱلْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا ﴿٨٦﴾ ﴾ مریم: ٨٦ واتە سەوق دەکەین گوناهباران بۆ جەهەننەم لە حاڵی تینویەتیدا.

لە سوورەی (قمر)دا دەفەرمووێ: ﴿ إِنَّ ٱلْمُجْرِمِينَ فِى ضَلَٰلٍ وَسُعُرٍ ﴿٤٧﴾ ﴾ القمر: ٤٧ لەو ڕۆژەدا ڕادەکێشرێن بۆ ناو ئاگری جەهەننەم و لەسەر ڕووانیان پێیان دەگوترێ: بیچێژن عەزابی دۆزەخ. لە سوورەی (شعراء) دا دەفەرمووێ: ﴿ فَكُبْكِبُوا۟ فِيهَا هُمْ وَٱلْغَاوُۥنَ ﴿٩٤﴾ وَجُنُودُ إِبْلِيسَ أَجْمَعُونَ ﴿٩٥﴾ ﴾ الشعراء: ٩٤ - ٩٥ لەسەر ڕووانیان لەگەڵ گومڕاو لەشکری شەیتان دەیان بەن بۆ دۆزەخ.

لە سوورەی (الرحمن) دا دەفەرمووێ: ﴿ يُعْرَفُ ٱلْمُجْرِمُونَ بِسِيمَٰهُمْ فَيُؤْخَذُ بِٱلنَّوَٰصِى وَٱلْأَقْدَامِ ﴿٤١﴾ ﴾ الرحمن: ٤١ گوناهبار بە نیشانە دەناسرێنەوەو ناوچاوان و قاچیان دەگرن و هەڵیان دەدەنە ناو دۆزەخەوە.

لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا (ابن عباس) دەفەرمووێ: دەست و قاچیان دەبەستن و وەك دار تێکیان دەشکێنن و فڕێیان دەدەنە جەهەننەمەوە. ئەمانەو چەند ئایەتی تریش باسی چۆنیەتی چوونی گوناهکاران دەکەن بۆ جەهەننەم. پەنا دەگرین بە خوا لە عەزابی جەهەننەم.

## قسەی شەیتان لەگەڵ دۆزەخیان

لە لایەك دۆزەخی لە پەیڕەوی شەیتان پەشیمان دەبنەوەو لە لایەکی ترەوە خواوەندی گەورە سەر زەنشتیان دەکاو لە لایەکی دیکەشەوە وەك لە سوورەی (ابراهیم)دا دەفەرمووێ: ئاوایان پێ دەڵێ: کاتێ ئەمری خوا هاتە دی، بەڕاستی خوا وەعدەی ڕاستی دا بە ئێوەو منیش وەعدەی بە درۆم پێ دان. خۆ من هیچ دەسەڵاتێکم بەسەر ئێوەدا نەبوو، تەنیا ئێوەم بانگ کرد وەڵامتان دامەوە، کەواتە لۆمەی من مەکەن، لۆمەی نەفسی خۆتان بکەن، نە من فریای ئێوە دەکەوم، نە ئێوە فریای من دەکەون. کاتێ شەیتان خۆی بە بێ تاوان دادەنێ دۆزەخیەکان ڕوو دەکەنە مالیکی جەهەننەم و دەڵێن: لەخوا داوا بکە با ڕۆژێك عەزابمان لەسەر سووك بکا. وەك لە سوڕەی (غافر)دا لە

وەلاَمیاندا دەڵێن ﴿ قَالُوٓاْ أَوَلَمۡ تَكُ تَأۡتِيكُمۡ رُسُلُكُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِۖ قَالُواْ بَلَىٰۚ قَالُواْ فَٱدۡعُواْۗ وَمَا دُعَٰٓؤُاْ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ ﴿٥٠﴾ ﴾ غافر: ٥٠ ئایا پێغەمبەران ئایەتیان بۆ نەهێنان؟ دەڵێن: بەڵێ، بەلاَم بە قسەمان نەکردن، مالیکی دۆزەخ و مەلائیکەتەکان دەڵێن: کەواتە دۆعا بکەن، هەرچەند دوعای کافرانیش بە هیچ ناچێ.

## چەند دۆعایەك بۆ نەجات لە دۆزەخ

ئەبوو داوود لە ((ابن عباس))ەوە ڕیوایەت دەکا کە فەرمووی: ڕەسولی خوا ﷺ چۆن فێری ئایەتی قورئانی دەکردین ئاواش ئەو ئەو دوعایانەی فێر دەکردین (اللهم انی اعوذ بك من عذاب جهنم، و اعوذ بك من فتنة المسح الدجال، واعوذ بك من المحيا والممات)) ، ڕۆژێك ڕووی موبارەکی کردە ئەسحابەیەك کە ناوی (مسلم)) بوو فەرمووی: لە پاش نوێژی مەغریب و لە پێش ئەوەدا قسە بکەی حەوت جار بڵێ: (اللهم اجرنی من النار) ، ئەگەر حەوت جار ئەوە بڵێی و ئەو شەوە بمری لە عەزابی جەهەننەم نەجاتت دەبێ. وە ئەگەر لەپاش نوێژی بەیانی حەوت جار ئەوە بڵێی و ئەو ڕۆژە بمری، هەر لە عەزابی دۆزەخ نەجاتت دەبێ.

فەرمووی: ئەوەی سێ جار لەبەر خوا وەپاڕێ و داوای بەهەشت بکا بەهەشت دەڵێ: ((اللهم ادخله الجنة)ئەی خوایە داخلی بەهەشتی بکە. وەئەوەی سێ جار پەنا بگرێ لە خوا لە دۆزەخ، دۆزەخ دەڵێ: ((اللهم اجره من النار)) .ئەی خوایە! لە ئاگری دۆزەخی بپارێزە.

ئەوەی لەبارەی جەهەننەم و جەهەننەمیانەوە تا ئێستا باسمان کرد، بۆ ئەوە نەبوو کە هەر وەی خوێنین و فەرامۆشی بکەینەوە؟ وەك حیکایەت و داستان؟ چونکە ئەوەی تا ئێستا باسمان کرد هەمووی ڕاستەو لە ئایەت و حەدیس

وەرگیراوە. جا ئەگەر ئەو باسانە وەخوێنین و تەماشایەکی کردەوەی خراپی خۆمان بکەین با زۆریش دڵڕەق بین دەتوانین بە ئاسانی ژیانی خۆمان بگۆڕین و ڕوو بکەینە چاکە بەو شەرتەی ئیمانمان بە خواو پێغەمبەر بێ.

خواو پێغەمبەر فەرموویانە: موسڵمان هەمیشە بیر لە کردەوەی خۆی دەکاتەوەو لە خودا داوا دەکا لە دۆزەخ بی پارێزێ.

جا ئەوەی ئیمانی هەبێ ژیانی خۆی بە تەواوی بە دنیاوە خەریك ناکا.

موسلیم و بوخاری دەفەرموون: پیغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جەهەننەم لەناو لەززەت و خۆشیانداو بەهەشت بە ناخۆشیان دەورەیان گیراوە. واتە ئەوەی غەرقی لەززەت و خۆشی دنیا بێ جەهەننەم لە پشتی پەردەوە خۆی بۆ پەنهان داوەو ئەوەی خەریکی کاری باشیش بێ بەهەشت خۆی بۆ ئامادە کردووە.

ئەوەی بیر لە برسی یەتی دۆزەخ بکاتەوە ڕۆژوو تەرك ناکا و ئەوەی یادی ئەزیەتی دۆزەخ بکاتەوە تەرکی نوێژ ناکا و ئەوەی بیر لە مارو دوپشکی قەبرو جەهەننەم بکاتەوە بێ ئەمری خوای ناکا.

بەلام بە داخەوە ڕاستیەکەی ئەوەیە کە بەلام وایە باسی بەهەشت و جەهەننەم هەر بە زمان باس دەکەین و بەدڵ ئیمانمان پێی نین، یان ئەگەر ئیمانیشمان پێی بن ئیمانەکەمان زۆر زەعیفە، دەنا نەك گوناهی کەبیر، بەڵکو گوناهی سەغیرەشمان نەدەکرد.

حەزرەتی عەلی رضي الله عنه دەفەرمووێ: ئەگەر بەهەشت و جەهەننەم لە بەر چاوم ڕاگرن ئیمانم فەرق ناکا ئەوەندەم ئیمان بە غەیب هەیە. جارێك پێغەمبەر ﷺ لە جوبرەئیلی پرسی ئەرێ هۆی چیە کە قەد نابینم میکائیل پیبکەنی؟

گوتی: لەو کاتەوە جەهەننەم درووست کراوە میکائیل پێ نەکەنیوە . لە ڕیوایەتێکدا دەڵێ: جارێك حەزرەت ﷺ فەرمووی: قەسەم بەو زاتەی کە ڕوحی منی بە دەستە، ئەو دیمەنەی من دیومە ئێوە ببیینن کەم پێ دەکەنین و زۆر دەگریان. عەرزیان کرد قوربان! چت دیوە؟ فەرمووی: بەهەشت و دۆزەخ. خولاسە ئەو کەسە عاقلە کە بیر لە دواڕۆژ بکاتەوە بۆ ماڵ و سەروەت و جێگاو مەقام ئابڕووی دنیا و قیامەتی خۆی نەبا و ئەگەر تووشی عەزاب بوو پەشێمان بوونەوە نەبێ هیچی پێ نامێنێ. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تا دەتوانن بۆ بەهەشت هەولاً بدەن و لەبەر دۆزەخ ڕابکەن.

## دیمەنەکانی بەهەشت

کەلیمەی (جنت) لە لۆغەتدا بە مەعنا داپۆشراوە، بەلام لە لای عولەمای ئیسلام ناوە بۆ ئەو جێگایە کە پیاو چاکان و فەرمانبەردارانی خوا لەپاش مردن بۆ هەتا هەتایە لەوێدا ژیان دەبەنە سەر. بۆیەش ناوی ئەو جێگایەیان ناوە (جنت) چونکە لە دنیادا کەس نای بینی خوای گەورە ئاسایش و نیعمەتی بەهەشتی لە دنیادا بەکەس نیشان نەداوە، هەروەك لە سورەی (سجدە)دا دەفەرمووێ: ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾ السجدة: ١٧ واتە کەس نازانێ لە پاداشتی کردەوەی چاك چی بۆ دانراوە کە دەبێتە هۆی دڵخۆش بوونی و بەهەشتی بەرین کە لەبارەی پانی و درێژی بەهەشتدا خوای گەورە لە سورەی (ال عمران)دا دەفەرمووێ: ﴿ وَسَارِعُوٓا۟ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٣﴾ ﴾ آل عمران: ١٣٣ بەهەشتێ کە پانی بە ئەندازەی بەینی ئەرزوو ئاسمانە ئامادەکراوە بۆ پەرهێزکاران.

شێخی موسلیم و بوخاری حەدیسێکیان ڕیوایەت کردووە دەفەرمووێ: ئەوەی لە دنیادا لە خوا بترسێ لە بەهەشتدا دوو باغی گەورەی دەدەنێ، ئەوەندە گەورەو پان و بەرینن ئەگەر پێیاندا بگەڕێی بەسالێك نا بە دە سالْ دەتوانی تەماشایان بکا. بۆ هەر موسلْمانێك سەراو پەردەیەك دەڕازێتەوە درێژی شەست میلە، لەهەر گۆشەیەکدا ئافرەتێك دانیشتووە، ئەوەی گۆشەکەی دی نایبینێ.

شێخی ترمزی لە حەدیسدا دەفەرمووێ: بەهەشت سەد تەبەقەیە، بەینی هەر تەبەقەیەکی لەگەلْ ئەوەی دی وەك بەینی ئەرزو ئاسمان وایە، ناوی بەرزترین تەبەقە (فیردەوسە)و عەرشی خوا لەسەر (جنە الفردوس) ە. جا هەرکاتێ داوای بەهەشتان کرد داوای (جنە الفردوس) بکەن.

حەزرەت ﷺ فەرمووی: ئەهلی بەهەشت کە تەماشای تەبەقەکانی سەرەوە دەکەن وەك لە ئەستێران بڕوانن وایە، ئەوەندە بەرزن. ئەسحاب عەرزیان کرد ئەی ڕەسولی خوا! ئەو تەبەقانە بۆ پێغەمبەرانن ئایا کەسی دی دەتوانێ بگاتە ئەوێ؟ فەرمووی: بۆ ناتوانیی، قەسەم بەو زاتەی کە گیانی منی بەدەستە، ئەوەی ئیمانی بەخواو پێغەمبەری خوا هێنابێ دەتوانێ بچێتە ئەوێ و دەچێ. فەرمووی: بەهەشت سەد تەبەقەیە، هەر تەبەقەی بەشی تەواوی خەلْك دەکا. گوتیان: بەو گەورەییە لە کوێ دەبێ؟ فەرمووی: چۆن ئێستا ئاسمان سەقفی دنیایە ئەوکاتە عەرش دەبێتە سەقفی بەهەشت. گوتیان: ئەوکاتەئاسمان هەروەك ئێستا دەبێ یان نا؟ فەرمووی: نەخێر. ئەوکاتە ئاسمان شەق دەبێ و چەند ڕێگای بۆ بەهەشت پێدا دەڕوا. گوتیان: ئەی ئەگەر ڕۆژ نەما بەهەشت تاریك دەبێ یان ڕووناك دەبێ؟ فەرمووی: بەلێ ڕووناك دەبێ لە عەرشی خواوە نووری بۆ دێ و کە شەو داهات پەردەکانی بەهەشت دادەدرێنەوەو خەلْك دەزانێ کە وەختی ئیسراحەتەو کە ڕۆژ بووەوە لایان دەدەن دەزانن ڕۆژەو کاتی گەڕان و سەیرانە.

عەرزیان کرد قوربان بەهەشت لە چی دروست کراوە؟ فەرمووی: دیوارەکانی خشتێك لە زێرو یەك لە زیوەو لەباتی بەردە ورتکە گەوهەرو یاقوتەو لە باتی گل زەعفەرانی زەردو بۆن خۆشەو ئەوەی چوە بەهەشت زۆر بە خۆشی دەژیو قەت نامرێو ڕۆژبەڕۆژ گەنج تر دەبتەوە.

عەرزیان کرد ئەو خەڵکە کەی دەچنە بەهەشت؟ فەرمووی: کاتێ ئەو دنیایە وێران بوو خوای گەورە ئەمر دەکا ڕۆژی قیامەت بەرپا دەبێو هەموو کەس دووبارە زیندوو دەکرێتەوەو لە نزیك تەرازوی عەدالەت کۆیان دەکەنەوەو لە پاش موحاسەبە ئەوەی چاك بێ دەی بەن بۆ بەهەشتو ئەوەی خەراپ بێ دەی بەن بۆ جەهەننەم.

لە ئایاتو حەدیسدا دەردەکەوێ کە بەهەشت لە پاداشتی چاکەو ئیتاعەی خوادا دەدرێ بە ئینسان، ئێمە زۆرمان لا سەیرە بۆچی وایە؟ بۆ دەبێ لە دنیادا کاری چاکە بکەین کەچی پاداشتیان لە دواڕۆژدا وەرگرین؟ ئێمە نازانین کەی دەمرین؟ کەی ڕۆژی قیامەت بەرپا دەبێ؟ کەی پرسیارمان لێ دەکرێ؟ کەی دەچینە بەهەشت؟ بۆچی هەر لەو دنیایەدا پاداشتی چاکەکانمان نادەنەوە؟ ئایا خوا ناتوانێ لەم دنیایەدا پاداشتمان بداتەوە؟

لە وەڵامدا دەڵێین: بەڵێ گوێ گری موسلمان، خوا دەتوانێ هەر لەم دنیایەدا پاداشتمان بداتەوە، بەڵام خوای تەعالا خاوەن حیکمەتەو حیکمەتی خوا واتە قازا دەکا کە هەموو کەس بۆ جەزاو سزای کردەوەی چاوەڕوانی ڕۆژی قیامەت بکاو حاڵی ئینسان دەکرێ بە سێ نەوع.

نەوعی یەکەم: ئەوەیە لە ژیانی دنیادا ئینسان سێ حەقی هەیە، هەقی خواردنو خواردنەوەو ئیسراحات کردن، خولاسە ئینسان لەم دنیایەدا پێویستی بە سەدان شتی ژیانەوە هەیە کە پێیان دەڵێن: حقوقی نەفس.

نەوعی دووەم: بریتی یە لە چەند حەقێك، وەك حەقی ژن‌و مێردو باوك‌و دایك‌و دۆست‌و خزم. ئینسان ناچارە شەریكی غەم و شادی خەڵك بیٚ‌و مەسرەفی ژیانی هەندێكیان وەئەستۆ گریٚ، كە ئەو جۆرە حەقانە پێیان دەڵێن: (حقوق العباد) .

نەوعی سێیەم: بریتیە لە ئیتاعەی مەلیكی حەقیقی‌و مەسولی‌یەتی عیبادەتی خوا، بۆ وێنە دەبیٚ نوێژ بكەی، ڕۆژووبگری، حەج بكەی، زەكات بدەی، چاكە بكەی. خولاسە ئینسانی بیٚ چارە قەت لە دنیادا ئازدو بیٚ خەیاڵ نیە، بۆیە بە دنیا دەڵێن (دار العمل و دار المحنت) خواوەندی گەورە لە زۆر ئایەتی قورئاندا باسی بەهەشت‌و نازو نیعمەتی بەهەشتی كردووە، بۆ وێنە لە سوورەی (نباء)دا دەفەرمووێ: بەڕاستی هەیە بۆ پەرهێزكاران جێگای خۆش‌و ڕەزوو باغ‌و كچی مەمك هەناری و هاوتەمەن‌و پیاڵەی پڕ شەراب. نە قسەی لەغو دەبیسن، نە درۆ دەبیستن. پاداشتێكە لە لایەن خوای تۆوەو بەخششێكی تەواو حیساب كراوە.

## دەرسی بیست و یەك

## ئەحوالی بەهەشت لە زمان پێغەمبەرەوە

شێخی ترمزی لە ئەنەسەوە ڕیوایەت دەکاو دەفەرمووێ: عەرزی پێغەمبەرم ﷺ کرد لە ڕۆژی قیامەتدا شیفاعەتم بۆ دەکەی؟ فەرمووی: بەڵێ شیفاعەتت بۆ دەکەم. عەرزم کرد جا لەو ڕۆژەدا لە کوێت وەبینم؟ فەرمووی: لە پێش هەموو شتێکدا لە نزیك پردی سیڕات. عەرزم کرد ئەی ئەگەر لەوێ نەبووی؟ فەرمووی: لە نزیك تەرازوی عەدالەت. دووبارە گوتم: ئەی ئەگەر لەوێش نەبووی؟ فەرمووی: ئەگەر لەوێ نەبووم وەرە لە لای حەوزی کەوسەر دەم بینی. فەرمووی: حەتمی لە نزیك یەکێك لەو سێ جێگایە دەت بینم.

شێخی موسلیم و بوخاری ڕیوایەت دەکەن کە حەزرەت ﷺ فەرموویەتی: کاتێ بەهەشتی چوونە بەهەشت و جەهەننەمی چوونە جەهەننەم، مەرگ لەسەر وێنەی مەڕێك دێنن لە بەینی بەهەشت و دۆزەخدا سەری دەبڕن و جارچی یەك جار دەدا دەڵێ: ئەی خەڵکی بەهەشت تازە مەرگ نەماو ئەی ئەهلی دۆزەخ تازە کەس نامرێ، بە بیستنی ئەو جارە خەڵکی بەهەشت دوو بەرامبەر خۆشحاڵ دەبن و دۆزەخی زیاتر غەمبار دەبن.

## باسی حۆری بەهەشت

شێخی بوخاری لە پێغەمبەرەوە ﷺ ڕیوایەت دەکا کە فەرموویەتی: بەیانی و ئێوارە لەڕێگای خوادا لە دنیاو مافیها باشترە. فەرمووێ: ئەگەر ژنێك لەبەینی ژنەکانی بەهەشتدا بە تیلە چاوێك لە دنیا بڕوانێ لەبەر چاوی جوانی تەواوی خەڵکی ڕۆژهەڵات و ڕۆژ ئاوا ڕووناك دەبێتەوەو بۆنی خۆشی دنیا پڕ دەکا. فەرمووی: لە بەهەشتا ناوچاوانی پێغەمبەران وەك مانگی

شەوی چواردە دەبیّ و ناوچەوانی دەستەی دووەم وەك ئەستێران دەبن و هەر پیاوەی دوو ژنی دەبیّ چاویان لە غایەت بەدەر گەورەو سپی و ڕەش دەبن و هەریەکەی حەفتا دەستی لیباس لەبەردادەبیّ، بەلاّم لەبەر تەنکی و نازکی بەدەنیان مۆخی ناو ئێسکانەکانیان لە ژێر ئەو لیباسانەوە دیارە.

دانیشتوانی بەهەشت هەمیشە خەریکی ڕابواردن و زکری خوان. نە نەخۆش دەکەون، نە میز دەکەن، نە تف فڕیّ دەدەن، قاپ و قاچاغیان لە زێڕو ئاڵتونە و بە جێگای خەڵووز عود دەسوتێنن و بۆنی عەرەقیان وەك بۆنی میسك وایە و لەگەڵ یەکتر زۆ خۆش ڕەفتار دەبن بالاّیان وەك بالاّی حەزرەتی ئادەم دەبیّ.

لە بەهەشتا کۆڕێك دەگیریّ، حۆری بە دەنگی بەرز نەشیدێك دەڵێن: خەڵك تا ئەو کاتە نەیان بیستووە، مەعناکەی ئەوەیە دەڵێن: هەمیشە ئێمە زیندوو ئەبین و نامرین. ئێمە بۆ ئارامش و ئاسایش و ئیسراحەت درووست کراوین و قەت نارەحەت نابین، ئێمە هەمیشە ڕازین و قەت نارازی نابین، ئێمە پیرۆزبایی و بەخێرهاتنی ئەو کەسانە دەکەین کە ئێمە بۆ ئەوان و ئەوان بۆ ئێمەن. فەرمووی: لە بەهەشتا بازاڕێك دادەنریّ خەڵك ڕۆژی جومعان دەچن بۆ ئەو بازاڕە، کاتیّ دەگەنە ئەو بازارە بای شەماڵ لێیان دەداو بە ئەنواعی عەتر بۆن خۆشیان دەکا. کاتیّ دەچنەوە ماڵەوە تووشی بەهەشتیەکان دەبن پێیان دەڵێن: بەڕاستی کاتیّ چوونە دەرەوە ئاوا جوان و بۆن خۆش نەبوون. ئەوانیش بە دانیشتوانی ماڵەوە دەڵێن: بەخوا ئێوەش لەپێش چاوی ئێمە زۆر جوانتر بوون.

ڕۆژێك سەعیدی کوڕی موسەییەب لە بازاڕی (مەدینە) دا تووشی ئەبو هوڕەیرە ﵁ بوو، ئەبوو هوڕەیرە ﵁ فەرمووی: ئەی سەعید داوا لە خوای گەورە دەکەم لە بازاڕی بەهەشتا ئاوا چاومان بەیەکتر بکەوی سەعید عەرزی

کرد بۆچی لە بەهەشتا بازاڕ هەیە؟ گوتی: بەڵێ: چونکە جارێك پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کاتێ ئەهلی بەهەشت چوونە بەهەشتەوە، هەرکەس بە گوێرەی عەمەلی خۆی مەنزلی دەدرێتێو ئەوەی چاکەی زۆرترو باشتر بوو جێگای بەرزترە. ئینجا لە ڕۆژی جومعەدا دەستووریان پێ دەدرێ کە لە ماڵ بێنە دەرەوەو بچن بۆ ئەو بازاڕو غەرازاوەی کە بە خەیاڵدا نایە چۆن ڕازێندراوەتەوە بە ئەنواعی کورسیی و مێزو سەندەڵی نوورو دڕو یاقوت و مرواریو زومەڕڕەدو تەلاو هەرکەس جێگای تایبەتی بۆ دیاری دەکرێو بە خزمەت خوا دەگەن.

ئەبوو هورەیرە ﷺ دەڵێ: عەرزی عەزرەتم کرد! بۆ بەخزمەت خوا دەگەین؟ فەرمووی: بەڵێ چۆن ڕۆژو مانگی شەوی چواردە دەبینین ئاواش لە بەهەشتا خوا دەبینن فەرموی کاتێ بە خزمەت خوا گەیشتین هەورێکی گەورە پەیدادەبێ عەتر بارانمان دەکا. جا لە لایەن خواوە دەڵێن: هەستن بڕۆن بۆ ئەو بازارە چی دڵتان دەی هەوێ ئامادەیە مەلائیکە لە هەر چوارلاوە بە سەف وەستاون، کاتێ دەچینە ئەو بازارە شتی وای لێ یە کە تا ئەو کاتە نە هیچ چاوێك دیویەتی، نە هیچ گوێیەك بیستوویەتی، نە بە خەیاڵی کەسدا هاتووە. لەپاشان هەرچی بتەوێ بە خۆڕایی دەتدەنێو کاتێ گەڕایەوە بۆ ماڵەوە حۆرییەکان دەڵێن: بەڕاستی کە ڕۆیشتن ئاوا ڕوو خۆش و جوان نەبوون، لە وەڵامدا دەڵێن: ئاخر بە خزمەت خوا گەیشتین بۆیە وا جوان بوین.

بوخاری دەفەرمووێ: جارێك پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوای گەورە بە دەنگی بەرز بە پیاوو ئافرەتی بەهەشت دەفەرمووێ: ئەی دانیشتوانی بەهەشت! لە وەڵامدا دەڵێن: بەڵێ ئەی خوای گەورە لە خزمەتت داین. خوای گەورە دەفەرمووێ: ئایا لە من ڕازین؟ عەرزی بارەگای ئەقدەس دەکەن بەڵێ

ئەی خوای گەورە، جا ئەگەر لە تۆ ڕازی نەبین لە کێ ڕازیین؟ ئینجا خوای گەورە دەفەرمووێ: ئایا دەتان هەوێ شتێکی لەوەش زیاتروگەورەترتان خەلأت کەم؟ عەرزی دەکەن جا چی لەوە گەورەترو باشتر هەیە کە ئێستا داوتە بە ئێمە؟ ئینجا خوا دەفەرمووێ: ڕەزاییەت نامەتان دەدەمێ کە لەوڕۆ بەدواوە غەزەبتان لێ ناگرمو لێتان ڕازی دەبم کە بەڕاست ڕەزابوونی خوا لە هەموو نیعمەتی بەهەشت گەورەترە خوای گەورە بە نسیبمان بکا.

شێخی ترمزی لە ئەبوو ئەییوبی ئەنساریەوە ﵁ نەقڵ دەکا دەفەرمووێ:

جارێك کابرایەکی دێهاتی هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و عەرزی کرد ئەی ڕەسولی خوا! من ئەسپم زۆر خۆش دەوێ، ئایا لە بەهەشتا ئەسپ هەیە؟

حەزرەت ﷺ فەرمووی: ئەگەر چوویە بەهەشت ئەسپێکت دەدەنێ لە یاقووت درووست کرابێ‌و دوو باڵی هەبێ، سواری ئەو ئەسپەت دەکەن‌و کوێت پێ خۆش بوو دەتباتە ئەوێ. گوایا ئەو ئەسپە لە جێگای تەیارەی بەهەشتە چۆن تەیارەی دنیا وەك ماسی یە.

تەیارەی بەهەشت لەسەر وێنەی ئەسپ دەبێ‌و چۆن تەیارەی دنیا زۆری لە ئەلەمنیۆم درووست کراوە، تەیارەی بەهەشتیش لە یاقووت درووست دەکرێ.

جێگای زۆر سەرەنجە کە زۆر لە بێ دینان توانای دەرکی مەعنای ئەو حەدیسەیان نیەو بە ئەنواعی جۆراوجۆر ڕەخنەیان لەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ گرتووە. بەڵام شوکر بۆ خوا کە درووست کردنی تەیارە ئەو جۆرە کەسانەی بێ دەنگ کرد.

## درەختی بەهەشت

شێخی ترمزیو خاوەنی (مظاهر حق) ئاوا باسی درەختی بەهەشت دەکەن.

دەڵێن: ڕەسولی ئەکرەم ﷺ فەرمویەتی: دارێك نیە لە بەهەشتا کە قەدەکەی تەلاّ نەبیّو لقەکانی هەر دارێك لەگەڵ دارێکی تر فەرقی نەبیّ؟ بۆ وێنە دارێك لقی تەلاّیە، یەکیّ تر لقی یاقووتە، یەکیّ لقی زومەڕڕە، یەکیّ لقی مرواری یە، هەر لقەی گوڵی جیاجیا و هێشوی تایبەتی خۆی هەیەو هەر دارە جۆگە ئاوێکی بە بندا دەڕوا.

ئەسمای کچی حەزرەتی ئەبوو بەکر رضی الله عنە دەفەرمووێ: جارێك لە مەجلیسی موبارەکی پێغەمبەر ﷺ باسی ((سدرەالمنتهی)) کرا، حەزرەت ﷺ فەرمووی: داری (سدرەالمنتهی) ئەوەندە گەلاّ زۆرو پڕە، ئەگەر سوار چاکێك بە سێبەرەکەیدا ئەسپ لینگدا بە سەد ساڵ لێی دەردەچیّ.

مەلائیکەی نوورانی وەك کوللە چۆن بە درەختەوە دەنیشێتەوە ئاوا لەسەر لقەکانی هەڵنیشتوون تەسبیحاتو حەمدو سەنای خوا دەکەن. ((سدرەالمنتهی) ناوی ئەو درەختەیە کە لە ئاسمانی شەشەمەوە گەیوەتە ئاسمانی حەوتەومو درێژی پێنج سەد ساڵ ڕێگایەو لەوێوە زانیاری ئەووەڵو ئاخر تەواو دەبیّو هیچ کەس نازانیّ لەویّ بەولاوە بەرەو ژوورتر بڕوا . ئەویّ مەقامی جوبڕەئیلەو ئەویش ناتوانیّ لەویّ تێپەڕبیّ. تەنیا ئەو ئیختیفارە بە نسیبەت پێغەمبەری ئێمە بوو کە لە شەوی میعراجدا لەوێش تیّ پەڕیو چووە ئەو جێگایەی کە نە مەلائیکە، نە هیچ پێغەمبەرێك نەگەیوەتە ئەویّ.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: موسڵمانانی جەهەننەمی وەك سواڵ کەر و گەدا لەسەر ڕێگای بەهەشتیان بە سەف ڕادەوەستن، بە ڕێکەوت بەهەشتییەك بەلایاندا دەڕوا ، کاتێ موسڵمانێکی دۆزەخی چاوی پێدەکەوێ بانگی دەکا ئەی فلاّن کەس من ناناسی؟ من ئەو کەسەم کە لە دنیادا جارێك ئاوم دایەی خواردتەوە. یەکێ دی دەڵێ: منیش ئەوکەسەم کە فلاّن جار ئاوی دەست نوێژم بۆ پەیدا کردی. کابرای بەهەشتی دەڵێ ڕاست دەکەن و لای خوا شیفاعەتیان بۆ دەکاو دەیانبەن بۆ بەهەشت.

واتا هەر فاسق و گوناهکارێك لە دنیادا خزمەتی پیاو چاکان و دینداران و زانیان و عیبادەت گوزاران بکا لە ڕۆژی قیامەتدا لە پادشتی ئەو خزمەتەدا شیفاعەتی بۆ دەکەن و دەیان بەن بۆ بەهەشت.

لەو حەدیسە موبارەکەدا پێغەمبەر ﷺ موسڵمانان هەڵدەنێ بۆ ئەوەی خزمەتی عالم و پیاو چاکان بکەن، چونکە لەوانەیە بە هۆی کردەوەی خەراپی خۆیان موستەحەقی چوونە جەهەننەم بن و بە هۆی خزمەت بە زاناو پیاوچاکان، ئەوان شیفاعەتیان بۆ بکەن، بیان بەن بۆ بەهەشت. بۆیە حەزرەت ﷺ فەرمووی: بچنە مەجلیسی عولەماو بەدڵ خۆشتان بوێن، چونکە هات و چۆی لای عولەما زینەتی دنیایەو هۆی ڕزگاری ڕۆژی قیامەتە.

## باڵندەی بەهەشت

خواوەندی گەورە لە سوورەی (واقعەدا) دەفەرمووێ: ﴿ وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ الواقعة: ٢١. لە گۆشتی باڵداران هەرچی ئارەزوو بکەن دەرخواردیان دەدرێ.

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرمووێ: جارێك حەزرەت ﷺ فەرمووی: لە بەهەشتا باڵندەی گەورەی وا هەیە بەقەدەر وشتر دەبێ و هەمیشە لە مێرگ و مێر غوزاری بەهەشتا دەلەوەڕێ.

حەزرەتی ئەبوو بەکر ﷺ و فەرمووی یا ڕسول الله بەڕاستی ژیانیان خۆشە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ژیانی ئەو کەسانە خۆشترە کە ئەو باڵندانە دەخۆن. سێ جار ئەو جوملەی گوتەوەو فەرمووی: ئەی ئەبوو بەکر مژدە بێ تۆ لەو کەسانە دەبی.

ئەبوو ئومامە فەرموویەتی: کاتێ یەکێك لە بەهەشتی یەکان ئارەزووی گۆشتی ئەو باڵندانە بکا باڵندەکە بە سوورەوەکراویی دێتە بەردەمی و تێری لێ دەخواو لە پاشان هەڵدەفڕێتەوە.

## دۆعای تایبەتی حۆریان و هاودەردی لەگەڵ مێردەکانیان

بەیهەقی لە (شعب الایمان)دا لە زمان (عبدالله)ی کوڕی حەزرەتی عومەرەوە ﷺ ڕیوایان دەکا کە بە بێ شك بۆ بە پیرەوەچوونی مانگی ڕەمەزان لە شەوی یەکەمەوە تا ئاخری، بەهەشت دەرازێننەوە. لەپاشان لە ڕۆژی یەکەمی ڕەمەزاندا لە ژێر حەرشی خودا بۆ حۆریان بایەك دێ لە درەختەکانی بەهەشت دەداو حۆریەکان دۆعا دەکەن و دەڵێن: ئەی پەروەردگار! لەناو عەبدو بەندەکانی خۆتدا کەسانێك بە مێری ئێمە دیاری بکە کە چاومان پێیان ڕووناك وەبێ.

مەعاذی کوڕی جەبەل ﷺ دەفەرمووێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کاتێك لە دنیادا ژنێك مێردەکەی خۆی ناڕەحەت دەکا، ئەو حۆرییەی کە لە بەهەشتا

بۆ ئەو کابرایە دانراوە لەعنەت لە ژنی کابرا دەکاو دەڵێ: ناڕەحەتی مەکە، چونکە هەر چەند ڕۆژێکی دی میوانی تۆیەو بەم زووانە لە تۆ جیادەبێتەوەو دێ بۆ لای من. لەو حەدیسانە وا دەر دەکەوێ کە هەروەك بەهەشتو نیعمەتی بەهەشت ئێستا هەنو مەوجودن، حۆریی یەکانیش حازرو مەوجوودن.

((حافظ منذری)) لە کتێبی ((الترغیب والترهیب) دا ڕیوایەتێکی دوور و درێژ لە دایکی موسڵمانان حەزرەتی (ام سلمه) نەقڵ دەکا کە عەرزی پێغەمبەری ﷺ کرد ئەی ڕەسولی خوا! لە بەهەشتا ئافرەتی موسڵمانی دنیا گەورەتر دەبن یان حۆری؟ فەرمووی: بەڵێ ژنی موسڵمانی دنیا لەچاو حۆری بەهەشت وەك بەرگی سەرەوەی لێفە وان حۆری وەك بەرگی بنەوەن. (ام سلمه) فەرمووی: ئەی ڕەسوولی خوا! بۆچی وایە؟ حەزرەت ﷺ فەرمووی: لەبەر ئەوەی ئافرەتی موسڵمان نوێژ دەکاو ڕۆژوو دەگرێو عیبادەتی خوا دەکا، ((ام سلمه)) عەرزی کرد ئەی ڕەسولی خوا! جاری وا هەیە ئافرەتێك شوو بە سێ پیاو دەکا ئەگەر مردوو چوە بەهەشتو مێردەکانیشی هاتنە بەهەشت بۆ کامیان دەبێ؟

حەزرەت ﷺ فەرمووی: ئەی (ام سلمەمە) ئیختیار دەدرێ بە خۆی کامەیان ئەفعالو کرداری باشتر بووبێ ئەوەیان هەڵدەبژێرێو دەڵێ: ئەی خوای گەورە! ئەوەیان لە دنیادا ڕەفتاری لەگەڵ من لە هەموویان باشتر بووە ئەوەیان بکەوە بە هاوسەری من. لە پاشان فەرمووی: ئەی (ام سلمه) خۆش ڕەفتاری لە دنیاو قیامەتا باعیسی خێروبەرەکەتە. بە ڕیوایەتێکی دی دەڵێ: ژن لە قیامەتا دەدرێ بە ئاخرین مێردی. بەهەر حاڵ حەقیقەت ئەوەیە کە ژنو پیاوی بەهەشتی کەس بێ ڕەفیق نامێنێتەوە.

ئەگەر یەکێك پرسیار بکا کە پیاو لە بەهەشتا چەند ژنی دەبێ؟ لە وەڵامدا دەڵێین: ڕاجیح بەو پرسیارە ڕیوایەتی زۆر جۆراو جۆر هەیە، یەکێك لەوانە شێخی بوخاری دەفەرمووێ: هەرکەسێ دوو حۆری دەبن بەڵام (حافظ بن حجر) رحمة الله علیة لە کتێبی (فتح الباری)دا لە مەسنەدی ئیمامی ئەحمەدەوە نەقڵ دەکاو دەفەرموێ: چوکترین خەڵکی بەهەشت بەبێ ژنەکانی دنیا حەفتاو دوو حۆری دەبێ.

لەوانەیە یەکێ بڵێ: دەی باشە ئەگەر پیاوێك ئەوەندە ژنەی دەبێ، ئەی ئافرەتێك چەند پیاوی دەبێ؟ لە وەڵامدا دەڵێین: ئەوە پرسیارێکی زۆر بێ مەعنایە چونکە ژنی زۆر بۆ پیاو بە نیعمەت حسابە بەڵام مێردی زۆر بۆ ئافرەتێك لای پیاو نەجیبو باحەیا بێ ئەدەبییەکی زۆر گەورەیەو تەنانەت لە دنیاشدا کەس قبوڵی ناکا، جا لەبەهەشتا چۆن قبوڵی دەکەن.

خوای گەورەش لەوبارەوە لە سوورەی (الرحمن)دا دەفەرمووێ: ﴿ فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرۡفِ لَمۡ يَطۡمِثۡهُنَّ إِنسٞ قَبۡلَهُمۡ وَلَا جَآنّٞ ﴿٥٦﴾ ﴾ الرحمن: ٥٦ . واتە لە ناو ژنانی بەهەشتا ئەو ژنانەن کە چاو

دەبڕنە زەوی‌و تەماشای مێردەکانیان نەبێ تەماشای کەس ناکەن واتە بە مێردێك ڕازی دەبن‌و دڵ‌و جانیان فیدای ئەو مێردەیان دەکەن، نەك وەك بەعزە کەسێك لە وەکالەتی وانەوە دەیان هەوێ چەند مێردێکیان بۆ قەرار بدەن، کاتێ ئەوان بە ئارەزووی خۆیان دڵ بە مێردێکەوە ببەستن چ کاریان بە مێردی تر هەیە؟

بەداخەوە کە ئەو جۆرە کەسانە وادەزانن کە ئافرەتی بەهەشتی وەك ئافرەتی ئەورووپا خاوەنی حەیاو حەرمەتی ئیسلامی نین، زۆر سەیرە؟ دەبوو ئەو کەسانە ژنەکانی خۆیان وەك ئافرەتی بەهەشت ڕا بێنن، کەچی لەبەر نەزانینیان دەیان هەوێ ئافرەتی بەهەشتی بێ شەرم‌و حەیاو بەڕەڵا بێ.

## دیمەنی مەرگ

شێخی ترمزی لە ئەبوو سەعیدی خدریەوە ڕیوایەت دەکا کە حەزرەت ﷺ فەرموویەتی: دانیشتوانی بەهەشت تاجی سەریان بە گەوهەرو مرواری ڕازاوەتەوە کە ئەگەر یەکێك لەو مروارییانە بێتە سەر دنیا مەشریق و مەغریب ڕووناك دەکاتەوە.

## دەرسی بیستو دوو

## ئاوی کەوسەر

شێخی بوخاری‌و ئیمامی ئەحمەد لە مەسنەددا ڕیوایەت دەکەن کە پێغەمبەر ﷺ لەبارەی حەوزی کەوسەروە فەرموویەتی: حەورزی کەوسەر بە ئەندازەی بەینی ولأتی یەمەن‌و سوورییە پانەو ئاوەکەی لە شیر سپی ترو لە هەنگوین شیرین ترەو ئەو پیاڵەو کاسەی لەدەوری دانراون بە ئەدازەی ئەستێرەکانی ئاسمان دەبن‌و ئەگەر کەسێك جارێکی لێ وەخوا تازە قەت هەست بە تینوایەتی ناکاو، یەکەم تاقم کە دەچنە سەری ئەو ئەسحابە موجاهیدانەن کە لە دنیادا لەبەر فەقیریان تووکی سەریان پەرێشان بوو، لیباسی کۆنیان لەبەر دابوو، ژنی دەوڵەمەند حازر نەبوو شوویان پێ بکا، کاتێ دەچونە بەعزە ماڵێك دەرگایان لەسەر پێوە دەدان. ئینجا حەزرەت فەرمووی: کە وەختێ لە شەوی میعراجدا چوومە بەهەشت‌و دەستم کرد بە گەڕان تەماشام کرد لەم بەرو لەو بەری ئاوێك کۆشك‌و گومبەزی ڕازاوە بە مرواری ڕازێندراوەتەوە، لە جوبرەئیلم پرسی ئەوە چیە؟ گوتی: ئەوە ئاوی کەوسەرە کە خوای پەروەردگار بە تۆی بەخشیوە. دەفەرمووێ: کە بۆنم بە خاکەکەیەوە کرد وەك میسك‌و عەنبەر بۆنی خۆش بوو. عەللامەی قورتوبی دەفەرمووێ: دوو حەوز دەدرێ بە پێغەمبەر حەوزی یەکەمیان لە مەیدانی مەحشەر دەبێ، تا ئەو کەسانەی لە قەبر دێنە دەرو دێنە مەیدانی مەحشەرو تینویانە بێن لەو ئاوە بخۆنەوەو تێنوایەتیان بشکێ.

هەروەها لە مەیدانی مەحشەردا هەموو پێغەمبەرێك حەوزێکی دەدرێتێ تا پەیڕەوەکانی ئاوی لێ وەخۆن. ئەو پێغەمبەرانە بە فەخرەوە بە یەکتر دەڵێن: وەرە با بچین بزانین کامەمان خەڵکی زیاتر دێتە سەر حەوزەکەی بۆ ئاو خواردنەوە. پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ئومێدەوارم ئەوانەی دێنە سەر

حەوزی من لەهەمووان زۆرتر بن. حەوزی دووەم کە بە تایبەتی دەدریٚ بە پێغەمبەری خۆمان و نادریٚ بە هیچ پێغەمبەرێك لە بەهەشتا دەبیٚ. ئەسحابە حەرزیان کرد ئەی پێغەمبەری خوا! لەو ڕۆژەدا دەمان ناسی یەوە؟ فەرمووی: بەڵیٚ: ئێوە وەختیٚ دێنە لای من بە هۆی دەست نوێژەوە دەستو قاچو ناوچاوانتان بۆ عەلامەتو نیشانە دەدرەوشێـەوە. جا ئەگەر یەکێك لێرەدا پرسیار بکا و بڵیٚ: ئەگەر بەجارێك ئاو خواردنەوەی حەوزی کەوسەر بۆ هەتا هەتایە تێنوایەتی لە بەین بەریٚ، جۆگای هەنگوینو شەراب بە دەردی چی دەخوا؟ لە وەڵامدا دەڵێن: خەڵکی بەهەشت بۆ خۆشی و لەززەت ئەوانە دەخۆنەوە، خۆ لەبەر ئەوەیان ناخۆنەوە کە تینویەتیان پیٚ بشکیٚ، خۆ لە بەهەشتا نەکەس برسی دەبیٚ نە تینووی دەبیٚ، نەگەرمای دەبیٚ نە ناڕەحەت دەبیٚ.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من لەسەر حەوزی کەوسەر بەخێرهاتنتان دەکەم، لە قەومو ئممەتەکەم زۆر دێن بۆ لام بۆ سەر حەوزی کەوسەرو من دەڵێم ئەوانە ئۆممەتی منن، بەڵام لە غەیبەوە پێم دەڵێن: تۆ نازانی ئەوانە لەپاش تۆ چەند ڕەسمو یاساو بیدعەتیان تێکەڵ بە دینی تۆ کرد، جا من کە ئەوەم بیست پێیان دەڵێم: دوور کەونەوە لە من ئەی ئەو کەسانەی کە لە دوای مردنی من دینو سوننەتی منتان گۆڕیوەو خۆتان چەند بیدعەتو ڕەسمو یاساتان بە ناوی دینەوە داناوە. جاکەواتە تا زووە دەست لە بیدعەتو ڕەسم یاسای غەیرە دینی هەڵگرینو پەیڕەوی لە فەرمایشتو سوونەتی پێغەمبەر ﷺ بکەین.

پێغەمبرە ﷺ فەرمووی: جەماعەتێك لە موسڵمانان بە هۆی شەفاعەتی منەوە دێنە بە هەشت. فەرمووی: دەزانم کیٚ ئاخر کەسە دێتە بەهەشت و لەسەر ئەژنۆیان دەڕوا، خوای گەورە دەفەرمووێ: بچۆ بۆ بەهەشت، کابرا

وادەزانیٚ کە لە بەهەشت جێگای نابێتەوە ئەوەندە پڕە لە خەڵك، دەڵیٚ: ئەی خوای گەورە! هەرچەند دەزانم تۆ پاشاو خاوەن دەسەلأتی، تکایە گاڵتەم پیٚ مەکە، ابن مسعود دەفەرمووێ: پێغەمبەر ﷺ کە ئەو جوملەی فەرموو: ئەوەندە پێکەنی پوکی موبارەکی دەرکەوت.

شـێخی موسـلیم لـە حەدیـسدا دەفـەرمووێ: جارێـك بەهەشــتو دۆزەخ گفتوگۆیان بوو، دۆزەخ گوتی: لەنا مندا پاشایانی ستەمکارو موتەکەبیری جەبباری وەك فیرعەونو شەدادو نەمردوودو سەردارانی سەرمایەداری وەکو قاڕوونو ئەبوو جەهلو ئەبوو لەهەب و هەزارانی تر دادەنیشن. بەهەشت بە ئەسەفەوە گوتی: بە پیچەوانە عادەتەن ئەوەی زەعیفو فەقیرو نەناسراو بیٚ دەسەلأتو سادە بیٚ دێـە ناو منەوە. لەوکاتەدا خوای گەورە فەرمووی: ئەی بەهەشت! غـەمت نـەبیٚ، تۆ جێگـای نـازل بـوونی ڕەحمـەتی منـی، ئـەوەی بم هـەویٚ ڕەحمـی پـیٚ بکـەم دەی نێرمـە نـاو تـۆوە. ئینجـا ڕووی کـردە دۆزەخو فەرمووی: ئەی دۆزەخ تۆ جێگای غەزەبی منی، ئەوەی بم هەویٚ عەزابی بدەم دەنێیرمە ناو تۆ.

محەمەدی کوڕی مەعاز ﷺدەفەرمووێ: باسـی ئافرەتێکی خـوا پەرسـت یـان بۆ کردم ئەو شەوە خـەونم دی لـە خەوەکەمدا دەچووومە بەهەشت، تەماشام کرد دانیشتوانی بەهەشت بەزۆری لەبەر دەرگای بەهشتن وەستاون، پرسیم ئەوە چ خەبەرە؟ بۆچی ئەو هەموو خەڵکە کۆبوونەتەوە؟ یـەکێك گوتی: قـەرار وایە ئافرەتێك بێنن بۆ بەهەشت، بەهەشتیان بۆ ڕازاندوەتـەوەو تـەواوی ئـەو خەڵکـەش بـۆ پێـشوازی ئـەوەوە هـاتوون. گـوتم: باشـە ئـەو ژنـە کـیٚ یـە؟ گوتیان: کەنیزەکێکی پێست ڕەشـەو خـەڵکی ((ایکـە)) یـەو نـاوی (شـەعوانە) یـە، گـوتم: بـەخوا ئـەوە خوشـکی منـە. لەوکاتـەدا تەماشـام کـرد (شـەعوانە) سواری وشترێکی زۆر جوان بووەو دەفڕیٚو دیٚ، بانگم کرد گوتم:

خوشکی! ئاگات لە بەینی منو خۆتدا هەیە؟ داوا لە پەروەردگار بکە تا منیش لە گەڵ تۆ بنێری، کە گوێی لە قسەکانم بوو پێکەنیو گوتی: ئێستا وەختی هاتنی تۆ نەهاتووە. بەڵام دوو شتم بە ئامۆژگاری لێ وەرگرەو قەت لە بیرت نەچن. یەکەم هەمیشە یادی دواڕۆژ بکەوەو دووەم هەمیشە موحیببەتو خۆشەویستی خوا لە هەموو کاتو ئەحواڵێکدا وەپێش خواستو ئارەزووی نەفسی خۆت بخە، کاتێ مەرگت هاتبێ یان نا.

جارێك پێغەمبەر ﷺ لەناو ئەسحابدا دانیشتبوو، فەرمووی: من ئێمشەو بەهەشتو جێگاو مەقامی ئێوەم لە بەهەشتا دی. لە پاشان ڕووی کردە حەزرەتی ئەبووبەکر رضي الله عنه و فەرمووی: یەکێکم دی کە بۆ هەر دەرگایەك دەچوو دەنگی مەرحەباو بەخێرهاتنی بەرز بووەوە.

سەلمانی فارسی رضي الله عنه عەرزی کرد قوربان! ئەوەی ئەو مەقامەی هەبێ دیارە دبێ پیاوێکی زۆر گەورە بێ؟ حەزرەت ﷺ فەرمووی: بەڵێ: ئەو کەسە ئەبوو بەکرە. ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە بەهەشتا خانوویێکم دی لە مرواری درووست کرابووو بە یاقووتِ ڕازابووەوە، پرسیم ئەو خانووی کێیە؟ گوتیان : ئەوە ماڵی کوڕێکی گەنجی قورەیشی یە، وەم زانی ماڵی منە. کاتێ ویستم بچمە ناوی گوتیان: ئەوە ماڵی عومەرە.

لە پاشان پێغەمبەر زۆر باسی حەزرەتی عوسمانو حەزرەتی عەلیو ئەسحابی کردو، ڕووی کردە ((عبدالرحمن)) کوڕی عەواف رضي الله عنه و فەرمووی لەناو ئەسحابەکانمدا تۆ زۆر درەنگ گەیشتیە من لە کاتێکدا ئارەقت لەبەر دەڕۆیی ترسام لەوەی تووشی بەلایەك بووبی، لێم پرسی ئەوە بۆ وا درەنگ هاتی؟ لە وەڵامدا گوتت لەبەر زۆری ماڵو سەروەتەکەم تووشی مەحاسەبە

بووم‌و گوتیان ئەو هەموو سەروەت‌و ماڵەت چۆن پەیدا کردو چۆنت خەرج کرد؟ کاتیَ (عبدالرحمن) ئەو قسانەی دەربارەی خۆی گویَ لیَ بوو، دەستی کرد بە گریان‌و عەرزی حەزرەتی کرد، ئەی پێغەمبەری خوا! هەر ئەو دویَ شەوە بە هۆی تیجارەتێکەوە کە لەگەڵ میسردا کردم سەد وشترم دەست کەوتووە ، ئەو سەد وشترە بە خێرو سەدەقە دەدەم بە فەقیرو هەتیوان بەڵکو خوای تەعالا لە ڕۆژی موحاسەبەدا حیسابم سووك لەگەڵ بکا.

با ئەوە بزانین کە (عبدالرحمن) ی کوڕی عوف ﵁ یەکێك بوو لە ئەسحابە گەورەکان‌و خاوەنی فەزایل‌و مەفاخیر بوو، یەکێك بوو لە (عەشەرەی موبەششەرە)و هەر لە دنیادا پێغەمبەر ﷺ وەعدەی بەو ((دە)) کەسەدا بوو، مژدەی دابوونیَ کە دەچنە بەهەشت.

هەروەها عبدالرحمن ی کوڕی عەوف ﵁ یەکێك بوو لەو شەش نەفەرانە کە لەکاتی شەهادەتی حەزرەتی عومەردا حەزرەتی عومەر هەڵی بژارد بوون بۆ ئەوەی خەلیفەی ئیسلام ئەوان دیاری بکەن‌و حەزرەتی عومەر ﵁ دەربارەی ئەو شەشە نەفەرە فەرمووبووی: پێغەمبەر ﷺ لە دنیادا زۆر لەو شەش کەسە ڕازی بوو. لە بەینی ئەو شەش کەسەشدا پێنجیان ئەویان دیاری کرد خەلیفە هەڵبـژێریَ‌و ئەویش حەزرەتی عوسمانی هەڵبژارد بە خەلیفە. (عبدارحمن) ی کوڕی عوف یەکیك بوو لە زومرەی ئەو کەسانە کە خوای تەعالا لە سوورەی (تۆبە)دا دەربارەیان دەفەرموویَ ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ١٠٠﴾

﴾ التوبة: ١٠٠ یەعنی ئەو کەسانەی کە لە پێشدا کۆچیان کرد بۆ مەدینەو، ئەو مەدینەییانەی کە زۆر یارمەتی موهاجیرەکانیان دا و ئەو موسڵمانانەی کە لە ئیمانو باوەڕو ئیحساندا دوای ئەوان دەکەون، ئەوە خوا لەوان ڕازی یەو ئەوانیش لە خوا ڕازینو خوا چەند جێگای خۆشی بۆ ئامادەکردوون کە جۆگەی ئاویان بە بەردەمدا دەڕواو قەت نامرنو هەتاهەتایە لەوێ ڕادەبوێرن، ئەوەیە دەست کەوتی گەورە.

(عبدالرحمن) کوڕی عوف ﵁ دوو جار کۆچی کردووەو لە هەموو غەزاکاندا بەشداربووەو لە زەمانی پێغەمبەر ﷺ بە یەکێك لە زانایانو موفتی لە قەڵەم دەدراو حەزرەتی عومەر لەسەر پێش نیهادی وی چەند کارێکی کردووەو، جارێك پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی بەیانیدا وا ڕێکەوت نوێژی لە پاشەوە کرد لەسەفەردا، پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ قەزای حاجەت تا هاتەوە ئەسحابەکان (عبدالرحمن)ی کوڕی عەوفیان ﵁ وەپێش خستو ڕکاتێکیان کردو حەزرەت هاتەوە ئیقتیدای پێ کرد لە ڕکاتی دووەمدا.

هەروەها کاتێ حەزرەتی عومەر ﵁ بوو بە خەلیفە لە ساڵی ئەوەڵدا ئەوی کردە نائیبی ئەمیری حەجاج. جا لەگەڵ ئەو هەموو ڕوتبەو مەقامەشدا ماڵو سەروەتو سامانی زۆر ئەوی لە ئەسحاب دوا خستو لەبەر حیسابی سەروەتەکەی لەدوا ئەسحابەکانی تر لە قیامەتا بە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دەگا. ئەو سەروەتەشی لە خواوە دەست کەوت، دەنا زۆر فەقیرو دەست کوورت بوو، لە کاتی کۆچیاندا بۆ مەدینە کە پێغەمبەر ﷺ برایەتی بەست لەبەینی موهاجیرو ئەنساردا، (عبدالرحمن)ی کوڕی عەوفی کردە برای

# دیمەنی مەرگ

سەعدی کوڕی ڕەبیعی ئەنصاری سەعد گوتی: لە شاری مەدینەدا کەس لە من دەوڵەمەندتر نیە، نیوەی سەروەتو ماڵەکەمت دەدەمێو دوو ژنیشم هەیە کامەت پێ باشە بۆت تەلاق دەدەمو لەدوای عیددە مارەی بکەوە.(عبدالرحمن) لە وەڵامدا گوتی: ژنو ماڵی خۆت بۆ خۆتو خوا بەرەکەتی تێخا، ئیحتیاجیم بە ماڵی تۆ نیە، تەنیا ڕێگای بازاڕم نیشان بدە بەسمە، بردی بۆ بازاڕو دەستی کرد بە کڕینو فرۆشتن، شەو تەماشای کرد هێندێکی ڕۆنو پەنیری قازانج کردووە. بەو جۆرە دەستی کرد بە کاسبی زۆری نەخایاند پارەیەکی پاشەکەوت کردوو ژنی هێنا. خولاسە وردە وردە ئەوەندە دەوڵەمەند بوو کاتێ حەزرەت ﷺ داوای سەدەقەو زەکاتی لێ کرد نیوەی سەروەتەکەی بە حەزرەت ﷺ بەخشی. جارێك چل هەزار دیناری کردە خێرو جارێکی دی پێنسەد ئەسپو پێنسەد وشتری کردە خێر بۆ غەزا لە ڕێگای خواداو جارێك پارچە زەوییەکی بە چل هەزار دینار فرۆشتو پارەکەی لە بەینی خێزانەکانی پێغەمبەردا ﷺ بەش کردو جارێك لە حەمام هاتە دەرەوەو نانیان بۆ دانا تێکوشیوبوو، تەماشای کردو دەستی کرد بە گریان، گوتیان: ئەوە بۆ دەگری؟ لە وەڵامدا گوتی: کاتێ حەزرەت ﷺ وەفاتی فەرموو لە نانی جۆش نەیدەتوانی تێر بخوا، ئێستاکە خۆم وا بە دەوڵەمەند دەبینم هەست دەکەم عاقیبەتم باش نابێ. مەعنای وایە ئەگەر دەوڵەمەندی زۆر باش بوایە پێغەمبەر ﷺ دەوڵەمەند دەبوو، بڕوانە (عبدالرحمن)ی کوڕی عەوف لەگەڵ ئەو هەموو فەزائیلەشیدا چۆن بەهۆی حیسابی سەروەتەکەیەوە لە ڕفیقەکانی دوا کەوت؟

## جامی شەڕاب بۆ پیاو چاکان

بەبێ شک پیاوی چاك لە بەهەشتا پیاڵەی پڕ لە شەراب دەخۆنەوە کە شەڕابەکەی کافووری تێکەڵ کراوەو ئەو پیالأنەش لەو سەرچاوانە پڕ دەکرێن کە بەتایبەتی بۆ بەندەکانی خوەان. سەیر ئەوەیە بۆ هەر جێگایێ بچن دەتوانن سەرچاوەی شەڕابەکە بەرن بۆ ئەوێ. ئەوانەش ئەو کەسانەن کە لەسەر وەعدەی خۆیان لانادەنو لە ڕۆژی موحاسەبە دەترسنو لەبەر ڕەزای خوا خواردن دەدەن بە مسکینو هەتیوو ئەسیرو دەڵێین: تەنیا لەبەر ڕەزای خوا ئەو خزمەتەتان دەکەین، بۆ ئەوە نیە چاومان لە پاداشتی ئێوە بێ؟ وە ناشمان هەوێ سپاسمان بکەن. چونکە ئێمە لە ڕۆژی جەزا دەترسین.

خوای تەعالا ئەو کەسانە لە ناخۆشی ڕۆژی قیامەت دەپارێزێو کەیف خۆشیان دەکاو لە پاداشتی چاکەیاندا دەیان باتە بەهەشتو لیباسی ئاورشیمیان لەبەر دەکا و لەسەر تەختی گەوهەری بەهەشت پاڵ دەدەنەوە، نەهەست بە گەرما دەکەن، نە لە سەرمان ناڕەحەت دەبن، درەختی بەهەشت سێبەریان لەسەر دەکا و هیشوی میوەی ئەو درەختانەیان لە ئیختیاردا دەبێو زەرفی ئاڵتونو پیاڵەی بلوریان پڕ لە شەڕابی تێکەڵ بە کافووریان لەبەردەم دادەنرێو لەوەش زیاتر شەڕابێکی تێکەڵ لەگەڵ زەنجەفیلیان بۆ دێننو لە سەرچاوەی (سەلسەبیل) بۆیان پڕ دەکەنو کوڕی گەنج بۆیان دێنن، ئەو کوڕانەی کەچاوت پێ بکەون وادەزانی کە هەریەکەیان دانەی مروار ییەکە لە لایەن خواوە پێیان دەگوترێ ئەوە لە پاداشتی کردەوەی چاکی دنیاتان دایە.

گوتمان بۆ هەر جێگایەك بچن سەرچاوەکە لەگەڵ خۆیاندا دەبەن. موجاهید دەڵێ: بۆ هەر جێگایەك بیان هەوێ دەی بەن، قوتادە دەڵێ: کافووریان بۆ تێکەڵی ئاوی سەرچاوەکان دەکەن، بە مۆری میسك سەری زەرفەکانیان مۆر دەکەنو بۆ هەر جێگایەك ئارەزوو بکەن ئاوی سەرچاوەکان جاری دەکەن.

(ابن شوذب)) دەڵێ دار دەستێکی تەلآیان بە دەستەوە دەبێ، بۆ هەر لایەك بەو دار دەستە ئیشارە بکەن ئاوەکە بۆ ئەوێ جاری دەبێ. بۆیە لە حەزرەتی عایشەو ام سلمە) رضی الله عنهما ڕیوایەت دەکەن کە بۆ ئەوەی پاداشتی ڕۆژی قیامەتیان دەست کەوێ عادەتیان وابوو کاتێ شتێك یان بۆ فەقیرێك یان داماوێك دەناردن، بە پیاوەکەیان دەگوت: بە نهێنی گوێ بگرەو بزانە داخۆ کە فەقیرەکە شتەکەی وەرگرت دەڵێ چی؟ کاتێ پیاوەکەیان دەهاتەوەو دوعای فەقیرەکەی بۆ دەگێڕانەوە، ئەوانیش عەینی دوعایان بۆ فەقیرەکە دەکردەوەو دەیان گوت: ئەوە پاداشتی دوعاکانیەتی بۆ ئەوەی پاداشتی خێرەکەمان لە دوا ڕۆژدا بدرێتێ.

دەڵێن : حەزرەتی عومەر و (عبدالله)ی کوڕی حەزرەتی عومەریش عادەتیان هەر وابووە. بەڵکو ئیمام (زین العابدین) فەرموویەتی ئەوەی لە چاکەکردندا چاوی لە پاداشتەوە بێ ئەوە پێی ناڵێن چاکەکەر ، چاکەکەر ئەو کەسەیە هەقی خوا بدا بە بەندەکانی خواو چاوی لەوە نەبێ سپاسی بکەن، دەبێ تەنیا باوەڕی بە پاداشتی خوا بێ.

بەڕای کوڕی عازەب دەڵێ: بەهەشتی دەتوانن میوەی بەهەشت بەهەموو جۆرێك بخۆن، بەڕاوەستانەوە، بە دانیشتنەوە، بە ڕاکشانەوە، هەرچۆنێ ئارەزوویان لێ بێ دێتە بەر دەستیان. بە ڕیوایەتێك دەڵێن: هەموو شتێکی بەهەشت نموونەی لە دنیادا هەیە، بەلاّم وێنەی پەرداخی ئاو خواردنەوەی بەهەشت لە دنیادا نیەو نابێ.

## دەرسی بیستو سێ

## بەهەشتو نیعمەتەکانی

ئاسوودەیی و ڕەحەتی بەهەشت وەك ئاسوودەیی و ڕەحەتی دنیا وایەو لەززەتی وەك لەززەتی دنیایە، بەلاّم دووبارە لە بەهەشتا چەند نیعمەتێك هەیە کە تا ئێستا لە دنیادا نەکەس چاوی پێ کەوتووە، نە گوێی کەس بیستوویەتی، نە بە خەیاڵی کەسدا هاتووە. هەروەها ئەو ڕەنجو نارەحەتیەی کە لە دنیادا دایە نمونەی ڕەنجو نارەحەتی دوا ڕۆژن، لە دوای ئەوەش چەند جۆرە عەزابێك هەیە کە عەقڵ پەی پێ نابا.

خولاسەی کەلام غەزەبی خوا هۆی هەموو نارەحەتیەکە بۆ دۆزەخیانو ڕەحمەتی خوا باعیسی هەموو نیعمەتێکە بۆ بەهەشتیان ، ئەوەی لە دنیادا لە شتی حەلاّل ئیستیفادە بکاو شوکرانەی لەسەر بکا.

ئەوە لە بەهەشتا ئەوەندە نیعمەت دەدرێتێ کە نیعمەتی دنیا لە چاو وی هیچ نیەو ئەوەی لە دنیادا هەر لە شتی حەرام ئیستیفادە بکا، خۆی لە دەرەجەی دواڕۆژ بێ بەش دەکا.

لە بەهەشتا سێ نەوعە میوانداری هەیە بۆ بەهەشتیان میوانداری عەرووسی، میوانداری وەلیمە، میوانداری دۆستانە.

میوانداری عەرووسی ئەو میوانداری یەیە کە خوای تەعالا تەواوی خەڵکی بەهەشت دەعوەت دەکا بۆ (دار السلام) تا بەدەنیان تازەوەبێو ژیانیان ئەبەدی بێ. میوانداری وەلیمەش ئەو میوانداری یەیە کە بەهۆی گوازاتنەوەی حۆریان بۆ بەهەشتیان بەرپا دەبێ. میوانداری دۆستانەش ئەو میوانداری‌یەیە کە بەهۆی مولاقاتی بەهەشتیان و چاو پێکەوتنی یەکتری دەکرێ.

لە مەقامی موحیببەتا بۆ چاو پێکەوتنی یەکتری چەند جێگای دیاری کراو دەبێو لەدەوری سێبەری داری (شجرة الطوبى) شوێنی کۆبوونەوەیان دەبێ، کە لەوێ دەتوانن چاویان بە پێغەمبەرانیش بکەوێو زیارەتیان بکەن. مەلائیکەش لەوێ چەند مەجلیسێك بەر پادەکەنو لە کاتی نوێژدا لە لایەن خواوە هەدیە دەدرێ بە بەهەشتیانو بەیانیو ئێواران فەرمووی ئەنواعی میوەیان دەکەن. خەڵکی بەهەشت خاوەنی باغەکانی قەراغ حەوزی کەوسەرن بۆ رابواردن، کە عادەتەن دەچن بۆ ئەوێ لە قەراغ حەوزی کەوسەر هەزاران خیوەتی مراواری هەڵدراوە، هەریەکەی شەست میل پانیو شەست میل درێژەو کەنیزەکی رووخۆشیان تیدا دانیشتوون، کە تا ئەو کاتە نەخزمەتکار، نە مەلائیکە چاوی پێ نەکەوتوون. لەوش زیاتر ئافرەتی جوانی دەرەجە یەکیان تێدا دەبێ، جا ئافرەتێك خوای گەورە بە جوانی ناوی بەرێ دەبێ کێ بتوانێ بەتەواوی باسی جوانی بکا؟ خوای گەورە لە بارەیاندا دەفەرمووێ: لەو خەیمانەدا ئەو حۆریانەن کە لە دەستو تەماشاکردنی بێگانە پارێزراونو زۆر بە شەرمو حەیانو تەماشای مێردەکانیان نەبێ تەماشای کەس ناکەن. خوای گەورە ئەوانی هەڵبژاردووەو وێنەی جوانی پێ بەخشیونو لە بارانی هەوری ڕەحمەرت باریونو هەوری ڕەحمەت بە ئیرادەی خوا لە باتی دلۆپە باران کچی جوانو ڕازاوە دەبارێنێ کە نووری وێنەیان لە نووری عەرشی خواوەیەو خەڵکی بەهەشت لە کاخو قەسرەکانیاندا لەززەت لە ژنەکانیان دەبەنو لەو ڕۆژەدا کە بە ئەمری خوا ڕۆژی تازەکردنەوەی خۆشیو فەڕەحی نیعمەتە، بانگی بەهەشتیان دەکرێ کە ئەمڕۆ ڕۆژی فەڕەحیو خۆشحاڵی یە دەگەنە یەکترو پرسیاردەکەن، یەکیان دەڵێ: ئەرێ خۆ من ڕەفیقێکم هەبوو لە دنیادا دەی گوت: ئایا تۆ ڕاست دەکەی کە ئێمە دەمرینو دەبینەوە خاكو ئێسقان دووبارە زیندوومان دەکەنەوە بۆ سزاو پاداشت؟ ئایا ئێوە دەزانن؟ کاتێ بۆی مەعلوم دەبێ ئەوا کابرا لە دۆزەخ دایە. (ابن عباس) دەڵێ: بەهەشت

چەند پەنجەرەو ڕۆژنەی تێدایە کە بەهەشتی دەتوانن لە وێوە بڕوانن بۆ جەهەننەمو دۆزەخیان ببینن، کاتێ بەهەشتی یەك دۆستێکی خۆی لە دۆزەخدا دەبینێ دەڵێ: وەڵڵەهی زۆری نەمابوو منیش وەك خۆت بە هیلاك بدەی، ئەگەر نیعمەتی پەروەردگار نەبوایە دەبوو منیش لەلای تۆبم.

## درودی بەهەشتیان لە بەهەشتا سەلامە

خوای گەورە لە سووڕەی ((یونس))دا دەفەرمووێ: ئەو کەسانەی لە دنیادا خاوەن ئیمان بوون و کردەوەی چاکیان کرد بەهۆی ئیمانیانەوە خوا هیدایەتی دان و بردنی بۆ ناو بەهەشت کە جۆگەی ئاوو شیرو هەنگوین بەلای قەسرەکانیاندا جاری دەبێ و دەڵێن((سبحانك اللهم) و بەخێر هاتنیان سەلامە.

خاوەنی(معالم التنزیل) دەفەرمووێ: کاتێ ئەهلی بەهەشت ئارەزووی شتێك بکەن دەڵێن: (سبحانك اللهم) بە بیستنی ئەو کەلیماتانە خزمەت کارەکانیان فەوری سفرەیان بۆ دەڕازێننەوەو کاتێ نانیان خوارد دەڵێن(الحمد لله رب العامین) هەروەها دەفەرمووێ: بەهەشتی کەتووشی یەکتر بوون سەلام دەکەن و فریشتەش سەلام لە ئەهلی بەهەشت دەکەن و سەلامی خواشیان پێ ڕادەگەیەنن.

خولاسەی کەلام کەس ناتوانێ چەندەیتی و چۆنیەتی نازو نیعمەتی بەهەشت بە تەواوی بەیان بکا، زۆر زۆرە لەوە زیاترە کە لە قورئان و حەدیسدا باسیان کراوە، بە عەلاوەی ئەوش ئێمە تا لە دنیادا بین و بە بیستین بە تەواوی نازو نیعمەتی بەهەشتمان بۆ دەر ناکەوێ هەروەك ئەبوو هورەیرە ﵁ لە حەزرەتەوە ﷺ ڕیوایەت دەکافەرموویەتی: خوای گەورە دەفەرمووێ: من بۆ

پیاو چاکان شتێکم بۆ ئامادەکردوون کە تا ئێستا نە چاوی کەس دیویەتی. نە گوێی کەس بیستوویەتی، نە بەخەیاڵی کەسدا هاتووە. بەڵگەیەکی ترما ئەو ئایەتی سوورەی (سوجدە)یە کە دەفەرموێ ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾ السجدة: ١٧ .

## ئایا کەس هەیە موشتەری بەهەشت بێ ؟

جا ئێستا کە ئێوە باسی بەهشتان بۆ کراو زۆربەی نیعمەتی بەهەشتان زانی دیارە پێتان خۆشە بچنە بەهەشتو لەوانەیە زۆر جاریش لەبەر خوا وەپاڕێن کە بتان باتە بەهەشت. بێ گونان دەبێ هەموو موسڵمانێ عەلاقەی زۆری بە چوونە بەهەشتەوە هەبێ. بەڵام دەبێ لەگەڵ ئەو زەوقو عەلاقەشدا زەخیرەی چوونە بەهەشت بە عەمەلی ساڵح کۆ بکاتەوە، ئەوەی داوای بەهەشت دەکا ناتوانێ هەستو خەیاڵی عەمەلی چاکی نەبێ. ئەو کەسە زۆر ئەحمەقە داوای چوونە بەهەشت بکاو غەرقی دنیای مەعاسی بێ و غافڵ بێ لە کۆکردنەوەی کردەوەی چاکە، خوای گەورە لە سوورەی توبە دا دەفەرمووێ:

قَالَ تَعَالَىٰ: أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ ٱشْتَرَىٰ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلْجَنَّةَ ﴿١١١﴾ ﴾ التوبة: ١١١ . بەڕاستی خوای تەعالا کڕیویەتی لە موسڵمانان نەفسو ئەموالیان بە بەهەشت، واتا ئەوەی زەحمەت نەبینێ بەتاعەتو عیبادەتەوەو بەماڵی دنیا خێرو خێرات نەکا، ئەوە خوا بەهەشتی ناداتێ.

کەواتە ئینسانی موسڵمان ئەگەر گیانو ماڵیشی لەپیناوی دینی ئیسلام و شەریعەتی ئیسلامدا بەخت بکا هەقی خۆیەتی، ئەو کەسانە زۆر ئەحمەقن کە گوێیان لە بانگەو گوێی نادەنێ، یان نوێژەکانیان فیدای کەساباتو تیجارەت دەکەن، یان زەکات نادەن، یان ڕۆژوو ناگرن سەروەتیان هەیەو

لەبەر عەلاقەی زۆریان بە ماڵ و منداڵەوە دەمرن و حەج ناکەن، لە کەسابەتا فەرقی حەڵاڵ و حەرام ناکەن، فەخر بە خواردنی ماڵی من و تۆوە دەکەن، دەرس و خوێندنی قورئان و حەدیس بە کارێکی بێهودە دەزانن، زوڵم لە داماوان دەکەن، بێکار بە خەڵك دەکەن، بەرتیل داڵن و بەرتیل خواردن بە جایز دەزانن، ماڵی هەتیوان بە ناحەق دەخۆن، میران بە گوێرەی شەرع دابەش ناکەن، سووننەت ناکەن، دووری لە زکری خوا دەکەن، لەگەڵ ئەوەشدا دەیان هەوێ لە بەهەشتا خوای گەورە مەقامی باشیان بداتێ.

بەڵێ ئەنجام دانی ئەحکامی شەریعەت بەلای نەفسی ئینسانەوە کارێکی گران و ناخۆشە، هەروەك لە حەدیسدا دەفەرمووێ: جەهەننەم بە ئارەزووی نەفسانی و بەهەشت بە شتی گران لەسەر شان و نەفسی ئینسان دەورەیان گیراوە.

بەڵام هیچ چارە نیە ئەوە نەبێ کە قبوڵی ئەزیەت و ناڕەحەتی ناعەت و عیبادەت و ئەمرو فەرمانەکانی خوا بکەین و خۆمان لە ئارەزووی نەفس بپارێزین تا خوا بەهەشتمان بە نسیب کا، چونکە بە پێچەوانەوە ئەوەی چاوی لە حەرام بێ و وەدوای ئارەزووی نەفس بکەوێ و پشت بکاتە خوا پەرستی ئەوە جێگای جەهەننەمە، لە حەدیسدا دەفەرمووێ ئەو کەسە خاوەن هۆشە کەنەفسی بێنێتە ژێر بارو بۆ ژیانی دوا مەرگی کردەوەی چاك پێکەوەنێ و ، ئەو کەسەش ئەحمەقە کە هەمیشە وەدوای ئارەزووی نەفس بکەوێ و بەبێ ئەنجام دانی کاری چاك بە ئومێدی ڕەحمەتی خوا بێ.

جا بەگوێرەی مەعنای ئەو حەدیسە ئەوەی پێی خۆشە لە جەهەننەم دوور بێ و بچێتە بەهەشت، نابێ دنیای لە دواڕۆژ بەلاوە گرنگ تر بێ و دەبێ لەبەرامبەر بەهشتا دەست لە گیان و ماڵیشی هەڵگرێ و تا زۆرتر چاکە بکا، هەر بەلایەوە کەم دەبێ و بۆ بەرزی مەقامی خۆی زۆر خەریکی فەرز و سوننەت دەبێ، بەڵام بە داخەوە وادیارە ئیمڕۆ کەس بیر لە دوا ڕۆژ

ناکاتەوەو، ئەو کەسانەش کە ئیمانیان بە دوا ڕۆژو بەهەشت هەیەو لە خوا پەرستی دا سستی دەکەن هەر ئەحمەقن.

شێخی ترمزی دەفرمووێ حەزرەت ﷺ لە حەدیسدا فەرموویەتی هیچ شتێکم نەدیوە وەك دۆزەخ، کە ئەوی لەبەری ڕادەکا بتوانێ بە ڕەحەتی بخەوێو هیچیشیم نەدیوە وەك بەهەشت کە ئەوەی ئارەزووی بکا لە خەودا وەمێنێ، واتا هەرچەند ئەو کەسە دەزانێ دۆزەخ ڕەنجو ئەزیەتی چەند زۆرە ، کەچی هەمیشە خەریکی ئەو کارانە دەبێ کە دەبنە هۆی چوونە دۆزەخی.

یان ئەو کەسەی نازو نیعمەتی بەهەشتی پێ خۆشە لە خەوی غەفلەتا وەمێنێو بیر لە کردەوەی چاك نەکاتەوە؟ ئەوە زۆر سەرنج ڕاکێشە، ئەگەر چی لە دنیادا هی وا هەیە کە لەبەر تەنبەڵی زۆر زەحمەت دەکێشێو لە بەدەست هێنانی ئەو شتانەی پێویستی و عەلاقەی پێوەن مەحرووم دەبێ، بەڵام ئەگەر کەسێك بی هەوێ لە دۆزەخ غافڵ بێ، یان ئەوەی داوای چوونە بەهەشت دەکا ژیانی خۆی بە تەنبەڵی بەرێتە سەر، زۆر جێگای سەر سوورمانە، ژیانی دنیا وەکو سەفەرێکە کە مەنزڵی ئاخری بۆ ئینسانی موسڵمان بەهەشتەو بۆ گەیشتن بە بەهەشتیش بچینە ژێر باری ڕەنجو میحنەتەوە، لەبەر ئەوە شت تا باشترو بە نرختر بێ، بەدەست هێنانی ڕەنجو زەحمەتی زۆرتری دەوێ.

هەروەك پێغەمبەر لە حەدیسدا فەرموویەتی: ئەو کەسەی ترسی دووریو ناخۆشی ڕێگای سەفەرەکەی بزانێ، لە ئەنگۆرێڕاوەڕێ دەکەوێو ئەوەی زووش وەڕێ کەوێ زوو بە مەقسەد دەگا، وریا بە کالای خوا گرانەو بزانە کالای خوا بەهەشتە، خۆ ئێمە کاتێ بۆ کارێکی دنیایی بڕۆین بۆ سەفەر، زۆر زوو وەڕێ دەکەوین تا لە پێش کاتی دیاری کراودا بگەینە ئەو جێگایە، جا دەبێ بۆ سەفەری دواڕۆژمان دەرسو پەندو ئامۆژگاری لە سەفەری

دنیامان وەرگرین، با لە باتی ئیتاعەی نەفس، بە پەیڕەوی لە ئەحکامی شەریعەت خۆمان بۆ سەفەری دوا ڕۆژ ئامادە بکەین تا کاڵای بەنرخی خوا کە بەهەشتە لە دەستمان نەچێ، خۆ بۆ وەدەست هێنانی ئەسبابی جوانی دنیاو بۆ خانوو درووست کردنو دووکان، چەند پارە خەرج دەکەی؟ بەو هۆیەوە چەند تەمەنی گەنجی لە بەین دەچێ، چەند کەس نەخۆش دەکەون، بۆ خوازبێنیو مارەکردنی ئافرەتێك چەند مەکرو حیلە دەکەیو چەند پارە خەرج دەکەی؟ کاتێ لەبەر خاتری ئەو دنیا بێ نرخە ئەو هەموو سەروەتەو سەلامەتی و جوانی خۆت لە دەست دەدەیو هەرچی بۆت بکرێ دەی کەی.

لەگەڵ ئەوەشدا کە دەزانی دنیا فانیەو دەبێ بەم زووانە بەجێی بێڵیو بڕۆی، ئەی بۆ وەدەست هێنانی مەنزڵی ئەبەدی و نازو نیعمەتو لەززەتی بەهەشت چ فیداکرییێکی جانیو ماڵیت کردووەو چەندت زەحمەت کێشاوە؟ ئەی ئینسان! ئەو ژیانە بۆ ئەوە نیە کە تۆ بە غەفڵەت بیبەیتە سەر؟ بزانە بەهەشت وا بە ئاسانی دەست ناکەوێ، دنیا ڕێگایە، مەنزل نیەو جێگای نیشاتو عەیشو مەستی نیە.

((ئەی ئەوانەی دنیا دەکەن بە بەهەشت تەماشای بەهەشتی شەدداد بکەن))

ڕاوی دەڵێ: لەناو قەومی عاددا دوو پاشا هەبوون، یەکیان (شەدید) و ئەوی تریان ((شەدداد)) بوو یەکێکیان پایتەختی لە ((یەمەن))بوو ئەوی تریان لە (عەدەن) بوو، ئەو دوو پادشایە فەرمانڕەوایی تەواوی وڵات بوون لەشکرو پارەی زۆریان بوو، لە دوای مەرگی ((شەدید)) ((شەدداد)ی برای لەسەر تەختی سەڵتەنەتی ئەویش دانیشتو تەرەقی بە دەسەڵاتی خۆی دا، وای لێ هات هیچ پاشایەك نەی دەتوانی سەرپێچی لە فەرمانی ئەو بکا، جا لەبەر ئەو دەسەڵاتەی توغیانی کردو داوای خوایەتی کرد، عالەمو زاناکان زۆری لەگەڵ خەریك بوون، پەشێمانی بکەنەوە سوودی نەبوو، بە قسەی نەکردن، گوتیان: لە خوا بترسەو عیبادەتی خوا بکە سوودی زۆرە، بەڵام ئەو

بەدبەختە لە وەڵامیاندا گوتی: ئەو سەروەتو قودرەتو جێگاو مەقامەی من هەمە بە عیبادەتی خوا هیچ زیاد ناکاو ئەوەی بەندەگی یەکی تر قبولْ دەکا لەبەر دوو هۆیە

یەکەم: ئەوەیە مەرتەبەی باڵاتر بیْ

دووەم: بۆ ئەوەیە ماڵو سەروەتی زیاتر بەدەست بێنیْ، خۆ ئێوەش دەزانن کە لەسەر تا سەری دنیادا کەس نە مەقامی لەمن باڵاترە، نە سەروەتی لە من زۆرترە، جا من چ موحتاجم سەری بەندەگیو خزمەت بۆ یەکی تر دانەوێنم؟ زاناکان گوتیان: ئاخر ئەو سەڵتەنەتو حکومەتەی تۆ فانیو ڕوو بە زەواڵەو هیچ شتێك بۆ تۆ هەمیشە نامینێەوە، بەڵام بە پێچەوانەوە ئەگەر خەریکی عیبادەتی خوا بی لە پاداشتدا خوا بەهەشتی بەرینت دەداتیْ کە لە تەواوی سەروەتو دەسەڵاتەکەت باشترە، ڕووی کردە زاناکانو گوتی: ئەو بەهەشتە چی یە؟

زاناکان ئەوەی لە بارەی بەهەشتەوە لە پێغەمبەرەکانیان بیستبو بۆیان باس کردو گوتیان: داری بەهەشت ئاوایە و چۆمو جۆگای ئاوایەو، خانووەکانی ئاوانو ، حۆری بەهەشت ئاوانو بەرگو لیباسیان ئاوایە، ((شەدداد)) کە بە تەواوی باسی بەهەشتی بۆ کرا گوتی: زۆر باشە کەوایە من وام نەدەزانی کە بەهەشت ئاوایە، ئەگەر بەهەشتی خوای ئێوە ئاوایەو من کارێکم پیْ نیە لەبەر ئەوەی من دەتوانم لە قەڵەمڕەوی خۆمدا بەهەشتێکی لەوەش باشتر درووست بکەم، زاناکان کە زانیان بەقسەیان ناکا بیْ دەنگ بوون و چوونەوە بۆماڵی خۆیان، جابۆ نەخشە گڵاوەکەی خۆی ((شەداد)) لەناو سەرداره باوەڕ پێکراوەکانی خۆیدا سەد نەفەری هەڵبژارد و هەریەکەی هەزار نەفەری لە ئیختیار نان، گوایا بۆ درووست کردنی بەهەشتی سەر زەوی دەزگایەکی پێکەوە ناکە کار گێڕەکانی زیاتر لەسەد هەزار کەس بوو، یەکیْ لە کار بەدەستەکانی خەریکی کۆ کردنەوەی کەرەسە بوو، یەکیْ دی

کاری موهەندیسی و ئەندازیاری بوو، یەکێ تر بەرێوبەری حیسابات بوو، بۆ تەواوی وەلآت ئەمری دەکرد کە هەرچی زێر و زیو هەیە بیکەن بەخشت و هەر گەنجینە و جەواهێراتێکی هەیە ڕەوانەی پایتەختی بکەن، فەوری دەستووری دا بە ئیدارەی شارەوانی کە لە داوێنی کێوی شاری ((عەدەن)) چل فرسەخ زەوی چوارگۆشە ئامادەبکەن و لەوێ نەخشەی بەهەشتی سەر زەوی بکێشن و بناغەکەی ئەوەندە قوول بکەن کە بگاتە ئاوی ژێر زەویی و بە سەنگی سولەیمانی پڕی بکەنەوە، کاتێ بناغە کەی تەواو بوو دەست بکەن بەدیوار، هەرخشتێك لەزێرو یەك لەزیو دای نێن.

جا بە ئارەزووی ئەودەست دەست کرا بە کارو بناغە داڕژاو دیوار بە بەئەندازەی پێنسەد گەزی ئەو زمانە بەرزکرایەوە، ئەو دیوارانە ئەوەندە جوان بوون و دەدروشانەوە کەڕۆژ هەڵدەهات نەت دەتوانی تەمشایان کەی ئینجا لەناو ئەو چوار دیوارە هەزار قەسری بەرز کردەوە کە هەر کاخەی هەزار کۆڵەکەو پایەی رازەوی هەبوو، بەعەلاوەی ئەوەش جۆگایەکی گەورەیان ڕاکێشاو لەهەموو کاخ وقەسرێکدا حەوزو حەمامێکیان درووست کردو لەو جۆگە گەورەوە بۆ هەر مووقەسرێك جۆگەیەکیان ئاو ڕاکێشا، تا لە هەموو قەسرێکدا ئاو هەمیشە فوارە بکاو، لێوە جۆگەکانیان بە یاقووت و مەرجان و زومەڕڕەد ڕازاندەوە، لەقەراغ جۆگەکاندا داری دەستکردیان ڕواند و لق و گەڵای زومەڕڕەدیان بۆ درووست کردن و گوڵ و میوەی دارەکانیان لە مرواری و یاقووت و جەواهیراتی ڕەنگا و ڕەنگ درووست کرد، ئینجا دار و دیواری ماڵ و دووکان و بازاڕیان بەمیسك و زەعفەران و عەنبەر بۆن کرد و بە گولاو و ئاوی تەلا زێڕ کفتیان کرد، لەپاشان گیانداری دەنگ خۆش و جوانیان لەو بەهەشتەدا بەرهەڵدا کردو، لەهەر چوارگۆشەی دیوارەکە بالەخانەیەکیان لەزێرو زیو درووست کرد. تا ئێشکگرەکان بەنۆرە لەوێدا ئێشك بگرن، کاتێ تەواوبوو دەستوری دا تەواوی بە فەرشی ئاوریشم و زێڕ کفت ڕابخەن و لەهەموو ماڵێکدا کاسەو کەوچکی ئالتون دانێن و جۆگایەك

## دیمەنی مەرگ

ئاوی زولاڵ و جۆگایەك شەراب و جۆگایەك شیرو جۆگایەك هەنگوین پێیدا بڕواو بازاڕ و موغازە و دووکان بەپەردەی مەخمورو زێڕ کفت وەڕازێن، ئەمر کرا بەکاسب کاران کەهەرکەس بچێتە سەر ئیشی خۆی و هەرکەس هەر کارێکی پێ خۆش بێ ئەوە بکاو ئەمری کرد لەسەرانسەری قەڵەمڕەوی خۆیدا چوار فەسڵە لە هەر جێگایەك میوە هەبوو بی هێنن.

خولاسە بەزیاتر لە سەد هەزار کەس لە ماوەی سێ سەد ساڵدا تەواویان کرد و لە پاش تەواو بوونی دەستووری دا بە تەواوی ئەمیرو وەزیرەکانی بە هەموو شان و شەوکەتیانەوە بچنە ناوی و خۆشی لەگەڵ لەشکرێکی زۆر لەوپەڕی دەرەجەی نازو تەکەبوردا لەپای تەختەوە وەڕێ کەوت و زاناکانیشی لەگەڵ خۆیدا هێنا کە وەعدەیی بەهەشتیان پێ دەداو دەیان گوت: دەست لەو بێ ئەدبیە هەڵگرە، لە ڕێگەدا ڕووی کردە مەلاکان و گوتی: هەر لەبەر ئەو بەهەشتە بەمنتان دەگوت: سەر بۆ کەسێکی تر دانەوێنم؟ ئێستا ئەوا دەچین قوودرەت ودەسەلاتی من بە چاوی خۆتان دەبینن و هۆی بێ نیازی من بە خوا دەزانن، بەو شەوکەت و جەلالەوە لە بەهەشتەکەی نزیك بوەوە، تەواوی دانیشتوانی بەهەشت هاتنە پێشوازی و ئاڵتون و زێڕ و زیویان بەسەردا هەڵدا و حەیوانیان لە بەرپێیاندا سەر بڕی، وەختێ گەیشتە بەردەروازەی بەهەشتەکە هەزاران هەزار تەماشاچی لە دوایەوە بوون و خۆی لە پێشیانەوە بەنازەوە سواری ئەسپ بوو، تەپڵ لێ دەدران و بەدەنگی نای و نەی خەڵك مەست بوو، ناو چاوانی شەدداد لە خۆشیان وەك گوڵی تازە پشکوتو وابوو، بەلام لەگەڵ ئەو هەموو ساز و جل و بەرگە و شان و شەوکەتە،هەر کە پێی نایە ناو دەرگای بەهەشتەکەیەوە دەنگێکی ناخۆشی ڕەعد ئاسا لە ئاسمانەوە هات و هەر بە بیستنی ئەوەی لەگەڵی بوون بەهیلاك چوون و شەدداد لە ئەسپەکەی بەر بوەوە و بێ هۆش کەوت و لەتەمەنی نۆسەد ساڵیدا بە سەدان ئومێد و ئارەزووە گۆڕ بە گۆڕ بوو. هەزاران هەزار ئارەزووی چاو پێکەوتنی بەهەشتەکەی لەگەڵ خۆی بردە جەهەننەمەوە.

تەنانت دەڵێن: حەزرەتی ئیزرائیل لە کاتی گیان کێشانیدا دڵی گیراو زۆر ناڕەحەت بوو، فرمێسکی لە چاوان هاتنە خوارەوە، دەڵێن: لە پاش ماوەیەك ڕۆژێك ئیزرائیل عەرزی بارەگای ئەقدەسی کرد و گوتی: قەت لە کاتی گیان کێشاندا دڵم بە کەس نەسووتاوە بەدووکەس نەبێ، ئەگەر ئەمڕۆ دەستووری تۆ نەبوایە قەت گیانم نەدەکێشان یەکەمیان بەزەییم بەمنداڵێکدا هاتەوە کە کەشتیەك غەرق بوو، ئافرەتێك لەگەڵ منداڵە ساوەکەیدا لەسەر تەختەیەك مابۆوە چووم گیانی دایکەکەم کێشاو گوتم: ئەگەر گیانی دایکەکەی بکێشم کێ ئاگاداری ئەو منداڵە دەکات؟ دووەمیان دڵم بە پاشایەك زۆر سووتا کە بە هەموو شەوق و زەوقی خۆی و بە هەزاران هەزار ئومێدو ئارەزووەوە بەهەشتێکی بێ وێنەی درووست کردو ویستی بچێتە ناوی، بەڵام هەر کە پێی نایە ئەو دیو دەروازەوە دەستورت دا بچم فەوری گیانی بکێشم زۆرم بە زەیی پێدا هاتەوە، چونکە ئەی خوای گەورە! خۆشت دەزانی کە لەکاتی مەرگیدا چەندی ئومێدو ئارەزووو لە دڵدا بوو.

خاوەنی تەفسری (فتح العزیز) دەڵێ: خوای گەورە لە وەڵامی حەزرەتی ئیزرائیلدا فەرمووی: ئەو پاشایە هەر ئەو منداڵە بوو کە بە بێ باوك پەروەردەمان کردوو بە مەقامی پاشا یەتیمان گەیاند، کەواتە ئەی ئیزرائیل! هەر دوو جارەکە کە لە بەینی تەواوی مەخلوقاتدا هەر (شەداد) بووە کە دڵت بۆی سووتاوە پەنا بەخوا لە قەهرو غەزەبی خوا، خوا بمان پارێزێ

ئامین

# دیمەنی مەرگ

## دەرسی بیستو چوار

## دەربڕینی حەقیقەت

لە حەدوودی چواردە قەڕن لەمەوبەر وەك ئێستا تاریکایی کوفرو زەلالەتو جەهالەتو سەفاهەت دنیایان پڕ کردبوو.

مانگی سەبەرزیو هیدایەت لە پشتی زنجیرە کێوەکانی (مەککە) هەڵاتو ڕۆژ ئاواو باکوورو باشووری دنیای بە نووری خۆی ڕووناك کردەوەو لە ماوەی بیستو سێ ساڵدا ئادەمیزادی گەیاندە ئەو پەڕی تەڕەقی کە مێژووی دنیا وێنەی ئەو پێشکەوتنی بە خۆوە نە دیبوو....

مەشخەڵێکی دایە دەست موسوڵمانان لە هیدایەت و ڕاستی سەلاح و فەلاح کەلەبەر تیشکیدا بە سەر شارێگەی تەڕەقی و پێشکەوتندا هەنگاو باوێن و چەند قەڕندا بەشان و شان و شەوکەتێکی بێ وێنە حوکمڕانی دنیایان کرد و لە بەرامبەر ئەواندا تەواوی دەسەڵات داران شکستیان خوارد.

ئەگەرچی ئەوە حەقیقەتێکە ئینکارناکرێ، بەڵام دووبارە لەلایەکەوە وەك گێڕانەوەی داستانێکی کۆنە و دووپاتکردنەوەی هیچ سودێکی نیە، بەتایبەتی لەکاتێکدا کە ئێستا بەسەرهاتو ڕووداو و کردەوەی ئیمڕۆ داوێنی پڕ ئیفتیخاری باب و باپیرانی ئێمەی عەیب دار کردووە. کاتێ ئێمە لە پەنجەرەی مێژووەوە تەماشای ژیانی هەزارو چوارسەت ساڵی گەلەکەمان دەکەین، هەست دەکەین کە لەناو تەواوی نەتەوەکانی دنیا هەر ئێمە میرات گری عیززەت و کەرامەت وشان و شەوکەت و جاه و جەلالین، بەڵام کاتێ تەماشای حاڵەت و وەزعی ئێستامان دەکێن هەست دەکەین لەئاخر دەرەجەی پەستیو زەلیلی و زەعیفی و دەست کورتی و نەداری داین، نەدەسەڵاتمان نەشان وشەوکەت.

نەهەستی برایەتیمان هەیە نەعادات و ئەخلاقی چاك و نە ئەفعال و ئەعمال و کردەوەی باش، بەپێچەوانە زۆر کردەوەی خەراپ لە ناوماندا بڵاوبۆتەوە و ئەوەی چاکە بیٚ لە ئێمە بەدوورە، ئیمرۆکە وەزعی ئەخلاقی مان لەجاران خەراپترە و دیارە ئایندەشمان ڕۆژ بە ڕۆژ خەراپتر دەبیٚ، بێکار دانیشتین و بەربەرەکانی نەکردنی فەساد و خەراپە، جورمێکە چاوپۆشی لیٚ ناکریٚ، لەوەش گەڕێین: گەورەترین پێویستی سەرشانمان کە ئەمرە بە چاکە و نەهی لەخەراپەیە تەرك بکەین، وەك ئەوەوایە دەرگای لەعنەت و غەزەبی خوا بکەینەوە، خۆ ئەمر بە چاکەو نەهی لەخەراپە لەدیندا زۆر گرنگەو هەموو شتێك پەیوەندی پێوە هەیەو خوای گەورە هەر لەبەر ئەمر بە چاکە و نەهی لەخەراپە ئەو ئەو پێغەمبەرانەی ڕەوانە کردوون. ئەگەر خوا نەکردە چاوپۆشی لەئەمر بە چاکە ونەهی لەخەراپە بکریٚ و عیلم و عەمەل بەو ئەرکە گەورەیە لەبەین بچیو ڕاستی وچاکە، کە تایبەتە بەئینسانەوە نەمێنیٚ و تەنبەڵی وبیٚ موبالاتی پەیدابیٚ دەرگای گومڕاهیو زەلالەت دەکرێتەوە، جەهل و نەزانی دنیا دەگریٚ، خەراپی لەهەمووخەڵك فاسید دەبیٚ، کاتیٚ ئاگادار دەبنەوە کە لەبارەگای خوا لەڕۆژی مەحشەردا داوا موحاسەبەمان لیٚ بکەن، حەیف و هەزارحەیف ئەو خەتەرەی چاوەڕوانی بووین ڕووبەڕوومان بۆوە، ئەوەی لێی دەترساین هاتەبەرچاومان، شوێنەواری عیلم و عەمەل لەدنیای ئیسلامدا لەبەین چوو، بەرەکەتی ڕەسم و یاساو ئادابی ئیسلامی لەناو کۆمەڵی موسڵماناندا نەما، سووکی و زەلیلی لەدڵماندا جێگیربووە، پەیوەندی قەلبیمان لەگەڵ خوا نەماوە.

لەنەتیجەی پەیڕەوی لەئارەزووی نەفسانیدا وەك سەگی بیٚ حەیامان لیٚ هاتووە، پەنابەخوا.

ئادەمیزادێکی ڕاست وموسولمان لەڕووی زەویدا کە بۆبەرزی کەلیمەی حەق لۆمەی خەڵك قبوڵ کا، نەك هەر بەزەحمەت دەست کەویٚ، بەڵکو غەیرە

مومکینــە، خـۆ ئەگــەر مــەردێکی بــەئیمان بــۆ پڕکردنــەوەی  ئەوکەلێنــەو بۆزیندوکردنەوەی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ قوڵی مەردایەتی لێ هەڵماڵێ و ئـەو کۆڵــە موبارەکــە لـەکۆڵ نــێ، بـێ گومـان لـەناو خـەڵکا دەبێتـە خـاوەنی شەخسیەتو ڕوتبەو مەقامێکی دەرەجە یەك،

## شوێنەواری جینایەتی ئەخلاقی لەسەرئیمان ئەخلاق و قورئان

خــوای گــەورە لــە ســوڕەی ((نحــل))دا دەفــەرمووێ ﴿ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴿٩٠﴾ ﴾ النحـل: ٩٠ ، بەڕاسـتی خـوا ئـەمر دەكـات بەعەداڵـەت و چاکەو بە بەخشین بـەخزمان و نـەهی دەکـا لـەکاری خـەراپ و ناشـرین و زوڵـم. ئامۆژگایتــان دەکـات بـەڵكو ئامۆژگایـەکانی وەرگـرن، لـەو ئایەتەدا بەکورتی باسی ئەمر بەچاکە، واتـە ئینسـاف و ئیحسان و یارمـەتی دانی خزمان و نەهی لەخەراپە، واتە بێ شـەرمی و قسەی بێ مـەعنا و زوڵـم، یەعنی ئیشارە بۆ چەند فەزایل و ڕەزائیل کراوە کە دەتوانی. بیان کەیە پایە و ئەساسـی ئـەخلاقی چاكو خـەراپ، جـا بۆمانـەوەی فـەزائیلی ئـەخلاقی گەڕانــەوە بــۆ ئــەمر بەچــاکەو نــەهی لەخەراپــە زۆر پێویــستە، کــە ئەوانــە پەتوەنـدی یـان بەحـەقی خەڵکـەوە هەیـە، بـەلاّم ئـەداکردنی حـەقی خـەڵك و هەست بەخەراپەو چاو پۆشین لەوانە بەبێ ئیمانی تەواو بەخوا پێك نایە.

فەرامیشتی شێخ ((عبدلقادر))ی گەیلانی رحمه الله لێرەدا زۆر موناسبە کە دەفەرمووێ: وا لەگـەڵ خـوادا تێکـەڵ بـە، کەخـەڵك مـوزاحیم نـەبێ و واشـت پەیوەنی بەخەڵکەوە بێ نەفست مانیع نەبێ.

هەر لەبەر ڕەواجی تەعلیمی ئەخلاقی خوای تەعالا پێغەمبەری ﷺ بەعینوانی ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ۝٤ ﴾ القلم: ٤ ڕەوانە کرد، بۆسەرخەڵك، تا ئەخلاقی باش بەوپەڕەی عەزەمەت بگەیێنێ، هەر لە بەرئەوەش بوو کە تەواوی ئەخلاقی پێغەمبەر ﷺ موتابیقی قورئان بوو، قورئان بۆ خۆی شاهیدی ئەوحەقیقەتەیە، مەنزور لەئیمان هێنان بەپێغەمبەر ﷺ ئەوەیە کەبەهۆی پەیڕەوی تەواو لەوی لەتەواوی ژیاندا، ببیە نمونەی ئیتاعەی ئەمری خواو بەندەکانی خوا بەتەواوی ئەدابکرێ، ئەگەر لە بەجێ گەیاندنی ئەودوو حەقەدا بێ موبالاتی بکرێ، ئەوە ئیمان بەخوا و پێغەمبەرمان ناتەواو بێ، چونکە لە دینی ئیسلامدا کردنی ئەخلاقی بەرز و دووری لە کردەوەی خەراپ لەبەر ئەوە نیە کەقازانجی نەهێنیان تێدایە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کەخوا و پێغەمبەر فەرموویانە.

دیارە ئەوەی ئەوان بی فەرموون بێ مەسڵەحەت نیە، بۆیە کەخۆمان لەدرۆ دەپارێزین و ڕوو دەکەینە ڕاستگۆیی لەبەر ئەوەیە کەخوای گەورە لەسوڕی ((حج))دا دەفەرمووێ: ﴿ فَٱجۡتَنِبُواْ ٱلرِّجۡسَ مِنَ ٱلۡأَوۡثَٰنِ ۝٣٠ ﴾ الحج: ٣٠ خۆتان لەدرۆ بپارێزن با درۆ کەش سوودی هەبێ و لەڕاستیی یەکەت ئیحتیمالی زەرەر ببێ،

## ئەخلاقی خەراپ چۆن ئیمان لەکەدار دەکا

حەزرەتی عەلی لەوبارەوە دەفەرمووێ:ر ئیمان لە دڵی ئینساندا لە ئەووەڵەوە وەك نوختەکی سپی پەیدا یدەبێ و تا ئیمان قایم تر بێ نوختەکە گەورەتر دەبی، کاتێ ئیمان کامیل بوو دڵی ڕووناك دەبێتەوە.

بەلاّم نیفاق وەك نوختەیەكی ڕەش پەیدا دەبیّ و وردە وردە ڕەشییەكەی زیاد دەكا و كاتیّ بوو بە مونافیقی تەواو تەواوی دلّی تاریك دەبیّ و دەست دەكا بە خراپە. ئەو حەدیسەی پێغەمبەریش ﷺ كە شێخی بوخاری ڕیوایەتی دەكا هەر ئەو مەعنایە دەگەیەنیّ كە دەفەرمووی: زیناكەر لە وەختی زینادا ئیمانی لا نامێنیّ، دز لەكاتی دزیدا ئارەق خۆر لەكاتی ئارەق خواردنەوەدا ئیمان یان لەدەست دەدەن، واتا ئەو موسلّمانانەی تەركی نوێژ دەكا، یا واجبی دینی پاش گوێ دەخا، یا گوناهێكی كەبیرە دەكا، یا كارێكی خەراپ دەكا ئەوە لەو كاتەدا سیفەتی ئیمانی پێوە نامێنیّ، جا لەپاشان لەو گوناهەی كە كردبووی پەشێمان بۆوە وداوای عەفووی لە خوای گەورە كرد، ئەوە ئیمانەكەی دێتەوە، بەلاّم ئەگەر گوناهەكەی پیّ باش بوو قەسوەتی قەلب پەیدا دەكا و خواو دینی لەبیر دەچێتەوەو ئەخلاقی پەست و خەراپ غەلّبە دەكەن بە سەریداو خو بە خەراپەوە دەگریّ و ئیمان ڕووی تیّ ناكاتەوە، ئەگەر لەسەر ئەو حالّەتە وەمێنیّ و بچێتە باوەشی مەرگەوە بۆ هەتا هەتایە دەچێتە دۆزەخەوە، لە حەدیسێكی تردا دەفەرمووی: بەبیّ گومان ئیمان وەك لیباس وایەو ئەوەی خوا بی هەویّ ئەو لیباسەی خەلاّت دەكا، جا كە گوناهی كرد، لیباسی ئیمانی لەبەر دادەكەنن و ئەگەر تۆبەی كرد لەبەری دەكەنەوە، تۆبەش لە گوناە ئەگەر گوناهەكە حەقی خوابوو وەك ئارەق خواردنەوەو تەركی واجباتی دینی، ئەوە دەبیّ بڕیار بدا كە جارێكی دی ئەو گوناهە نەكاتەوەو تۆبەی لیّ بكا، ئەگەر حەقی بەندەكانیش بوو، دەبیّ حەقەكەیان بداتەوە، یان گەردەنی خۆیان پیّ ئازاد بكا، بەلاّم ئەگەر خوانەكردە حەقەكە تەجاوز بە ناموسی خەلّك بوو نابیّ باسی بكا، مەگەر لای قازی شەرعی بۆ ئەوەی بە سزای شەرعی بگا، دەنا هەر پەشێمان بوونەوەو تۆبەكردنی كافی یە.

بەڵام بەلای زۆر لە زاناکانەوە ئەوەی ئیمانی بەخواو پێغەمبەر بێ بە هۆی گوناهەوە بێ ئیمان نابێ‌و با لە کاتی مردنیشدا غەرقی گوناه بێ، وەك موسڵمانێکی گوناهبار دەمرێ، وەك خوای گەورە لە سوورەی ((نیساء)) دەفەرمووێ: بەڕاستی خوا لەوکەسانە خۆش نابێ، کە شەریك بۆ خوا پەیدا دەکەن‌و لەباقی گوناهی دی خۆش دەبێ لە ئەوەی کە خوا ئارەزوو بکا.

کەواتە مانای حەدیسەکانی پیشوو وا لێك دەدەنەوە کە ئەو کەسەی زینا دەکا، یا دزی دەکا، یا ئارەق دەخواتەوە لەوکاتەدا ئیمانی کامیلی نیە، هەر ئیمانی نامێنێ.

بەڵام ئەی ئەو ژن‌و پیاوانەی کاری خەراپ‌و بێ نامووسی دەکەن‌و شەرم لە خوا ناکەن، بزانن کە ئایینی ئیسلام لەبابەت زیناوە بەزۆری هەڕەشەتان لێ دەکاو سزای بۆ داناون، خوای گەورە لە سوورەی (اسراء) دا ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَىٰ إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاءَ سَبِيلًا ﴿٣٢﴾ ﴾ الإسراء: ٣٢ لە زینا نزیك مەبنەوە چونکە بەڕاستی کارێکی فاحیشەو ڕێگایەکی زۆر خەراپە، جا ئەوەی تۆزێك ژیر بێ دەبێ بزانێ کە خوای گەورە شتێك بە خەراپ دانێ دەبێ چەند خەراپ بێ؟ هەر لەبەر ئەو خەراپییە کە شەریعەتی ئیسلام دەفەرمووێ: ئەو ژن‌و پیاوانەی کە زینا دەکەن ئەگەر کوڕو کچ بوون دەبێ داری حەدیان لێ درێ، بەڵام ئەگەر ژن‌و پیاو بوون دەبێ ڕەجم بکرێن، دینی ئیسلام لەبەر پاراستنی ماڵ‌و نامووس و گیانی خەڵك بۆ هەموو کردەوەیەکی خەراپ سزایێکی داناوەو فەرقی دەوڵەمەندو فەقیرو دەسەڵات دارو بێ دەسەڵاتی نەکردووە، تا ئەمن‌و ئاسایش‌و ئارامی لەناو کۆمەڵدا بەر دەوام بێ‌و لە بەلاو موسیبەت بە دور دەبن.

ئەسحابە عەرزی پێغەمبەریان ﷺ کردو گوتیان: ئەی ڕەسولی خوا! بۆ ئەگەر پیاو چاکیشمان لەناودا بن بە خەراپەی خەراپ کارانەوە ئێمەش بە

هیلاك دەچین؟ حەزرەت ﷺ فەرمووی : بەڵێ: ئەگەر خەراپە لەناو کۆمەڵدا زۆر بوو پەرەی سەند وەك ئاگر تەڕو پووش پێکەوە دەسووتێنێ. فەرموووی: جارێك خوای گەورە ئەمری کرد بە حەزرەتی جوبرەئیل بچێ فلان دێ سەرەو بن کا، حەزرەتی جوبڕەئیل عەرزی بارەگای خوای کرد ئەی خوای گەورە! لە ناویاندا فلان کەس دەژی کە لە تەواوی تەمەنیدا گوناهێکی نەکردووە، خوا فەرمووی: ڕاست دەکەی، بەلام ئەو دەی زانی کە خەڵکی ئەو دێیە سەرپیچی لە ئەمری من دەکەن کەچی زۆر بێ موبالات بوو، بەرگری لێ نەکردن، لە کاتێکدا موسڵمان ئەگەر دەسەلاتی هەبووو دەبێ جڵەوی کاری خەراپ بگرێ‌و نەهێڵێ خەڵك بە ئاشکرا بێ شەرعی بکا. ئەگەر ئەوکاتە بە نهێنی خراپەیان کرد، ئەوە هەر خۆیانم سزا دەدرێن، بەلام ئەگەر بە ئاشکرا گوناهیان کردو کەس بەرگری نەکردن ئەوە هەموو دانیشتووەکانی ئەو جێگایە تاوان بارن‌و وەبەر قەهرو غەزەبی خوا دەکەون.

## دەرسی بیستو پێنج

### پێشەکی

لێرەدا باسی ئەو حەدیسانە دەکەین کە پێغەمبەر ﷺ لەو حەدیسانەدا باسی ئەو حەوادیسو ڕووداوی زەمایןو داهاتووی کردووەو بە خوێندنەوەیان ئەوەما بۆ دەردەکەویٚ کە پێغەمبەری خۆشەویستمان لە علومی زاهیریو باتینیدا چەند دەستێکی بالآی بووە، ئەوەشمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ئەو عەلامەتو نیشانانەی دەربارەی ڕۆژی قیامەتەوە فەرموویەتی: یەك لەدوای یەك دێنە دی.

بە خوێندنەوەی ئەو حەدیسانە نەك هەر ئینسانی موسڵمان، بەڵکو ئەوانەی کە موسڵمانیش نین ئیستیفادەی لیٚ دەکەنو باوەڕ دەکەن کە پێغەمبەری ئیسلام ﷺ بەڕاستی ڕابەری تەواوی ئەو ئینسانانە بووە کە پەیوەندیان بە خواوەیە، لەبەر ئەوەی کە چواردە قەڕن لەمەوبەر ڕابەرە گومڕاکانی وەها لە ڕووداوو بەلآو موسیبەتی ڕابردوو و ئێستاو داهاتوو ئاگادار کردوەتەوە وەك بە چاو بیبینیو دەزانی کە ئەو زانیاری یە کاری کەسێکە کە زۆر لە خوا نزیکەو دۆستی خوایەو خوای گەورە عیلمو زانیارێیکی زۆری پیٚ بەخشیوە چونکە تا ئێستا ئەوەی فەرمووبێتی هەمووی ڕاست هاتۆتە دی. دیارە فەرمایشتی ئەو کەسە قەت غەڵەت نابیٚ کە خوای گەورە لە سوڕەی (نجم)دا دەربارەی ئەو بفەرموویٚ: ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ ﴾ النجم: ٣ - ٤ ئەو لە خۆیەوە قسە ناکا، هەرچی بیڵیٚ: بە وەحی پێی گوتراوە

### نیشانەکانی ڕۆژی قیامەت

شێخی (ابن حجر) لە کتێبی (فتح الباری) دا ڕیوایەتێکی لە شێخی تەبەڕانی یەوە نەقڵ کردووە کە لە وێدا باسی بیٚ شەرمی و بیٚ حەیایی خەڵکی ئاخر

زەمـان مـان بـەو جـۆرە بـۆ دەكـا كـە حـەزرەت ﷺ فەرموويـەتی: ڕۆژی قیامـەت بەرپا نابێ تا کاتێ دنیا وایی لێ دێ کە ئافرەتێك بەلای کۆمەڵە پیاوێکدا دەڕواو یەکێك لە پیاوەکان ڕاست دەبێتەوەو دامێنی ئافرەتەکە دەگرێ وەك دووگی مەڕ هەڵدەدەنەوە، ئاوا کراسەکەی هەڵدەداتەوەو خەریکی دەبێ، کۆمەڵەکە کە ئەوە دەبینن یەکیان بە کابرا دەڵێ: کاکە! باشتر وابوو بی بەیە پاش دیوارێکەوە، ئینجا فەرمووی: ئەو پیاوە کە وا بە کابرا دەڵێ: لەناو ئەو کۆمەڵەدا ئەوەندە پەرهێزکار دەبێ وەك ئەبوو بەکرو عومەر لەناو ئێوەدا چەند پەرهێزکارن.

دووبارە شێخی موسلیم و بوخاری لە ئەبوو سەعیدەوە ڕیوایەت دەکەن کە حەزرەت ﷺ فەرموويەتی: ڕۆژێك دەبێ ئێوەی موسڵمان گەز بە گەزو بیست بە بیست وەدوا پێشڕەوەکانی خۆتان دەکەون، تەنانەت ئەوان ئەگەر چووبنە ناو کونی سوسنە مارەوە ئێوەش چاو لەوان دەکەنو دەچنە ناوی، عەرزیان کرد ئەی ڕەسولی خوا، مەبەست لە پێشڕەوەکانمان جوولەکەو گاورن؟ فەرمووی: ئەی ئەوان نەبن کێی ترە.

لە کتێبی میشکاتدا لە (عبدالله)ی کوڕی حەزرەتی عومەرەوە رضي الله عنه ڕیوایەت دەکا کە حەزرەت ﷺ لە فەرمایشتێکدا فەرموويەتی: بێ شك ئوممەتی من دوچاری زەمانێك دەبن کە بەنی ئیسرائیلیەکان دوچاری بوون، وەك دوو لینگە کەوش چۆن وەك یەکن ئەوانیش لەگەڵ بەنی ئیسرائیلیەکان ئاوا دێنەوە، تەنانەت ئەگەر یەکێك لە بەنی ئیسرائیلیەکان بە ئاشکرا لەگەڵ دایکی خۆی زینای کردبێ، لەناو ئوممەتی منیشدا هی وا پەیدا دەبێ زینا لەگەڵ دایکی خۆیدا بکا، ئینجا فەرمووی: بەبێ شەك بەنی ئیسرائیل بوونە حەفتاو دوو فیرقەو ئوممەتی من دەبنە حەفتاو سێ فیرقەو فیرقەیەکیان نەبێ ئەوانی تر هەموويان دۆزەخین، ئەسحاب عەرزیان کرد قوربان! ئەو فیرقە کامەیە؟ لە وەڵامدا فەرمووی: ئەو فیرقە بەهەشتی یە ئەوانەن کە ڕێگای منو ئەسحابی من دەگرنە بەر.

## دیمەنی مەرگ

هەر لە کتێبی میشکاتدا لە زمان (ثوبان) ەوە ڕیوایەت دەکا کە پێغەمبەر ﷺ لە حەدیسدا فەرموویەتی: هەرکاتێ ئوممەتی من دەستیان لە غەزا هەڵگرت و لەباتی غەزا دەستیان کرد بە بەرا کوژی و شمشێریان نەخستەوە کەلانەوە، واتە دەستیان لەبرا کوژی هەڵنەگرت ئەوە قیامەت بەرپادەبێ فەرمووی: قیامەت بەرپا نابێ تا هێندێی لە قیبلەکانی ئوممەتی کافر نەبنەوەو زۆربەیان نەبنە بت پەرست، ئینجا لەو فەرمایشتەدا فەرمووی: بێ گومان لەناو ئوممەتی مندا سێ نەفەر (كذاب) پەیدا دەبن کە خۆیان بە پێغەمبەر دەزانن لە کاتێکدا کە من خاتەمی پێغەمبەرانم و لە دوای من هیچ پێغەمبەرێك نابێ، فەرمووی: هەرکاتێ ئوممەتی من لەوە ترسا کە بەزاڵم بڵێن زاڵم، مەچۆ مەجلیسیان و لەگەڵیان دامەنیشە.

شێخی موسلیم لە ئەبوو هورەیرەوە ؓ نەقڵ دەکا کە حەزرەت ﷺ فەرموویەتی: دوو دەستە لە جەهەننەمیان پەیدا دەبن کە تا ئێستا نەبوون و وێنەی ئەوانم نەدیوە.

دەستەیەکیان ئەو کەسانە دەبن کە قامچییەکی وەك کلکە گا بە دەستەوە دەگرن و لە کاتێکدا کە خوای گەورە قەهرو غەزەبیان لێ دەگرێ و بە لەعنەتیان دەکا، ئەوان لە بەیانیدا تا ئێوارە بەو قامچی یانە لە خەڵکی بێ گوناە دەدەن،

دەستەی دووەم لەناو ژناندا پەیدا دەبن، کەهەرچەند لیباس لەبەر دەکەن، بەڵام لیباسەکەیان ئەوەندە تەنگ دەبێ وا دەزانی هیچیان لەبەر دانیەو دڵی پیاوی نا مەحرەم بە عیشوەو نازیان بۆ لای خۆیان ڕادەکێشن و خۆشیان تەماشای پیاوی نامەحرەم دەکەن، تووکی سەریان وەك بەرزی ناوەڕاستی پشتی وشتر کۆ دەکەنەوە، بێ گومان ئەوانە نەك هەر بەهەشت نابینن، بەڵکو لەدوورەوەش بۆنی ناکەن.

لەو حەودیسەدا باسی دوو شت کراوە کە نەبوون و حەزرەت ﷺ فەرموویەتی دەبن، یەکیان لەبارەی دەستەی ئەو زاڵمانەیەو کە لە کاتی دەست ڕۆیشتنندا زوڵم لە خەڵك دەکەن و ئەوی تریان باسی ئەو ئافرەتانەیە کە ئێستا پەیدابوون و وەك ئەو فەرموویەتی لیباسی تەنگ لەبەر دەکەن و وەك ڕووت بن وایە.

شێخی ترمزی لە ئەوبوو هورەیرەوە ڕضي الله عنه ڕیوایەت دەکا کەلە فەرمایشتێکدا

حەزرەت ﷺ فەرموویەتی هەرکاتێ ئوممەتی من ماڵی غەنیمەتیان بە ماڵی خۆیان لە قەڵەم دا و ماڵی ئەمانەتیان دەست بەسەردا گرت و لایان وابوو کە زەکات جەریمەیە لێیان دەستێندرێ و تەنیا بۆ ژیانی دنیا و پارە خوێندیان و پیاوان بە قسەی ژنەکانیان کردو لەبەر دڵی ژنەکانیان دڵی دایکیان ناڕەحەت کردو دۆستیان پێ لە باوکیان چاکتر بوو، لە مزگەوتەکانیان لەباتی باسی مەسئەلەی دینی هەر باسی مەسئەلەی دنیایان کردو، بێ دینەکانیان بوونە گەورەی عەشیرەت و، ناکەسەکانیان بوونە گەورەو سەردارو، لە ترسان ڕێزیان لێ گرتن و، ژنان دەستیان کرد بە گۆرانی گوتن و ئامرازی مۆسیقا ڕوو لە زیادی بوو، بازاڕی ئارەق خواردنەوە ڕەونەقی پەیداکردو، لەعنەتیان لە ڕابردووان کرد، ئەوە چاوەڕوانی بای سووری تووند بکەن و بومەلەرزە زۆر پەیدا دەبن، چاوەڕوانی ئەرز ڕۆچوون بن و ڕەنگ گۆڕانی خەڵك و، بەردباران لە ئاسمانەوە پەیدا دەبێ.

دووبارە شێخی موسلیم لە ئەبوو هورەیرەوە ڕضي الله عنه نەقڵ دەکا کە پێغەمبەر ﷺ لە حەدیسێکدا سویندی خواردو فەرمووی: قەسەم بەخوا دنیا وێران نابێ تا ئەو ڕۆژە نەیە کە پیاو نەزانێ بۆچی ئەو پیاوەی کوشت و کوژراو نەزانێ بۆچی کوژرا، یەکێك عەرزیان کرد قوربان! بۆ وا دەبێ؟ فەرمووی: فیتنەو کوشت و کوشتاری زۆر ڕوو دەداو بەهۆی ئەو فیتنەوە قاتیل و مەقتول

هەردووکیان دەچنە جەهەننەم، جا بەڕاستی ئەو فەرمایشتەی حەزرەت ﷺ ئێستا هاتۆتە دی، ئەو هەموو کوشت و کوشتارە بەهۆی پەیدابوونی فیتنەو فەسادەوەیەو لە نەتیجەی ئیختیلافی ئەحزابدا هەزاران کەس گیانی خۆی لەدەست دەدا، لە کاتێکدا نە کوژەر کوژراو دەناسیٚ، نە کوژراو کوژەر دەناسیٚ، هەر ئەگەر بیرو باوەڕیان یەك نەبوو هەریەکە لە حیزبێکدا بوو، لای وایە کوشتنی درووستە، زۆر سەیرە، هەموو ئەحزابەکانیش ئیددیعای ئەمن و ئاسایش و ئاشتی و دێموکراسی دەکەن، ئاگایان لەوحەدیسەی پێغەمبەر ﷺ نیە کەفەرموویەتی. ئەوەی لەبەر بیروڕا شەڕ دەکا و نازانیٚ داخۆ بیرووڕاکەی حەقە یان بەتاڵە هەر لەبەر تەعەسووبی حیزبایەتی و قەومایەتی ئاگری فیتنەیی خۆش دەکا و یارمەتی ناحەق دەدا، ئەگەر بکوژریٚ بەکافری دەکوژریٚ، ئەسحابەیەك عەرزی کرد ئەی ڕەسولی خوا! تەعەسووب یەعنی چی؟ فەرمووی: (تعصّب) ئەوەیە یارمەتی گەلەکەت بدەی و بشزانی لەسەر حەق نیە.

شێخی موسلیم و بوخاری لە ئەوبوو هوڕەیرەوە ﷺ ڕیوایەتیان کردووە کە حەزرەت ﷺ فەرموویەتی: لە نیشانەکانی نزیك بوونەوەی ڕۆژی قیامەت یەکیان ئەوەیە کە عیلم و زانیاری ئایینی لە بەین دەچیٚ و جەهل و نەزانی ڕووی لە زیادی دەبیٚ و زینا و ئارەق خواردنەوە زۆر دەبیٚ و ژمارەی پیاو کەم دەبیٚ و ژمارەی ژنان زۆر دەبیٚ و لە بەرامبەر پەنجا ژن پیاوێك، فەرمووی: فێلٚ بازو درۆزنی گەورە زۆر دەبن، قسەی وا دەکەن، نە ئێوە، نە باب و باپیری ئێوە ئەو قسانەیان بیستووە، فەرمووی: دووریان لیٚ بکەن با گومڕاتان نەکەن و دوچاری فیتنە نەبن.

گەورەترین فیتنە بۆ موسلٚمانان ئەوەیە کە هەر دەستەو جەماعەتێك بە چەند بیرو باوەڕو عەقیدەی فاسیدەوە پەیدا دەبیٚ، ئەندامەکانی هەولٚ دەدەن کە بە هۆی ئایەت و حەدیسەوە عەقیدە فاسیدەکەیان ئیسبات بکەن کە ئەوە دەردێکی زۆر کوشندەیە.

شێخی بوخاری لە زوبەیری کوڕی عەدی ﷺ نەقڵ دەکا کە فەرموویەتی:

جارێك بە خزمەتی ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ گەیشتین و شکایەتی زوڵمی حەجاجمان لا کرد، فەرمووی: خۆتان ڕاگرن و سابیر بن، چونکە خۆم لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە کە فەرمووی: تا ڕۆژی قیامەت ئەوە نابینن کە زەمانێك بێ ساڵێکی تر لە ئەو ساڵ باشتر بێ. جا لەو حەدیسەدا وا دەردەکەوێ کە گلەیی کردن لە زەمانەوەو ئەهلی زەمانە هیچ سوودی نیەو نابێ چاوەڕوانی ئەوە بێ کە لێرە بەدواوە حاکمی باشترمان بۆ پەیدا دەبێ؟ کەواتە چاك وایە ئەو فرسەتەی لە دەستمان دایە لە دەستی نەدەین و هەمیشە لە قەهرو غەزەبی خوا زۆر بترسین و بەهۆی کاری چاکەوە چاوەڕوانی ڕەحمەتی خوا بین.

حەزرەتی مەعاوەیە ﷺ دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست فەرمووی: لەناو ئوممەتی مندا کۆمەڵێك هەر دەبێ کە بە دەستووری خوا ڕەفتار بکاو گوێ نەداتە ئەوە داخۆ خەڵك لە گەڵیانن یان موخالیفیانن؟

(بیهقی) لە حەزرەتی عەلی یەوە ﷺ ڕیوایەت دەکا کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەو زووانە خەڵك تووشی زەمانێك دەبن، کە تەنیا ئیسلام ئیسمی قورئان خوێندن ڕەسمی دەمێنێ، مزگەوتەکانیان بە نەقاشی و کاشی کاری و فەرش و کارەبا دەڕازێنەوە، بەڵام لە لایەن تاعەت و عیبادەتەوە وێران دەبن و عالمەکانیان لە هەموو کەس خەراپ تر دەبن کە لە ژێر ئەو ئاسمانەدا دەژین، ئەوان دەبنە هۆی پەیدابوونی فیتنەو ئاخری ئەو فیتنەیەش دەگەڕێتەوە سەر خۆیان، مەبەست لەوە کەفەرمووی: ئیسلام هەر ئیسمی دەمێنێ ئەوەیە کە موسڵمانان هەر بەناو موسڵمانن و بەکردەوە شیعاری ئیسلامی تەرك دەکەن، هەروەك ئیستا دەبینین لای زۆربەی موسڵمانان نوێژو ڕۆژووو حەج زەکات هەر لایانە کۆمەلایەتیەکەیە دەی کەن، لایەنی مەزهەبی زۆر کەمە، چونکە زۆر بە بێ موبالاتی دەیان کەن، قورئان هەر ڕەسمی ماوە مەعنای وایە موبالات بە

مەفهومو مەعناکەی ناکەن، مزگەوت بە جوانترین ئەسبابی زینەت دەڕازێننەوە، بەڵام هیدایەتی تێدا نییە، بەزۆری باسی دنیای تێدا دەکەن، لۆمەی یەکتر دەکەن، غەیبەتی تێدا دەکەن، مەلاو مجێورەکان مزگەوت بە ماڵی خۆیان دەزانن.

ئەوەش کە فەرمووی: زاناکان دەبنە مایەی فیتنەی‌و ئاخری فیتنەییەکەش بۆ خۆیان دەگەڕێتەوە مەعنای ئەوەیە عالمان دوچاری فەسادی ئەخلاقی دەبن‌و لەبەر ئەوەی لە ڕێگای ڕاست لا دەدەن، فیتنە بەرپا دەبیٚ‌و ئاگری فیتنەییەکە داوێنی ئەوان دەگرێتەوە، چونکە یارمەتی زاڵم‌و ستەمکاران دەدەن‌و بۆ تەماعی دنیا فتوای بە ناحەقیان بۆ دەدەن‌و لە پاشان هەر ئەو ستەمکارانە تاوان باریان دەکەن بە خەیانەتەوە

(عبدالله) ی کوڕی مەسعوود ﷺ دەفەرمووێ: ئەگەر عولەما عیلمەکەیان بۆ سەرکەوتنی چەند ئینسانێکی باش بەکار ببردایە دەبوونە سەرداری زەمانی خۆیان، بەڵام ئەوان عیلمەکەیان بۆ وەدەست هێنانی ماڵی دنیا خەرج دەکەن، بۆیە لە نەزەری ئەهلی دنیادا بیٚ نرخ دەبن.

ئەنەسی کوڕی مالیك ر دەفەرمووێ: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك فەرمووی: یەکیٚ لە نیشانەی ڕۆژی قیامەت ئەوەیە کە یەکێك مزگەوتێك درووست دەکاو فەخری پێوە دەکا، بەڵام موسڵمانی زوو وانەبوون.

دەڵێن جارێك دیواری ماڵی (مطرف)ی کوڕی (عبدالله) ﷺ خەریك بوو بڕوخیٚ، گوتیان: ئەوە بۆ دیوارەکەت چاك ناکەیتەوە؟ فەرمووی: بۆچی چاکی کەمەوە؟ خۆ خاوەنەکەی ناهێڵی تاسەر تێیدا بژیم، لەپاشان فەرمووی: حەزرەتی نوح علیە سلام بەو هەمووە تەمەنە درێژەوە لە لقە خورما ژوورێکی پێکەوە نابوو، عەرزیان کرد قوربان! ئەوە بۆ خانوویێك درووست ناکەی؟ فەرمووی: بۆ ئەوە

کەسەی چەند ڕۆژێکی تر دەمرێ ئەوەندە بەسە، فەرمووی: زەمانێك دێ کە خەڵك دینیان دێتە خوارێ‌و خانووەکانیان بەرز دەکەنەوە.

## لەکاتی نزیك بوونەوەی ڕۆژی قیامەتدا

کاتێ ئەهلی ئیمان لە دنیادا نەما، خەڵکی حەبەشە دەست بەسەر تەواوی دنیادا دەگرێ‌و حوکمڕانی تەواوی دنیا دەکەن، ماڵی خوا وێران دەکەن، ناهێڵن حەج بکرێ، قورئان لە دڵ‌و زمان‌و کاغەزدا مەحو دەبێتەوە، حەق شناسی‌و لەخوا ترسان‌و ترسی دوا ڕۆژ لە دڵی کەسدا نامێنێ، شەرم‌و حەیا هەڵدەگیرێ، خەڵك وەك کەرو سەگ لەسەر ڕێگادا زینا دەکەن، زوڵم‌و ستەم و جەهلی حاکمان‌و تەجاوەزی خەڵك لەسەر یەکتر زۆر دەبێ، دێهات وێران دەبن، شاری بچووك وەك دێهات‌و شاری گەورە وەك شاری بچووك لێ دێ، گرانی‌و قاتی‌و وەبا و دزی‌و تالان زۆر دەبن، خەڵك جیماع زۆر دەکا، بەڵام ئەولادیان کەم دەبێ، دلان ڕەحمی خوایان تێدا نامێنێ، جەهل‌و نەزانی ئەوەندە زۆر دەبێ کەس ناوی خوای بە زماندا نایە، لەوکاتەدا لە ولاتی (سوریە) ئەمن‌و ئاسایش‌و هەرزانی لەهەموو جێگایەك زۆرتر دەبێ خەڵك لە هەموو لایەکەوە لەبەر بەلاو مووسیبەت و گرانی ڕوو دەکەنە ئەوێ، لەپاش ماوەیەك ئاگرێکی سامناك لە (جنوب) پەیدا دەبێ‌و ڕوو دەکاتە خەڵك‌و خەڵك لە ترسانی لە بەری ڕادەکەن، بەڵام ئاگرەکە هەر وە دوایان دەکەوێ، لەکاتی نیوەڕۆدا خەڵکەکە ماندوو هیلاك دەبن‌و ئیسراحەت دەکەن، ئاگرەکە ڕادەوەستێ، کاتێ ڕۆژ زۆر گەرم بوو دووبارە ئاگرەکە وەدوایان دەکەوێتەوە، کە شەو داهات ڕادەوەستێ‌و، خەڵکیش تۆزێك دەحەسێنەوە، هەرکە ڕۆژ بووەوە ئاگرەکە دوایان دەکەوێتەوەو خەڵك دەست دەکاتەوە بە ڕاکردن، بەو جۆرە ئاگرەکە دوایان دەکەوێ تا دەیان باتە ولاتی ((شام)) و لەپاشان ئاگرەکە دەگەڕێتەوە وون دەبێ، لە پاشان بەعزێك بەهۆی خۆشەویستی ولاتەکەیانەوە دەگەڕێنەوە بۆولاتی خۆیان ئەوانەی باسمان کردن ئاخرین عەلامەت‌و نیشانەی نزیك بوونەوەی ڕۆژی قیامەتن.

## دیمەنی مەرگ

یەکەم نیشانەی بەرپابوونی ڕۆژی قیامەت ئەوە دەبێ کە خەڵك تا سێ چوار ساڵ تەمەنیان بە غەفڵەت دەبەنە سەرو، ماڵو نیعمەتی دنیایان زۆر دەبێ، کاتێ بەیانی خەڵك زوو دەچێ خەریکی ئیشو کاری خۆیان دەبن، لەناکاو دەنگێکی دوورو درێژیان دێنە بەر گوێی کە دەنگی نەفخی سوور دەبێ، خەڵکی تەواوی دنیا ئەو دەنگەیان وەك یەك گوێ لێ دەبێو، زۆریان لا سەیر دەبێ و دەڵێن: ئەو دەنگە چیە؟ لە کوێوە دێ؟ ئینجا دەنگەکە وردە وردە بە قوەت ترو ناخۆشتر دەبێ، ترسو هەراسو وەحشەتێکی زۆر دەکەوێتە ناو خەڵکەوە، کاتێ ناخۆشی دەنگەکە زۆر دەبێ خەڵك لە ترسان دەست دەکەن بە مردن، بوومە لەرزەیەك پەیدا دەبێ خەڵك لە ترسان ڕا دەکەنە سەحرا، جانەوەرو وەحشی بەسەر لێ شێواویەوە ڕوودەکەنە ناو خەڵك، لە زۆر لاوە زەوی ڕۆ دەچێ، دەریاکان دێنە جۆشو وردە وردە ڕووبەری خۆیانو ژێر ئاو دەخەن، ئاگر دەکوژێتەوە، کێوەکان پارچە پارچە دەبن، بەهۆی تۆفانی باوە وەك تۆز بە حەوادا دەفڕن، بەهۆی بەرزبوونەوەی تۆزو غوبارو بای بە شیددەت سەرتا سەری دنیا تاریك دەبێ، ئەو دەنگە لەحزە بە لەحزە زبرترو گەورەترو ناخۆشتر دەبێ، تەنانەت ئاسمانو ئەستێرەکانیش خۆی بۆ ناگرنو هەڵدەوەرن.

خوای تەعالا نیشانەو عەلاماتەکانی ڕۆژی قیامەتی بەهۆی پێغەمبەرەکانەوە بە خەڵك ڕاگەیاندووە، بەڵام کاتی دیاری کراوی ڕۆژی قیامەتی بە پێغەمبەری ئێمەش ﷺ نەگوتووە، تەنیا بینا لەسەر ڕیوایەتی (ابن ماجه)و مەسنەدی ئیمام ئەحمەد لە ڕۆژی جومعەدا بەرپا دەوبێو حەزرەت ﷺ ئەوەشی فەرمووە، کە مەلائیکەو ئاسمانەکانو زەویو کێوەکانو دەریاکان هەموو ڕۆژێك لەوە دەترسن کە نەبادا ئەو ڕۆژە ڕۆژی قیامەت بێ، خولاسە کەس بە یەقینی نازانێ کەی ڕۆژی قیامەتە خوا نەبێ، لە خوای گەورە داوا دەکەین کە لە بەلاو موسیبەتی دنیاو قیامەت بمان پارێزێ

ئامین

## دەرسی بیستو شەش

## چەند مرواری حەقیقی

قسەو فرمایشتەکانی پیاو چاکان وەك دانەی مرواری ڕاستەقینە وانو هەر فەرمایشتێکیان میراتی ئینسانی موسڵمانەو لەهەر جێگایەك دەستت کەوت هەڵیّ گرەو بە زایەی مەدە، پیاوە گەورەکا فەرموویانە:

یەکەم: هەر کاتیّ یەکیّ لە گەورە پیاوانی هەر نەتەوەیەك بیّ هاتە لات ئیحترامی بگرە.

دووەم : ئینسانی بەدکار گرفتاری بەدکاریەکەی خۆی دەبیّو گوناهەکانیّ بە زنجیر ڕای دەکێشن.

سێیەم: خوای تەعالا ئەو شەش شتەی خۆش ناوی:

- تەماشاکردنی بە خیانەت
- زمانی درۆزن
- دەستیّ ئازاری بیّ گوناهێك بدا
- ئەو دڵەی نەخشەی خەراپ دەکێشیّ
- ئەو پێیەی کە بۆ خەراپە دەوڕوا
- ئەو کەسەی شاهیدی بە درۆ دەداو ئەوەی دوو برا پێکەوە دەنیّ

چوارەم: ئینسانی زۆر بڵیّ تووشی گوناە دەبیّو دیارە ئەوەی جڵەوی زمانی خۆی دەگریّ زۆر بە هۆشە

پێنجەم: ئەوەی درۆ زن بیّ ناتوانیّ موقاوەمەت بکا، بەلاّم ئەوەی ڕاست گۆ بیّ هەمیشە لەسر قسەی خۆیەتی.

شەشەم: هەر شتێك خۆفی خوای لەگەڵ بێ با کەمیش بێ لە گەنجێکی گەورە گەورە زۆرترە کە ڕەنجی بەدواوە بێ.

حەوتەم: دەست لە ئەدەب دانی کوڕەکەت هەڵمەگرە، چونکە بە لێدانەکەت نامرێ و لەبەرامبەر ئەو لێدانەدا لە جەهەننەم ڕزگاری دەکەی.

هەشتەم: ئەو کەسانە خۆش بەختن کە مسکینن، چونکە موستەهەقی بەهەشتن، ئەو کەسانە خۆش بەختن کە غەمگینن، چونکە ئاسوودە دەبن، ئەو کەسانە خۆش بەختن کە لەگەڵ خەڵك میهرەبانن، چونکە خۆشیان دەوێن، ئەو کەسانە خۆش بەختن کە لەسەر ڕێگای ڕاست ئەزیەت دراون، چونکە ئەوان دەبنە خاوەنی سەلتەنەتی ئاسمانەکان.

نۆیەم: تەنانەت خەڵك پێغەمبەرەکانی پێش ئێوەشیان ئەزیەت دەدان.

دەیەم: نانی جۆو ئاوی شیرنو لەو مەیدانە نوستن بەسە بۆ ئەو کەسەی مەحکوم بە مەرگە.

یازدەهەم: سەفەر دوو جۆرە، یەکیان سەەری دنیایە، ئەوەی تریان سەفەری قیامەتە، بۆ هەردوو سەفەرەکە دەبێ توێشووی ڕێگات هەبێ، لەکاتی سەفەری دنیادا دەبێ توێشووی ڕێگامان پێ بێ، بەڵام لە کاتی سەفەری دواڕۆژدا دەبێ دەبێ لە پێش سەفەرکەدا توێشووی بەڕێ بکەی.

دوازدەهەم: لە دنیادا دوو شت پەسەندن، قسەیەك وەبەر دڵان بکەوێ و دڵێك قسە وەرگرێ.

سێزدەهەم: یەکێك لە پیاوە گەورەکان دۆستێکی بوو زۆر نادان بوو، داوای لە پیاوە گەورەکە کرد ئیسمی ئەعزەمی فێرکا، هەرچەند پیاوە گەورەکە دەی گوت: تۆ شایستەی ئەوە نی، فائیدەی نەبوو، دەستی هەڵنەدەگرت، بەناچاری ئیسمی ئەعزەمی پێ گوت، بەڵام گوتی: نابێ بەکاری بێنی، چونکە ئەگەر بەکاری بێنی زەرەر دەکەی، ئەوەی گوت و پیاوە گەورەکە ڕۆیی، پیاوە نادانەکە هاتە خەیاڵیەوە گوتی: دەبێ ئیسمی ئەعزەم تەئسیری هەبێ، یان نا؟

هەر کە چاوی بە چەند ئێسقانێك کەوت ئیسمی ئەعزەمی خوێندو فەوری شێرێك پەیدا بوو، شێرەکە نەڕاندیو پەلاماری کابرای داو تێکی شکاند، کاتێ پیاوە گەورەکە گەڕایەوە تەماشای کرد کابرای ئەحمەقی دۆستی کەوتووەو شێرێك خەریکە بیخوا، لە شێرەکەی پرسی بۆچی ئەو پیاوەت کوشت؟ گوتی: لەبەر ئەوەی ئەو پیاوە بە خالقی من، بەلام نەبوو بەڕازقی منو هیچ بیرێکی بۆ رزقی من نەکردەوە، لەبەر ئەوە خواردم.

چواردەهەم: تەماشاکردنی خانوو ماڵو باغی دنیا پەرستان دەبێتە هۆی بزاوندنی تەماعی دنیاو دووری لە پەرهێزکاری.

پازدەهەم: ئەو شتەی لە دەرەوەدا دەچێتە ناو سکی ئینسانەوە، ناتوانێ ئینسان پیس کا، لەبەر ئەوەی ناچێتە ناو دڵیەوە، بەڵکو دەچێتە ناو ووڕگی یەوەو لە خوارەوە دێتە دەرەوە، بەلام حەقیقەت ئەوەیە ئەوەی لە داخلی ئینسان دێتە دەرێ ئینسان پیس دەکا، بۆ وێنە ئەفکاری بەد، کردەوە خراپەکان، وەك دزی، پیاو کوشتن، زینا، تەماعکاری، فریودانی خەڵك، تەماشای حەرام، بەدگۆیی، خود پەسەندی، بێ عەقڵی لە داخلی ئینسانەوە دێنو پیسی دەکەن.

شازدەهەم: تەنها بە داواکردن سەروەت وەدەست ناکەوێ، تەنیا بەڕەنگو بۆیە لە خۆدان جوانی وەدەست نایە، بە دەرمان خواردن سەلامەتی وەدەست نایە.

حەڤدەهەم: عیبادەت پیشەیەکە، خەڵوەت دووکانیەتی و تەقوا دەسمایەیەتیو بەهەشت قازانجی.

هەژدەهەم: سووری تەلاو زەردی زەعفەران، ژنانو کچانی گەیاندۆتە بەر دەرگای مەرگ.

نۆزدەهەم: بەدبەختە ئەوکەسەی بۆ خۆی بمرێو گوناهی نەمرێ، واتا لەپاش خۆی ڕەسمو یاسایەکی خەراپ بەجێ بێڵێ، وەك ئەو شتانەی کە دەبنە هۆی بەدئەخلاقی خەڵك، ئەو درووستیان بکا.

بیستەم : خۆ پاراستن لە پیاوی بەد کردار زۆر پێویستە لەبەر ئەوەی با ئەویش بی هەویٚ کاری چاك بکاو دووبارە خۆ خەراپی هەر لێدەوەشێەوە.

بیست و یەکەم: کەم گەیێی حیکمەتەو کەم خواردن سیحەتەو کەم خەوی عیبادەتەو کەم تێگەلاٚوی عافییەتە.

بیست و دووهەم: بێکارە ئەو عالمە،خەڵك سوود لە عیلمەکەی نەبا، ئالەتیٚ کە بەکاری نەهێنن، سەروەتێك خێری لیٚ نەکریٚ عیلمێك عەمەلی پیٚ نەکریٚ، مزگەوتێك نوێژی تیا نەکریٚ نوێژ لە مزگەوتا نەکریٚ، بیروڕایەکی چاك کەرەوەی نەگرن، قورئانێك نەی خوێنن، زاهیدێك ئارەزووی هەبیٚ، ئەو تەمەنە درێژەی توێشووی دوا ڕۆژی تێدا کۆنەکرابێتەوە.

بیست و سێهەم: ئەگەر ئێمە چاوی حەقیقەت بینمان هەبیٚ هەموو ڕۆژێك ڕۆژی حەشرە:

بیست و چوارەم: ئەی ئەو کەسەی ئارەزووی لەبەرکردنی لیباسی چاکت هەیە، کفن فەرامۆش مەکە، ئەی ئەو کەسەی ئاشقی خانووی چاکی، چاڵی قەبر لە بیر مەبەوە، ئەی ئەو کەسەی شەیدای خواردنی چاکی، دەبیٚ ئەوەت لەبیر بیٚ کە ڕۆژێك دەبیتە خواردنی مارو مێروو.

بیست و پێنجەم: کارێك کە شایستە نەبیٚ بە ئاشکرا بیکەی باشتر وایە باشتر وایە بە نەهێنییش نەیکەی.

بیست و شەشەم: لە ژنانی بەدکار دووری بکە، تەنانەت لەبەر ئافرەتانی باشیش ڕابکە.

بیست و حەوتەم: سیٚ کەس شایانی بەزەیین،

یەکەم: زانایەك کە لەژێر فەرمانی نەزانێکدا بیٚ،

دووەم: پیاوێکی نەجیب کە لە ژێر دەسەلاٚتی پیاوێکی بیٚ عەقڵدا بیٚ.

سێیەم: پیاوێکی کردەوە چاك لەبەر دەستی پیاوێکی خەراپدا بیٚ.

بیستو هەشتەم: بێ گومان ئەوەی دنیاو دواڕۆژی خۆش بووی ٚوەك پیاوی دوو ژنە وایە، کە یەکێکیان ڕازی بکا ئەوی دی تورە دە بێ.

بیستو نۆیەم: پیاوەتیو بەخشندەگی حەزرەتی عەلی ﷺ گەیشتبوە ئەو ڕادەیە کە خۆیان برسی دەکرد، بەلاّم نەیان دەهێشت فەقیر برسی بن، ڕۆژێك تا ئێوارە بە دوو درهەم کاری کردو ئێوارەکە گەڕیەوە بۆ ماڵ سواڵکەرێك لەبەر دەرگا ڕاوەستابوو درەمێکی لە دەست نا، سواڵکەرەکە زۆر بەوردی تەماشای درەمەکەی کرد، کابرایەك گوتی: ئایا شتێکت فرۆشتووە ئەوەندە تەماشای دەکەی؟ سواڵکەرەکە گوتی: بەڵێ ئابڕووی خۆم فرۆشتووە، کاتێ حەزرتی عەلی ﷺ ئەو قسەی لە سواڵکەرەکە بیست درەمەکەی تریشی دایەو عوزری هێنایەوەو گوتی: بەداخەوە نەم توانی قیمەتی تەواوی ئابڕووەکەت بدەم، سێ ڕۆژ هەرچی پەیدا دەکرد دەیدا بە داماوانو بۆ خۆیان بە برسی یەتی سەریان دەنایەوە.

سییەم: لەگەڵ توانای تۆڵەدا بەرگری لە تۆڵە باشترین جیهاد.

سیو یەکەم: خانوو بۆ ژیان و لیباس لەبرکردن بۆ بەدەن، و خواردن بۆ سك تێرکردنو هاوسەر بۆ لەززەت بردن بە حوببی دنیا لەقەڵەم ناردرێن. بەڵکو حوببی دنیا ئەوەیە کە ئینسان هەمیشە ڕوو بکاتە دنیاو پشت بکاتە خوا پەرستی.

سیو دووەم: شایستەی ئینسانی موسڵمان نیە بخەوێ تا وەسەیەت نامە لە بن سەردا نەبێ.

سیو سێیەم: تۆ خەریکی کۆکردنەوەی ئەو شتانەی کە ناتوانێ بیان خۆی، ئارەزووی ئەو شتانە دەکەی کە ناتوانی وەدەستیان بێنی خانووێك درووست دەکەی کە ناتوانی هەمیشە تێیدا وەمێنی.

سی و چوارەم: تەرکی تەکەبوور بکەو حەقیقەتی خۆت بناسەو خۆت بە کەم بگرە، سەرەتای ژیانی تۆ نوتفەیەکی ناشیرین بوو. بەشی ناوەڕاستی ژیانت پڕ لە کەسافەت و نەجاسەتەو ئاخری ژیانیشت کە لاکێکە دوورت دەخەنەوە.

سی و پێنجەم: ئەگەر ئینسانێك تا تەمەنی چل ساڵی بڕوا و دەست لە گوناه هەڵنەگریێ و تۆبە نەکا شەیتان دەست بە سەرو روویدا دێنیێ و دەڵێ: ئەی ئەو کەسەی دەستت لە گوناه هەڵنەگرت بە قوربانت بم.

سی و شەشەم: ئینسانی موسڵمان داری خورما دەنێژێ و لەوە دەترسێ دڕك دەرکا، بەڵام ئینسانی موونافیق دڕك دەنێژێ و دەی هەوێ خورما دەرکا.

سی و حەوتەم: یەکێ لە پیاوە گەورەکان بە هاروونە ڕەشیدی گوت: ئەگەر دەت هەوێ ڕزگارت بێ لەگەڵ موسڵمانە پیرەکان وەك باوکی خۆت و لەگەڵ گەنجان وەك براکانی خۆت و لەگەڵ بچووکەکان وەك ئەولادی خۆت و لەگەڵ ئافرەتاندا وەك دایك و خوشك و کچەکانی خۆت ڕەفتار بکە.

سی و هەشتەم: ڕووناکترین دڵ ئەو دڵەیە کە خاوەنی خولقی باش بێت و تاریکترین دڵ ئەو دڵەیە خاوەنی خولقی باش نەبێ و باشترن خواردەمەنی ئەوەیە بە کاسبی خۆت پەیدای بکەی.

سی و نۆیەم: بێ دەنگی عیبادەتێکی بێ زەحمەتە، سامێکی بێ قودرەتە قەڵاتێکی بێ وارشە، سەرکەوتنێکی بێ ئەسلەحەیە، هۆی ئیسراحەتی (کرام الکاتبین))ە دیواری موسڵمانانە، شێوەی مەکینانە، مەخرەنی حەکیمانە، هەراسە بۆ حاکمان و وەڵامی جاهیلانە.

چلەمین: تۆ لە دنیادا وەك ڕێبوارێکی بەرەو ماڵی قیامەت دەچێ، دەست پێ کردنی سەفەرەکەت لە لانکەیەو دوایشی گۆڕەو هەر ساڵێك لە تەمەنت مەنزلێك و هەر مانگەی چەند کیلۆمەترو هەر ڕۆژەی میلێك و هەر هەناسەی هەنگاوێکە.

## دیمەنی مەرگ

چل‌و یەکەم: ئەوەی لە بازاڕدا زکری خوا بکا، لەناو مردووواندا وەك زیندوو لەناو موتەکەبیراندا وەك غازی‌و ، لەناو درەختانی وشکدا وەك سەوز وایە.

چل‌و دووەمین: بینایەك کە قەت ویران نەبیّ دادگەرییە، تاڵی یەك لە دوایدا شیرین بیّ سەبەرە، شیرینی یەك ببیّ بە تاڵی شەهوەتە، نەخۆشی یەك دەرمانی نەبیّ ئەحمەقی یە، بەلاّیەك کە خەڵك دەبیّ لەبەری ڕاکەن ڕابواردنە.

چل‌و سێیەمین: پیاوێك داوای لە شێخ شەقیقی بەلْخی رحمه الله کرد ئامۆژگاری بکا، شێخ فەرمووی: ئەگەر دۆستت دەویّ خوا کافی یە. ئەگەر ڕەفیقت دەویّ مەلائیکەی سەر شانت بەسە، بۆ ئولفەت پێوە گرتنەوە قورئان بەسە، ئەگەر کارت دەویّ عیبادەت بەسە، ئەگەر ئامۆژگاریت دەویّ ئەوا مەرگ کافی یە، فەرمووی: ئەوەی گوتم کە پێت ناخۆش بیّ بۆ تۆ دۆزەخ کافی یە.

چل‌و چوارەمین: عیبادەت بکە بە ئەندازەی ئیعتاجی خۆت، دنیات بویّ بە ئەندازەی ژیانی خۆت، گوناە بکە بە ئەندازەی خۆ ڕاگرتنت بۆ سزاکەی، توێشوو لە دنیادا هەڵگرە بە ئەندازەی مانەوەت لە قەبردا، چاکە بکە بە ئەندازەی مانەوەت لە بەهەشتا.

چل‌و پێنجەمین: نە ئەوەندە تەڕ بە، کە ئاوت لیّ بگرن، نە ئەوەندە وشك بە ، بتسووتێنن. کەم گۆو کەم خۆرو کەم ئازار هەمیشە سالم‌و خۆشحاڵەو لە بەرامبەر بەلاّو موسیبەتدا سەلامەت دەبی، دوژمنی ئیمان درۆیە، دوژمنی ئابڕوو سواڵکردنە، دووژمنی عەقل تووڕە بوونەو دوژمنی سەروەت خیانەتە.

چل‌و شەشەم: شێخ حەسەنی بەسری رحمه الله دەفەرموویّ: سەگ خاوەنی دە سیفەتی بەنرخ‌و گەورەیە.

یەك: برسی دەبیّ کە ئەوە لە ئادابی سالحانە.

دوو: بەکەم قەناعەت دەکا کە عەلامەتی سابیرانە. خانووی نیە وەك (موتەوەکیلان)

سیّ: بەشەو کەم دەخەویّ کە ئەوە عەلامەتی شەو بێداران‌و خۆشەویستانە.

چوار: کە دەمرێ میراتی لەپاش بەجێ نامێنێ کە ئەوەش سیفەتی پەرهێزکارانە.

پێنج: خاوەنی بەجێ ناهێڵێ با لیشی بداو زوڵمیشی لێ بکا، کە ئەوەش نیشانەی موریدی بە سەفاو بە وەفایە.

شەش: بە بێ نرخترین شت قەناعەت دەکا کە نیشانەی خۆ بە کەم گرانە.

حەوت: ئەگەر یەکێك جێگاکەی داگیر بکا تەرکی دەکاو دەچێتە جێگایەکی تر کە ئەوە عەلامەتی ڕازی یانە.

هەشت: ئەگەر لە دوای لێدانی پارچە گۆشتێکی بۆ باوێن فەوری هەڵی دەگرێتەوەو ناڕەزایی دەرنابڕێ.

کە ئەوەش عەلامەتی خاشیعانە.

نۆ: لەو کاتەدا خواردنی لە پێش دادەنێن لە دوورەوە تەماشا دەکا کە ئەمەش عەلامەتی مسکینانە.

دە: کە لە جێگایەك ڕۆیی تازە موبالات بەو جێگایە ناکاتەوە کە ئەوەش نیشانەی مەحزونانە. فەرمووی: ئەی خۆشەویستەکان دەرسی قەناعەت لە سەگ وەرگرن. فەرمووی ئێوە عادەتەن دیوتانە کە کاتێ سەگی بازاڕی تەماشای سەگی ڕاوی دەکەن، دەوەڕن و دەڵێن: ئەی بێ چارەینە! هەرکە ئارەزووی خواردنی باش و خۆشتان کرد تووشی زنجیر بوون، ئەگەر ئێوەش وەك ئێمە بە شتی وشك و بەرپێیان قەناعەتتان بکردایە وەك ئێمە بە ئازادی دەژیان.

ئەبوو حازمی مەکی دەفەرمووێ: کە تۆ لای خوا مەقبوڵ بی، با کەسیش نەت ناسێ چ فەرقێك دەکا؟ ئەگەر لای خوا باش نی با خەڵکیش ستایشت بکەن چ دەبێ؟ ئەگەر لە عیبادەتا سەرکەوتوو بی با لە دنیادا شکستیش بخۆی بۆ دەترسی؟

## دیمەنی مەرگ

((کـەعب الاحبـار)) ﷺ فەرموویـەتی: لـە ئـاخر زەمانـدا عولـەمایی دینـی بـۆ خاتری نزیك بوونـەوە بە کار بەدەستان ئەوەندەیان یـەکتر ناخۆش دەوێ وەك ئەو پیاوانەی لەسەر ئافرەتان شەڕ لە گەڵ یەکتر دەکەن.

زوحاکی کوڕی مـەزاحیم رحمـه الله دەفەرمووێ: شـەوێکی تـەواو لـە کەلیمەیـەك گەرام کە سوڵتانی مەجازی پێ ڕازی بکەم و سولتانی حـەقیقیش ناڕازی نـەبێ دەستم نەکەوت.

مووسـلیمی نوحـاس دەفـەرمووێ: کـاتێ دینـارو دەرهـەمیان مـۆر کـرد شـەیتان ماچی کردن‌و گوتی: بەندەی موخلیسی من ئەو کەسەیە ئێوەی خۆش بوێ.

دەڵێن: عومـەری کـوڕی عبـدالعزیز رحمـه الله کەنیزەکێکی بـوو بەیانیـەك کـە لـە خـەو هەسـتا گـوتی دوێنـێ شـەو لـە خـەومـدا ئـاگری دۆزەخیـان ڕووناك کـردو پردی (سیرات)یان داناو داوای خولەفاکانیان کرد. لە پێشدا داوای (عبـدالملك) کـوڕی مـەڕوانیان کـرد بەسـەریدا پـەڕی بپەڕێتـەوە بـەلام نـەی تـوانی. عومـەری کـوڕی ((عبـدالعزیز)) زۆر بـە پەلـە گـوتی:زوو بلـێ: لەپاشـان چ بـوو؟ کەنیزەکـە گـوتی: ئینجـا وەلیـدیان بـانگ کـرد ئـەو کەوتـە خـواری. هێشتا قـسەی تـەواو نەکردبوو عومەری کوڕی ((عبدالعزیز)) بێ هۆش کەوت. کەنیزەکە هاواری کرد گوتی: بەخوا تۆ بە ڕەحەتی لە پردی سیرات پەڕیتەوە.

ژنی جوان، پیاوی پیر وەك ئەسپێك کە چۆن قاسید زوو بە مەقسەد دەگەیـەنێ. ئەویش ئاوا پیاوە پیرەکە دەگەیەنەتـە سـەر لێوی گۆڕ. دەرگایـەك بۆ میوانی لێ نەکرێیتەوە بۆ دکتۆر لێ دەکرێتەوە.

خەڵکی ئێستا دەتوانێ بە هەوادا بفڕی. بەهۆی بێ سیمەوە قسە بکا. لە هێزی ئەتۆم ئیستیفادە بکا. بەلام ناتوانێ وەکو پێویست منداڵەکانی پەروەردە بکا.

لەپاش تەواو بووونی شەڕ سێ نەوعە لەشکر بەجێ دەمێنێ، لەشکری بریندارو شەل‌و سەقەتان‌و لەشکری ماتەم زەدەکان‌و لەشکری تالان چیان.

شێخ عەلی هەجوێری رحمە الله لەسەر فەرمایشتی شێخ جونەیدی بەغدادی رحمە الله دەڵێ (تصوف) لەسەر هەشت سیفەتی پێغەمبەران دانراوە، واتە دەبێ وەك حەزرەتی ئیبراهیم علیە سلام بەخشندەو وەك حەزرەتی ئسیماعیل علیە سلام رازی بە رەزای خواو وەك حەزرەتی ئەییوب علیە سلام خۆ راگر بێ‌و وەك حەزرەتی زەکەریا علیە سلام بە ویژدان وەك حەزرەتی یەحیا علیە سلام لە دنیا غەریب بێ‌و وەك حەزرەتی مووسا علیە سلام لیباسی پەلاس‌و شڕ بێ‌و وەك حەزرەتی عیسا علیە سلام دنیا گەڕ بێ‌و وەك (محمد المصطفی) دەست کورت‌و فەقیر بێ.

یەکێك لە ((عبدالله)) کوڕی موبارەکی رحمە الله پرسی: باشترین شت کە دراوە بە ئینسان چیە؟ گوتی: عەقڵە. گوتی: ئەی ئەگەر عەقڵ نەبوو؟ گوتی: ئەدەبە. کابرا گوتی: ئەی ئەگەر ئەدەبیش نەبوو؟ گوتی: بێ دەنگی. کابرا گوتی: ئەی ئەگەر ئەویش نەبوو؟ گوتی: ئینسانێکی بە شعوور کە بتوانی پرس‌و رای پێ بکەی. کابرا گوتی: ئەی ئەگەر ئەویش نەبوو؟ ((عبدالله))ی موبارەك فەرمووی: ئەگەر وابوو مەرگی ناگەهان.

دوو کەس لە دنیادا بۆوەی دەبن بەردێکی قورسیان لە ورگ بەستی و بیان خەیە گۆمێکەوە. یەکەم: پارەدارێك کە حەقداران نەکاتە شەریکی خۆی.

دووەم: نەدارێك کە بە نەداریش تاعەت‌و عیبادەت نەکا. راستی چاکەو موتالا عیلم، راست ڕویی جوانی، رەفتاری جوان خانەوادە، سەنگ‌و تەرازوو دەغڵ‌و دان، تەربیەت ئەسپ ئاگاداری گیانداران، لیباسی سادە پاکی ئافرەت دەپارێزێ.

## دیمەنی مەرگ

### دەرسی بیستو حەوت

شێخ (نظام الدین)ی ئەولیا دەفەرمووێ: ئەگەر یەکێك لەسە ر ڕێگای تۆ دڕکی دانا تۆ بێ دەنگ لایان بە. بەڵام ئەگەر تۆش وەك ئەو چەقڵ لەسەر ڕێگای ئەو دابنێی تەواوی دنیا پڕ دەبێ لە دڕك.

ڕەبیعی کوڕی ئەنەس دەفەرمووێ: مێشوولە تا برسی بێ دەژی. بەڵام کە تێر بوو قەڵەو دەبێ و کە قەڵەویش بوو دەمرێ. هەروەها ئینسانیش کە قەڵەو بوو دەمرێ.

حاتەمی ئەسەم رحمه الله دەفەرمووێ: شەیتان لێی پرسیم: خواردنت چیە؟ خانووت لە کوێیە؟ لە وەڵامدا گوتم: خواردنم مەرگەو لیباسم کفنەو خانووم قەبرە.

جارێك عەرزی ئیبراهیمی ئەدهەمیان رحمه الله کرد بۆ خوا دوعامان قبوڵ ناکا؟ فەرمووی: چونکە ئێوە دەزانن خوا هەیە، بەڵام ئیتاعەی خوا ناکەن، پێغەمبەر دەناسن، وەدوای ناکەون، قورئان دەخوێنن، بەڵام ڕەفتاری پێ ناکەن.

نیعمەتی خوا دەخۆن، شوکرانەی خوا ناکەن. دەزانن بەهەشت بۆ تاعەت گوزارانە، بە تاعەت دوای ناکەون. دەزانن کە دۆزەخ بۆ گوناهکارانە، کەچی لێی ناترسن. شەیتان دوژمنتانە، کەچی دووری لێ ناکەنو خۆی لێ نزیك دەکەنەوە. بەدەستی خۆتان کەسو کارتان دەنێژن، کەچی پەندی لێ وەرناگرن. دەڵێن: مردن ڕاستە بەڵام تویشووی دواڕۆژ بەرێ ناکەن. خەراپەی خۆتان تەرك ناکەن. وەدوای عەیبەی خەڵك دەکەون. فەرمووی: ئاخر دوعای ئینسانی ئاوا چۆن قبوڵ دەبێ.

لە نوێژدا ئاگات لە دڵو لە مەجلیسدا ئاگات لە زمانو لەکاتی توورەبووندا ئاگات لە دەستو لەسەر سفرە ئاگات لە سکت بێ. ئینساف ڕەحەتەو سیحەت بیزاعەو سستی ئیزاعەتەو راستی ئەمانەتەو درۆزنی خیانەتە.

دوژمنــی زانیــاری تەکــەبوورەو دووژمنــی عــەقڵ تووڕەبوونــەو دوژمنــی ســەبر تەماعەو دوژمنی ڕاستی درۆزنیە.

ســەروەت لەبەرامبــەر عیززەتــدا شــەوکەت لەبەرامبــەر حیکمەتــداو دەســەڵات لەبەرامبــەر عیبادەتــداو ســوڕەت لەبەرامبــەر ســیڕەیداو شــوجاعەت لەبەرامبــەر سەخاوەتدا هیچ نین.

خولاســەی (زەبــوور) ئەوەیــە: ئــەوەی دووری لــە خــەڵك كــرد لــە دنیــاو قیامــەت نەجاتی بوو. خولاسەی (تەورات) ئەوەیە: ئەوەی بەو ڕەحەتیە ڕازی بێ كە خوا داوەیەتی بەو لــە دنیــاو قیامــەت ڕەحــەت دەبــێ. خولاســەی (ئینجیل) ئەوەیــە: ئەوەی تەركی ئارەزووی كرد عیززەتی دنیاو قیامەتی دەست كەوت. خولاسـەی (قورئـان) ئەوەیە: ئـەوەی بـە ئـەمری خـوا ڕەفتـاری كـردو بـەزەیی بـە مەخلوقـدا هاتەوەو ئاگای لە زمانی خۆی بوو لە دنیاو قیامەت سەلامەت دەبێ.

دەڵێن: چوار چاكە لە هەموو چاكەیەك باشترە، خۆ ڕاگرتن لە كاتی تووڕەبوونداو عیبــادەت لــەكاتی تــەنیاداو ســەخاوەت لــەكاتی دەســت كورتیــداو خــۆ بــە زل نەگرتن لەكاتی دەست ڕۆیشتندا.

بــەخیلی دەوڵەمەنــدو تــەماعی حــاكمو تەنبــەڵی ئینــسانی گــەنجو تەكــەبووری عابیدو پەشێمان بوونەوە ئینسانی بەخشندە ڕیسوا دەكەن.

زمان ئەگەر چی شمشێر نیە بەڵام لەو تیژترە، قسە هەر چەند تیر نیە بـەڵام لـەو ئەزیەت ناكترە. غەزەب ئەگەر چی شێر نیە بەڵام لەو وەحشەت ناكترە. گوناه هەرچەندە زەهر نیە بەڵام لەو بەهیلا بەرندەترە.

عالمی بێ عەمەل مۆمی بێ عەسەلەو، سەخی بێ زێڕ داری بێ سەمەرە

((دە شت))شت ((دە)) شتی تر دەخوا، چاكە خەراپەو، تەكەبوور عیلمو، تۆبە گونـاەو، درۆ ڕیـزقو، عـەدل زوڵـمو، غـەم تەمـەنو، سـەدەقە بـەڵاو، غـەزەبو تووڕەبوون عەقڵ، پەشێمانی سەخاوەتو، غەیبەت حوسنی عەمەل دەخۆن.

## دیمەنی مەرگ

پێنج شت زۆر ناڕەحەت کونندەن، نەخۆشی گوڵی و قەرزداری پیاوی بەدناو، حاکمی ستەمکارو جاهیلی بێ ئەفکارو دراوسێی بەدکار.

لە حەدیسدا دەفەرمووێ: هەشت شت قەت تێر نابن، چاو لە تەماشاو، زەوی لە باران و، ئافرەتی خەراپ لە پیاوو، عالم لە عیلمو، سواڵکەر لە سواڵ و، تەماعکار لە ماڵ و، دەریا لە ئاوو، ئاگر لە دار.

لە ژن چوار شتت بوێ، دڵی پاك و وێنەی بە حەیا و زمانی شیرین و هەمیشە دەست بەکار بێ.

ئەگەر مەرگ هات نابێ ناڕەحەت ببی، چونکە کارکەر لە ڕۆژی تەعتیلدا خۆشحاڵ دەبن و هەموو ناڕەحەتیەك لە بەین دەچێ و دەبنە ئارامی، ئەی ئەهلی دنیا! بزانن کە ڕۆژێك هەر دەمرن و لە پاش مەرگ زیندوو دەکرێنەوەو جەزاو سزای کردەوەی چاك و خەراپ دەبینن، جاکەواتە چەند ڕۆژ ژیانی دنیا بە سەهو نەچن و مردنتان لە بیر نەچێتەوە، دنیا، (دار المحنت)ە بۆ کەس تاسەر نیەو هەموو کەس دەبێ تامی مەرگ بچێژێ، ئەی بەندەکانی خوا! ئیمڕۆ ئێوە لەو حاڵە دان کە پێشڕەوەکانی ئێوە تێدا بوون، ئەوانە ساڵ و تەمەنیان لە ئێوە زۆرتر بوو. لە ئێوە بە دەسەڵات دارترو بە توانا تر بوون. کۆمەڵیان لە ئێوە زۆرتربوو، خانووەکانیان لە خانووی ئێوە خۆشتر بوو، بەڵام بە هۆی مروری زەمانەوە، ئەوڕۆ کەس هەواڵیان نازانێ، بەدەنیان لەناو گۆڕدا ڕزیوە، شارەکانیان وێران بوون، خانووەکانیان لە بەین چوون، کاتێ قەسرەکانیان پڕ لە فەرش و کاشی ڕازاوە بوون، بەڵام ئێستا بوونە کەلاوەو گۆڕستان، ئایا گومانتان لەوەدا هەیە کە ئێوەش بەو سەرنوێشتە دووچار نابن کە ئەوان دووچاری بوون؟ ئێوەش وەك ئەوان دوچاری تەنیایی نابنب؟ بەدەنی ئێوەش وەك بەدەنی ئەوان نابێتە خۆراکی کرمان؟

ئێمە خۆمان جوان دەکرد وەمان دەزانی خەڵك تەماشامان دەکا. نەمان دەزانی ڕۆژێك دەبێ تەماشای جەنازەکەمان دەکەن.

لە حەزرەتی عەلیم پرسی عیلم گەورەترە یان سەروەت؟ فەرمووی: عیلم. چونکە سەروەت میراتی قارِوون و فیرعەون و عیلم میراتی پێغەمبەران و عالمانە، ئینسان دەبێ ئاگاداری سەروەت بکا، بەلاّم عیلم ئینسان مەحفوز دەکا، دەوڵەمەند دوژمنی زۆرە، بەلاّم زانا دۆستی زۆرە، سەروەت بە خەرج کردن کەم دەبێ، بەلاّم عیلم پێی زیاد دەکا. دەوڵەمەند ڕژدو بەخیلە، بەلاّم عالم بەخشندەیە، دز دەتوانێ سەروەت بدزێ، بەلاّم ناتوانێ عیلم بدزێ. سەروەت فێری تەکەبوورت دەکا، بەلاّم عیلم حیلم زیاد دەکا. سەروەت سنووری هەیە، بەلاّم عیلم ئەندازەی نیە.لە کتێبی تەئریخدا هاتووە دەڵێ: شازادەیەك بە باوکی گوت: باوکە! دەم هەوێ لە دوا ڕۆژیشدا سەرکەوتوو بم، باوکەکەی ئامۆژگاری کردو گوتی: ئەگەر دەت هەوێ زۆر سەرکەوتووبی بچۆ بۆ لای فلاّن پاشا، چونکە کوڕەکە بەراستی بوو، لەپاش بڕینی چەند مەنزڵ گەیشتە بەر دەرگای کاخی سەڵتەنەتی پاشا و بە دەرگاوانەکانی گوت: بە پاشا بڵێن: فلاّن پاشا زادە هاتووە، چوون پێیان گوت: پاشا گوتی: لێی گەڕێن با چاوەڕوان بێ. لەپاش سێ ڕۆژ ناردی یەوە بۆ لای پاشا، پاشا گوتی: زۆر باشە با بێتە دەرگای دووەم، سێ ڕۆژیش لەوێ چاوەڕوانی کرد، کاتێ بۆ جاری سێ یەم بە پاشایان گوت: گوتی: با بێ، کاتێ شازادە واریدی کاخی سەلتەنەتی بوو تەماشای کرد هەرچی پێویستی ژیانە لێ یەتی، لە دڵی خۆیدا گوتی: دیارە ئەو پاشایە شێتی دنیایە، جا چۆن من ئامۆژگاری دەکا.

پاشا هەستی پێ کرد کە چی بەدڵ دا هات، لە کاخی سەڵتەنەتی ژوورێکی بۆ ڕازاندەوە و ڕۆژی دوایی بردی بۆ گەڕانی ناو شارو لە کۆچەو کۆلاّن و بازاڕدا ڕەقس و سەما و هەڵپەرکێ بوو، لە پاشان، پاشا شزادەی بانگ کردو کاسەیەکی پڕ لە شیری دایە دەست و دوو سەربازی بە شمشێری ڕووتەوە لەگەڵ ناردو گوتی: بڕۆ تەواوی شار بگەڕێ، بەلاّم ئاگادار بە نابێ یەك دڵۆپە شیر بڕێژێ، بە سەربازەکانی گوت: ئەگەر قەترە شیرێکی ڕشت پارچە پارچەی بکەن، سەربازەکان بە ئەمری پاشا بردیان بۆ ناو شار بۆ گەڕان و هاتنەوە بۆ کۆشکی پاشا، پاشا گوتی: شیرەکەت نەڕژتووە؟ سەربازەکان گوتیان: ئەی

پاشا! ئەگەر بی ڕژتایە دەمان کوشت، ئینجا پاشا ڕووی کردە شازادەو گوتی: دیارە ئیمڕۆ زۆر بە باشی تەماشای یاریو هەڵپەرکێی خەڵکی ناوشارت کردووە؟ شازادە گوتی: ئەی پاشا! بیرم هەر لە لای کاسە شیرەکە بوو، چونکە دەم زانی ئەگەر قەترەیەکی لێ بڕێژم دەم کوژن. لەبەر ئەوە لەززەتم لە تەماشای ناو شار نەدیو هەر شیرەکەم چاو لێ بوو، پاشا فەرمووی: ئیمڕۆ تۆ چۆنت گوزەراند ئێمە هەمیشە ئاوامان لێ دەگوزەری، ئەو سەروەتو حیشمەت وجاەو جەلالەو، ماڵو منداڵە بەلای منەوە نرخێکی نیەو بیر لەو شتانە ناکەمەوە .

تۆ بە چاو پێکەوتنی سەروەتو دەسەلأت لە بارەی مندا قەزاوەتت کرد، ئەی شازادە! لەو بەسەرهاتەی خۆت وابزانە کە سەرباز وەك ئیزرائیلو کاسە وەك لاشەو، شیر وەك ڕوحو ڕەقسو هەڵپەرکێ وەك شتی سەرنج ڕاکێشی دنیا وان، ئێمە ئاوا دڵمان بە شتی سەرنج ڕاکێشی دنیاوە نەبەستووە کە نەبادا شیری ڕۆحمان بڕژێو دڵمان لە یادی خوا غافڵ بێو زەرەدی پێ بگا، لە پاشان پاشا ئامۆژگاری شازادەی کردو ناردی یەوە.

نەدامەتو پەشێمانی چوار نەوعە، نەدامەتی ڕۆژێك، ئەو ڕۆژەی کە بە بێ نان خواردن لە ماڵ بچیە دەرەوە، نەدامەتی ساڵێك کاتێ جووتو گا بە غافڵی بەریە سەر، نەدامەتی تەمەنێك، ئەوەیە لەگەڵ ژنەکەت خوو ڕەوشتان وەك یەك نەبێ، نەدامەتی دایمی ئەوەیە خوات لێ ڕازی نەبێ.

سۆفی ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کە لەهەر نەوعە سازو ئاوازێکدا لە جریوە جریوی چۆلەکاندا، لە بۆنی گوڵاندا، لە ڕووناکی مانگو تیشکی ڕۆژدا، لە ئاسمانو زەوی، لە ڕەنگی درەختان، لە شوشەو بەرد، لە ئاهەنگو جەنگدا، لە ڕەقی بەرددا، لە خۆش بەختی و بەدبەختیدا، لە نەرمی زەویو گەرمی ئاگردا، لە چۆمی بارانیو لە ئەستێرەی ئاسمانی، لە بەرزی کۆساران‌و لە لمی بیابان‌و قوڕی دەشتان، لە سەوزی مێرگو میرغوزاران‌و لە حوزنی خەزان‌و جوانی بەهاردا تەماشای نووری خوا بکا.

## دیمەنی مەرگ

ئەی خەڵکی دنیا پەیڕەوی لە پێغەمبەر ﷺ بکەن ، بە ئەحکامی خوا ڕەفتار بکەن، بیدعەت مەخەنە ناو دینەوە، نافەرمانی مەکەن، سەبرتان بێ، بێ سەبری مەکەن، چاوەڕوانی ڕەحمەتی خوابن، نا ئومێد مەبن، زکرو یادی خوا بکەنەوە، لە بەینی خۆتاندا دووبەرەکی پەیدا مەکەن. بە تۆبەوە خۆتان لە گوناه پاك بکەنەوە، لە دەرگای خوا دوور مەکەونەوە.

دۆستانی من! ئێمە هەموومان دڵ مردووی نەفس، زیندووی تاڵبی دنیاین، کاتێ دڵ دەتوانێ زیندوو بێ کە خەیاڵی خەڵکی لە دڵدا نەبێ‌و بە نهێنی ڕوو بکاتە خوا. چونکە ڕواڵەت ئیعتیباری نیە، ژیانی دڵ لە ئەنجام دانی ئەمرو فەرمانی خواو سەبرو خۆ ڕاگرتن‌و پەنهانەوەیە، پارە پەیدا بکەو بیخۆ، بەلاّم ئاگاشت لە خەڵك بێ.

ئینسان تا لە هەموو عەیبێکی دوور نەکەوێتەوە نابێ ئامۆژگاری خەڵك بکا. ئینسانی تەنبەڵ هەمیشە مەحروومەو، پەتی پەشێمانی لە دەوری ملیەتی.

بتەوێ‌و نەتەوێ ئەوەی بۆت موقەددەر کراوە هەر بەسەرت دێ. پیاوی عارف‌و خوا ناس با تووشی موسیبەتیش ببێ ئیزهاری ناڕەحەتی ناکا.

عولەما‌و سولەحا‌و ئەولیا وەك کێوان وان، بای بەلاّ‌و موسیبەت ناتوانێ بیان بزێوێ‌و هەڵیان کەنێ‌و، هیچ کاتێ گومان ڕوو ناکاتە عەقیدەیان، موسڵمانینە! بیربکەنەوە با ڕۆژیش بەڕۆژووبن‌و برسی و تینو بن. کە ئێوارە بە ماڵی حەرام ڕۆژووتان شکاند چ فائیدە؟ تا ئێوارە ئاو ناخۆیتەوە، بەلاّم لەکاتی بەربانگدا خوێنی برای موسڵمانت دەخۆی خۆت تێر دەکەی، بەلاّم ئاگات لە دراوسێی برسی نیە.

ئاگاتان لە مەخلوقی خوا بێ، تا خالقی مەخلوق ئاگای لە ئێوە بێ. ڕەحم بە خەڵکی سەر زەوی بکەن، تا خاوەنی عەرشی بەرین ڕەحمتان پێ بکا.

بۆ دەست لە کردەوەی خەراپ هەڵناگرن کە لە دنیاو قیامەت دەبێتە هۆی ئازاری ئێوە؟ دەتان بەنە جێگایەك ئاگر دەتان سووتێنێ. دووپشك پێتانەوە دەدا، مار گازتان لێ دەگرێ، کرم دەتان خوا.

فریشتە دارکاریتان دەکا، هەر ڕۆژە تووشی جۆرە عەزابێکی تازەتان دەکاو دەچنە ڕیزی فیرعەونو هاپوونو قاڕوونو شەیتانەوە، ئایا وەختی ئەوە نەهاتووە کە دڵتان بە یادی خوا نەرم ببیو خوای گەورە لەبەرامبەر پارێزگاریتاندا لە فەزڵ بێ پایانی خۆیەوە ڕەحمەتی بێ ئەندازەو ڕزقی پاكو پاکیزەو ڕاحەتو دڵ نیایی بە مژدە داونیو ڕێگای گەیشتن بە وانەی نیشان داونو دەلیلەکەشی بەیان کردوونو لەوەش زیاتر فەرموویەتی: چاو لە گوناهەکانت دەپۆشمو سەرفی نەزەر لە خەتاکانت دەکەمو ئەجرو پاداشت بۆ زیاد دەکەم.

خواوەندی گەورە تۆی لە نەبوون هێنایە بازاڕی بوونەوە، هیچ نەبووی ژیانی پێ بەخشی، نەدار بووی دارای کردی، زەعیف بووی توانای دایتێ، نابینا بووی بینایی پێ بەخشی، جاهیل بووی زانای کردی، گومڕا بووی هیدایەتی دای.

کەواتە ئەی غافڵ! بۆ هەوڵ بۆ کەرەمی خوا نادەی؟ بۆ لە ئیتاعەی خوادا تەنبەڵی دەکەی؟ ئیتاعەی خوا لە دنیادا گەورەو لە قیامەتدا موحتەرەمت دەکاو مەرتەبەت بەرز دەکاتەوە، ئایا تۆ هەر ژیانی دنیات دەوێو دەت هەوێ لە باتی شتی چاك بە شتی خراپ ڕازی بیو دنیاو ئەعلی دنیاو جوانی زاهیری دنیا کە فانیەو دەبڕێتەوە ترجیح بدەی بەسەر فیردەوسی بەرینو پێغەمبەرانو پیاو چاکاندا؟

ئەی براکانم! ئەوە شەیتانە هەڵمان دەنێ بۆ بەدکاریو بەدکرداریو وەسوەسەمان دەخاتە دڵەوەو وادارمان دەکا سەرپێچی لە ئەمرو فەرمانی خوا بکەین بە خەتەری خەیاڵی ئیقتیسادیو بەدناوی (بین الملل)ی دەمان ترسێنێ، ئێمە دەبێ بە قسەی شەیتان بە سەهو نەچینو خۆمان لەو دوژمنە بەدخواهە

بپارێزین و سەرپێچی دەستووری خوای گەورە نەکەین، چاکترین ڕێگا بۆ ڕزگار بوون لە دەسیسەی شەیتان ئەوەیە ڕوو بکەینە خواو لە ڕێگای ئەنجام دانی کاری دینی هەنگاو بهاوێژین.

دۆستو گەورەکانم! ئێوە دەزانن کە لەپێش تەشریفی هێنانی سەروەری دوو عالەم حەزرەتی (محمد المصطفی) ﷺ بۆ دنیا، شیبهە جەزیرەی عەرەب چەند ناخۆش بوو، لەو کیشوەرەدا جۆرە ئینسانێك هەبوون بەری لە هەستی خۆشەویستی و شەفەقەتو ڕەحم بوون، بەڵکو دەتوانم بڵێم ئەو وڵاتە وەك کێوێی ئاتەشفشان بوو، کە هەموو کاتێكو ئانێك ئاگری بوو غزو عینادی لێ بەرزدەبوەوەو ئاوەدانی دوورو نزیکی دەکردە خۆڵەمێش، هەر هۆزەی لەگەڵ هۆزێکی تردا شەڕی بوو، هەر ناوچەی لەگەڵ ناوچەیەکی تردا لە جەنگدا بوو ئاگری جەزبەی خەڵك ئەوەندە خاوەن بڵێسە بوو، بە بزاوتنێکی کەم جۆگای خوێنی جاری دەکرد، کاتێ ئاگری شەڕیش هەڵدەگیرسا، تا چەند قەڕن زمانی دەکێشا، بۆ وێنە شەڕێ بەینی قەبیلەی (ئەوس)و (خەزرەج) تا سەدو بیست ساڵ دەوامی بوو، خولاسەی کەلام گیانو ماڵی کەس مەحفووز نەبوو، تا هەوری ئیسلام بارانی ڕەحمەتی باراند، کاتێ پێغەمبەر ﷺ پەیدا بوو لە وڵاتی وێرانی عەرەبستان بەهار هات خۆشەویستی لە جێگای عەداوەتو شەفەقەت لە جێگای نەفرەتو عەفوو لە شوێنی تۆڵەو فیداکاری لە جێگای خود خواهیو تەوازوع لە شوێنی تەکەبوور جێ گیر بوو، ئەو گۆڕانە گۆڕانێك بوو، بەتەواوی ناوچاوانی عەرەبی گۆڕیو بە هۆی بەرەکەتی ئەو گۆڕانەوە جیهان گەردانی عەرەب مێژووی دنیایان بە تەواوی گۆڕی.

ئەوە ئیحسانی گەورەی خوای تەعالا بوو کە بە هۆی فەیزو بەرەکەتی نەزەری کیمیا ئەسری خۆشەویستی خۆیەوە حەزرەتی (محمد المصطفی) ﷺ دڵی پەیڕەوانی خۆی پێکەوە بەستەوەو بە شریتی برادەریو بەرابەری یەوە کردنو لە چاڵی قووڵی زەلیلی یەوە خستنیە سەر شاڕێگەی تەڕەقیو پێش کەوتنەوە،

# دیمەنی مەرگ

تەواوی خەڵك لە قەراغ دۆزەخ ڕاوەستابوون‌و زۆری نەمابوو لە چاو لە سەر یەك دانانێك بكەوە ناوی، بەڵام ڕەحمی خوا دەستی گرتن‌و بۆ ئەوەی لە ئاگری دۆزەخ دوور كەونەوە بە هۆی خۆشەویستی خۆیەوە ڕێگای هێدایەتی نیشان دان.

ئێمەش دەبێ چاكەكانی خوای گەورەمان لەبیر نەچنەوەو بە گوێرەی قورئان ڕەفتار بكەین‌و دووبەرەكی لە بەینی خۆماندا پەیدا نەكەین، ئێمە كە خواو پێغەمبەر ﷺ و كیتاب‌و قیبلەمان یەكە نابێ ببێتە چەند دەستەو یەكترمان ناخۆش بوێ؟ دەبێ هەر كەس لە قەدەر توانی خۆی هەوڵی ئەمر بە چاكەو نەهی لە خەراپە بدا.

## ڕەچەیەك بۆ لابردنی نەخۆشی ڕووحی

شێخی شبلی رحمه الله بە دكتورێكی گوت: دكتۆر! من نەخۆشی گوناه كردنم هەیە، ئەگەر دەرمانی ئەو نەخۆشی یە هەیە بم دەیە، كاتێ شێخ‌و دكتۆر پێكەوە قسەیان دەكرد، پیاوێك لە مەیدانی ڕوو بەڕوو بونەوەی ئەوان خەریكی كا كۆكردنەوە بوو، سەری بەرزكردەوەو گوتی: ئەو كەسانەی هەمیشە یادی خوا دەكەنەوە كا كۆدەكەنەوە، ئەی شبلی! وەرە بۆ ئێرە من دەرمانی ئەو نەخۆشی یەت پێ دەڵێم.

گوڵی حەیاو، میوەی سەبرو، شوكرو، ڕیشەو ڕەگی عیجزو، نیازو، خونچەی خەم و ئەندوەو، بەرگ‌و گەڵای داری ڕاستی‌و، پێستی داری ئەدەب‌و، هەودای حوسنی ئەخلاقی بێنەو لە دەسكاونگی ڕیازەتدا بیان كوتەوەو، لەسەر یەك ئارەقی فرمێسكی پەشێمانیان تێكەڵ كەو، لە پاشان ئەو تێكەڵاوە بكە قاپلەمەی دڵتەوەو، لەسەر سێ پای ئارەزوو بی كوڵێنەو، كاتێ كوڵی بە هێڵەگی سەفای قەلب دای بێژەو، شەكری زمان شیرینی تێكەو، لەسەر ئاگری گەرمی موحیببەت داینێ، كاتێ ئەو چێشتە پێ گەیی، بە هەوای خۆفی خوا ساردی بكەوەو، نۆشی گیانتی بكە. وەختێ شبلی سەری بەرز كردەوە تەماشای كرد كابرا لەوێ نەمابوو.

هەروەها دەڵێن: ڕۆژێك حەزرەتی عەلی ﵁ بە بازاڕی (بەسرە)دا دەڕۆیی، چاوی بە کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر کەوت کۆبوونەوە، فەرمووی: ئەوە چ خەبەرە؟

ئەوە عەیادەی دوکتۆرێکە، ئەو خەڵکە هەموو نەخۆشن لەوێکۆبوونەوە، کە ئەوەی بیست تەشریفی چوو بۆ ئەوێ، تەماشای کرد کوڕێکی گەنج لەسەر کورسی یەك دانیشتووەو، ڕەچەتەی دەرمان بۆ نەخۆشەکان دەنووسێ.

حەزرەتی عەلی ﵁ فەرمووی ((ایها الطبیب اتعرف دواء الذنوب و تریاق القلب و ایصال المحب الی المحبوب) واتە ئەی دوکتۆر! دەرمانێك دەزانی کە نەخۆشی گوناه لاباو ژەنگی غەفڵەت لە دڵ بشواتەوەو عاشق بە مەعشوق بگەیەنێ؟ دوکتۆرەکە کە ئەو قسانەی بیست بێ دەنگ بوون ، کەوتە بیرکردنەوە، لەپاشان سەری بەرزکردەوەو گوتی: ((تذهب الی بستان الاسلام، ثم تعمد الی شجرة الایمان، فتاخذ منها اوراق المحبة وعروق الخلوص، وثمرة الیقین، ثم تضعها فی طبق محراب العبادة علی السجدة، ثم تطبخها بحبك) تەشریفت بچێ بۆ باغی ئیسلامو، لەوێ داری ئیمان بدۆزەرەوە، گەڵای عیشق و موحببەت و ڕەگ و لقی ئیخلاس و، میوەی یەقین لە میحرابی عیبادەتدا لەسەر بەرماڵ دانێ و بیکە بە ئاردو (وامزج فیها ماء الدموع ثم صفة بمنخل الفن واشربه فی ظلمة القبر حیث لا یراك احد) ئەگەر ئاوی پێویست بوو، ئاوی فرمیسکی ترسی خوا تێکەڵ کە، لە پاشان بە هێڵەگی کفن دای بێژەو، بیبە لە تاریکی قەبردا وەی خۆ، با کەس چاوی لێ نەبێ.

(فهذه دواء الذنوب و تریاق القلوب و ایصال المحب الی المحبوب ان شاء الله)

گوتی: ئەوە دەوای لابردنی نەخۆشی گوناهەو پاك کردنەوەی قەلبەو پەیوەندی بەندەکانە بە خواوە، ڕاوی دەڵێ: لەپاش گوتنی: ئەو قسانە دوکتۆرەکە نەعرەتەیەکی لێ داو وەفاتی کرد. حەزرەتی عەلی ﵁ فەرمووی: بەخوا تۆ

## دیمەنی مەرگ

دوکتۆری دنیاو قیامەت بووی، ئینجا ئەو عاشقی خوایەیان تەسلیم بە خاك کرد.

((سبحان الله)) نەخۆشەکانی ئەو زەمانە چەند موبارەك بوون،کە دوکتۆرەکانیان ئەولیای خوا بوون‌و، ئێمە چەند بەدبەختین کە دوکتۆرەکانی زەمانی ئێمە نوێژو ڕۆژوویان تەرك کردووە، دوکتۆرێك خۆی نەخۆش بێ، نە شیفای لە دەستەو نە وەفای لە دڵ دایە، تەماشای مەکری زەمانە زۆر سەیرە، لە لایەکی شار، گوڵ خۆی دەنوێنێ‌و لە لایەکی دی دڕك دێتە بەر چاو بە چەپکە گوڵی سەر سنگی جەنازە دەکەوێ، ئیوایە زۆر بە ئارەزوو بووکی سوواری سەیارە کردووەو بە دەهۆڵ و زوڕناوە دەی باتە ماڵەوە ئیواشە هەر لەو ڕۆژەدا بووکی مردووەو لەسەر تابووتی داناوە دەی با بۆ گۆڕستان. جاری وایە سەیارەی بووکێکی تازە لەناو جادەو بازاڕدا تووشی تابووتی بوکێکی تری تازەی مردوو دەبێ، پەنا بەخوا، لەلایەك شادی‌و لە لایەك شین، لەلایەك ماڵ ئاوەدانی‌و لە لایەك ماڵ وێرانی، لەلایەك لە ژووری بووك‌و زاوادا خووشکە بچووکەکانیان خۆشی دەردەبڕن، لە لایەکی دی خۆشك‌و برای بووکێك پێچکی تابووتی خوشکە مردووەکەیان گرتووەو بۆی دەگرین.

یەکێك بە بۆنەی جێژنی لە دایك بوونی کوڕیەوە مەڕێك دێنێ‌و بۆ سەر بڕین‌و یەکێ جەنازەی کوڕە جوانە مەرگەکەی دەبا بۆ گۆڕستان، یەکیان گۆشتی مەڕ دەرخواردی خزم‌و کەس‌و کارو میوانان دەدا، ئەوی تریان پارچەی جگەری خۆی لە قەبردا ڕادەکێشێ‌و بەدەنە ناسکە سپییەکەی بە کرمی گۆڕ دەسپێرێ، یەکێ بۆ زواکەی کەواو پانتۆل دەکڕێ، یەکی دی بۆ مێردی خوشکی کفن دەکڕێ.

یەکێ بۆ گواستنەوە دەی بەن بۆ حەمام دەت شون، یەکێ تر مردووە غەسڵی مردووی لێ دەردەکەن، یەکێ عەتری بووکێنی پێدا دەکەن، ، یەکێ کافوور بە کفنەکە وەردەکەن، بۆ یەکێك پەردەی ڕەنگاو ڕەنگی بوکێنی دەگرنەوە، بۆ بەخاك سپاردنی، یەکی دی پەردە بەسەر قەبرەکەیدا دەدەن‌و خەڵوەتگای

ئەبدی بۆ درووست دەکەن، هەزاران کەس بە دەنگی یەکێکەوە دەچن‌و، کەسیش جوابی هەزاران ناداتەوە، لە جێگایەك کەرو ئەسپ‌و وشتر مەلە لە ئاودا دەکەن‌و لە جێگایەکی دی دا نەوەی پێغامبەر ﷺ لە تینوان دەمرێ، لە کاخ‌و قەسری یەکێکدا هەزاران شەمع‌و مۆم‌و گلۆپی کافووری هەڵدەکرێ، کەچی خەتمی مورسەلین حەزرەتی (محمد المصطفی) ﷺ لە حوجرەی بێ چراو تاریکدا وەفات دەکا، ئەوەیە ژیانی دنیا دەبێ پەند و عیبرەتی لێ وەرگرین.

## دەرسی بیست و هەشت

## خۆ ئامادەکردنی حەزرەت بۆ سەفەری دوا ڕۆژ

لەپاش خاشبڕکردنی کوفرو شرك، لە شیبهە دوورگەی عەرەبداو بڵاوبوونەوەی ئیسلام و تەعلیمی شەریعەت و مەکارمی ئەخلاقی و ئەنجام دانی ئاخەرین ڕۆژێک کە پەیوەندی بە تەواوبوونی دینەوە بوو، لە کاتی (حجه الوداع)داو تەسدیقی ئەو ئایەتەی سورەی (مائدە) کە دەفەرمووی قَالَ تَعَالَىٰ: أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿ ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ ﴿٣﴾ ﴾ المائدة: ٣ واتە ئەورۆ دینی ئیسلامم بۆ کامیل کردن، سەروەری دوو عالەم، حەزرەتی فەخری عالەم (محمد المصطفی) لە شاری (مەدینە)ی ((مننەوەرە))دا دەستی کردبوو بە ئەنجام دانی ﴿ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَٱسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابًا ﴿٣﴾ ﴾ النصر: ٣ ئارەزووی گەیشتنی بارەگای خوای ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر دەبوو ، شەوو ڕۆژ خەریکی زکرو یادی مەعبوودی حەقیقی بوو هیچی تر، پێغەمبەر ﷺ لە مانگی ڕەمەزاندا هەمیشە (دە) ڕۆژ لە مزگەوتدا بە نیەتی ئیعتیکاف دەمایەوە، بەڵام لە ساڵی (دە)ی کۆچیدا بیست ڕۆژ مانەوە ڕۆژێك کاتێ حەزرەتی فاتمە (رضی الله عنها) هاتە خزمەتی، حەزرەت ﷺ فەرمووی: کچی خۆشەویست! وا هەست دەکەم کاتێ ڕۆیشتنم هاتووە، هەر لەو ڕۆژەدا یادی ئەزیەتی شەهیدانی غەزای (ئوحود) و فیداکاری مەردانەی ئەوانی کردەوەو تەشریفی چوو بە سۆزو دڵگەرمی یەکی زۆرەوە دوعای بۆ کردن و نوێژی جەنازەی لەسەر کردن و خوا حافیزی لێ کردن، وەك باوکێکی گەورەی میهرەبان کە لەو کاتەدا کە منداڵە ساواکانی دڵ خۆشی دەداتەوەو خوا حافیزیان لێ دەکا.

## شەهیدانی غەزای بەدرو ئوحد

شەرحی حاڵی شەهیدانی غەزای (بەدر)و (ئوحود) وە خوێنن و بزانن کە لە دوای ئیمان هێنان لە تەواوی شەوو ڕۆژانی تەمەنیاندا هەر ئەزیەت و ناڕەحەتیان پێ بڕا، لە پێش ئەوەدا کە دەورەی فەتح و کامەڕانی و خۆشی موسڵمانان دەست پێ بکا و ئەوانیش لەبەرو سەمەری ئەو سەرکەوتنانە بەهرەمەند ببن، بەتیغ و سەرە ڕمی دوژمنە بەدەکانی ئیسلام وەها پێکران، لە مەیدانی شەڕدا گیانیان ئەسپارد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ ئەو نووکتە لە یاد نەکەین کە دڵیان تا چ ئەندازەیەك پڕ بوو لە خۆشی و شادمانی، ئەوان لە مەیدانی شەڕدا لەسەر ئەو خۆڵ تۆزە گەرمە، وەها بە دڵی ئاسوودەوە گیانیان دا، کە لە وانەیە ئەو کەسەی لەسەر تەخت و قەرەوێڵەو لەناو لێفەو دۆشەکی گەرم و نەرم دایەو ئاوا بەدڵ بە ئاسوودەیی گیان تەسلیم نەکەن؟ بۆ نمونە، خەڵك لە غەزای ئوحودا سەعدی کوڕی ڕەبیعیان دی لەناو بریندارەکاندا کەوتبوو، لە حاڵی گیان دان بوو، گوتیان: ئەگەر وەسیەتێکت هەیە بیکە، فەرمووی: سەلامی من بە پێغەمبەری خوا ﷺ بگەیەنێنن و بە هەموو کەس بڵێن: کە گیانی خۆیان لە ڕێگەی ئەودا بەخت بکەن، ئەوەیە وەسیەتی من.

عەمماری کوڕی زیاد کاتێ زۆر بریندار بوو، لە حاڵەتی نەزعدا بوو پێغەمبەر ﷺ تەشریفی چووە سەری و فەرمووی: ئەگەر خواهێشتێکت هەیە بڵێ: بەدەنە بریندارەکەی خزاند و لە پێغەمبەر ﷺ نزیك بووەو سەری لەسەر پێی موبارەکە حەزرەت ﷺ داناو گوتی:

منم و هێمن تمناکە بە وقت جان سپاردن

بەرخ تو دید باشم و تو درونی دید باشی

واتە من ئاواتم هەر ئەوەیە کە لەکاتی گیان کێشاندا چاوم لەناو چاوانت و تۆ لەناو چاوانم دابێ لە پاش (حجّە الوداع) کاتێ پێغەمبەر ﷺ بۆ (مەدینە منەوەرە) گەڕایەوە، ڕووی موبارەکی کردە ئەربابی سیدق و سەفاو بە دەنگێکی دەردمەندانەوە فەرمووی: دۆستەکانم! ئێستا بڕیار وایە من لە پێش ئێوەدا بەرەو مەنزڵی دوا ڕۆژ وەڕێ کەوم، تا لە بارەگای خوای گەورەدا شاهێدی لەسەر ئیمامی ئێوە بدەم، فەرمووی: بەخوا من لێرەوە چاوم لە حەوزی خۆمە کە گەورەیی بە ئەندازەی بەینی (ایلە) و (حجفە) دەبێ، کلیلی تەواوی گەنجینەی دنیایان داوە بە من ئێستا من لەوە ناترسم کە لە پاش ڕۆشتنی من کافر ببنەوە، لەوە دەترسم کە نەبادا تووشی ئارەزووی دنیا پەرستی ببن لەسەر حیرسی دنیا یەکتر بکوژن، ئەوکاتە ئێوەش وەك نەتەوەو گەلەکانی پێش خۆتان بە هیلاك دەچن.

لەپاش ماوەیەکی کەم یادی زەیدی کوڕی حارثی رضي الله عنه کردەوە، کە عەرەبەکانی لای (سوریە) شەهیدیان کردبوو فەرمووی: ئوسامەی کوڕی زەید لەشکری بەرێ و تۆڵەی باوکی خۆی بکاتەوە، لەو ڕۆژەدا زیاتر خەیاڵ و فکری لە لای ئەو کەسانە بوو کە زۆر ئیرادەتیان بوو لە خزمەتیدا، شەوێك یادی مردووەکانی گۆڕستانی بەقیعی کردەوە، بەقیع گۆڕستانی موسڵمانە عادیەکان بوو، لە خۆشەویستیان نیوە شەو هەستاو تەشریفی چوو بۆ بەقیع و بۆ مردووەکان زۆر بە دڵسۆزیەوە دوعای بۆ کردن و ڕووی کردە گۆڕی دۆستەکانی و فەرمووی: بەم زووانە دێمە ڕێزی ئێوەوە.

ڕۆژێك تەواوی موسڵمانەکانی بانگ کردە مزگەوت، کاتێ کۆبوونەوە فەرمووی: موسڵمانینە! بەخێرهاتن، خوای تەعالا ڕەحمەتتان بەسەردا ببارێنێ و نا ئومێدیتان لە بەین بەرێ و دەسگیرتان بکا و ڕزق و بەرەکەتتان بداتێ و خۆشەویست و سەربەرزتان بکاو نیعمەتی ئومن و ئاسایشتان بداتێ، فەرمووی: من ئێستا تەنها لە بارەی خۆفی خوا پەرهێزکاریەوە ئامۆژگاریتان دەکەم، ئێستا تەنیا خواحافیزی و ناسری ئێوەیەو هەر لەبەر ئەو لە خوا ترسانەشە

داواتـان لێ دەکـەم وریـا بـن نـەبادا تووشـی مـەغرووری و تەکـەبوور بـن و ئـەو دەسـتووری خوایـەتان هەمیـشە لـە یـاد بـێ کـە لـە سـوورەی (قـصص)دا دەفـــــەرمووێ: ﴿ تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾ القصص: ٨٣ واتـە ئـەوە سـەراو مالـێ دواڕۆژ، دەی دەیـن بـەو کەسانەی نایان هـەوێ لەسەر زەوی تەکـەبوور بکەن و فاسید نین و فەسادیان ناوێ و ئەنجامی چاك بۆ پەرهێزکارانە.

ئینجا فەرمووی: ئایا جێگای موتەکەبیران جەهەننەم نیە؟ لە ئاخریدا فەرمووی: سەلام لەسەر هەمووتان و لەسەر ئەوانەش کە بە هۆی ئیسلام بوونیانەوە دوای من دەکەون، لە بیست و نۆی مانگی (صفر) دا ڕۆژی دووشەممە لەو کاتەدا کە لە چوونە سەر قەبرانی جەنازەیەك دەگەڕانەوە لە ڕێگادا تووشی ژانە سەرێکی زۆر بوو کە نەخۆشی وەفاتی لەوێوە دەستی پێ کرد.

دەسەسرێکی لـە سـەری بەسـتبوو، ئـەبوو سـەعیدی خـدری ﷺ دەفـەرمووێ:

کـاتێ دەسـتم لەسـەری موبـارەکی حـەزرەت ﷺ دا ئەوەنـدە گـەرم بـوو دەسـتم خۆی بۆ ڕانەدەگرت، تا شەوی دووشەممە لەبەر ئەوەی نەخۆشی یەکەی زیاد بوو حەڕەمەکانی بە میل و ئارەزووی خۆیان گوتیان: با لەوڕۆ بەدواوە حەزرەت ﷺ هەر لە حوجرەی حەزرەتی عایشە (رضی الله عنها) وەمێنێ، ئەو وەختە پێغەمبـەر ﷺ ئەوەنـدە زەعیـف بووبـوو، نـەیتوانی تـا حـوجرەی حـەزرەتی عایـشە بە پێـی خـۆی بـڕوا، لەبـەر ئـەوە حـەزرەتی عـەلی و حـەزرەتی عـەبباس یارمەتیان داو بردیانە حوجرەی حەزرەتی عایشە.

حەزرەتی عایشە دەفەرمووێ: کاتێ پێغەمبەر خوا ﷺ نەخۆش دەبوو ئەو دوعایەی دەخوێندو دەستی موبارەکی بە بەدەنی خۆیدا دێنا (اذهب الباس رب الناس و اشف الشافی لا شفاء الا شفائك لایغادر سقما) حەزرەتی عایشە

(رضی الله عنها) دەفەرمووێ: ئەوجارە من ئەو دوعایەم خوێندو ویستم دەستم بەسەر بەدەنی موبارەکیدا بێنم، بەلام حەزرەت ﷺ دەستی گرتمو هێنایە دواوەو فەرمووی: (اللهم اغفرلی والحقنی) .

## پێنج ڕۆژ لە پێش وەفاتیدا

پێنج ڕۆژ لە پیش وەفاتی شەریفی کە ڕۆژی چوارشەممە بوو لە سەر کاسەیەکی بەردین دانیشتو حەوت قاپە ئاوی بەسەری موبارەکیدا کرد تۆزێك ئاسوودەبوو، لەپاشان تەشریفی هاتە مزگەوتو فەرمووی: موسڵمانینە! لە پێش ئێوەدا قەومێك بوو کە قەبری ئەنبیاو پیاوچاکانی خۆیان دەکرد بە سوجدەگا، ئێوە قەت وا مەکەن، ئینجا فەرمووی: لەعنەتی خوا لە جوولەکەو گاور کە قەبری پێغەمەرەکانیان کردە سوجدەگا، لە پاشان فەرمووی: قەبری من وا ساز مەکەن کە لەوێوە قەبر پەرستن دەست پێ بکا، لە دوایدا فەرمووی: موسڵمانینە! هەر قەومێ قەبری پێغەمبەرەکەیان بکەن بە مزگەوت خوا قەهرو غەزەبیان لێ دەگرێ، ئینجا فەرمووی: بزانن من هەمیشە ئێوەم لەو کارە مەنع کردووەو بزانن ئێستاش هەر ئەو وەسیەتەتان لێ دەکەمم، ئەی خوایە تۆ شاهید بە ئەی خوایە تۆ شاهید بە، لەپاشان فەرمووی: خوای تەعالا بەندەیەکی بۆ ئەو ئەمرە هەڵبژارد کە یان دنیاو مافیها قبوڵ بکا، یان دواڕۆژ، بەلام ئەو دوا ڕۆژی قبوڵ کرد، حەزرەتی سدیقی ئەکبەر رضي الله عنه کە ئەداشناسی نبووەت بوو، کاتێ لە زمانی موبارەکی پێغەمبەر ﷺ ئەو قسەی بیست چاوی پڕ بوون لە ئاوو گریاو فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا! دایكو باوكو پارەو ماڵو جسمو جانی ئێمەت فیدا بێ.

خەڵك زۆر سەیریان تەماشای حەزرەتی ئەبوو بەکر صدیق رضي الله عنه دەکرد، کە لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ ڕووداوی شەخسی خۆی بەیان دەکا بۆ دەگری؟ بەلام

ئەوەی دەگریا دەی زانی مەوزوع چیە؟ بیٚ قەراری حەزرەتی ئەبوو بەکری صەدیق ﷺ فکری پێغەمبەری ﷺ بۆ لایەکی دی بردوو فەرمووی: ئەوکەسەی کەلەهەموان زیاتر قەرزداری سەروەت و ڕەفاقەتی بم ئەبوو بەکرە، ئەگەر بڕیار بیٚ لەناو ئوممەتمدا یەکێك بە عینوانی دۆست هەڵبژێرم ئەو کەسە ئەبوو بەکر دەبیٚ، بەلاّم ئێستا بناغەی دۆستی من ئیسلامە ئەوە بەسە، هیچ کەس غەیری ئەبوو بەکر حەقی نیە دەرگایەکی یچووك بۆ لای مزگەوت بکاتەوە.

لە ڕۆژەکانی ناساغی حەزرەتدا ﷺ ئەنساریەکانی (مەدینە) لە سەر یەك دەگریان، کاتیٚ حەزرەتی ئەبوو بەکرو حەزرەتی عەباس بە لایاندا تیٚ پەڕین و دەگریان گوتیان: ئەوە بۆ دەگرین؟ گوتیان: یادی ڕەفاقەتی پێغەمبەر ﷺ دەکەینەوە بۆیە دەگرین.

حەزرەت ﷺ کە بیستیەوە ئەنسار ئەوەندە نارەحەتن فەرمووی: خەڵکینە! من لەبارەی ئەنسارەکانم وەسیەتتان لیٚ دەکەم، چونکە ژمارەی موسڵمانان ڕۆژ بە ڕۆژ زیاد دەبیٚ، بەلاّم ئەنسارەکانم بە ئەندازەی خۆی لە تەعامدا دەمێننەوە، ئەوان وەکو کراسی بەدەن و توێشووی سەفەری ژیانی من وان، ئەوان فەرزی خۆیان بەجیٚ هێناوە، بەلاّم حەقی ئەوان ئێستا نەدراوە، ئەو کەسەی نیگەهبانی قازانج و زەرەری ئوممەت بیٚ پێویستی سەر شانیەتی کە زۆر ڕێز لەوان بگریٚ و ئەگەر لە بەعزیٚ ئەنساریش خەتایەك ڕووی دا چاو پۆشی لیٚ بکریٚ، پێغەمبەر ﷺ دەستووری دابوو ئوسامەی کوڕی زەید لەشکری بەریٚ بۆ شام و تۆڵەی بابی بکاتەوە، موناففەکان گوتیان: ئەوە ڕاست نیە کە لاوێکی عادی بیٚ تەجرەبە بکریٚ بە گەورەی لەشکر، دەبیٚ پیاوی گەورەو دنیا دیدەو باتەجرە بە سارد و گەرمی زۆری دیبیٚ بکریٚ بە سەرداری سپا.

پێغەمبەر ﷺ لەو بارەوە فەرمووی: ئیمڕۆ ئێوە ڕەخنە لە سەرداری ئوسامە دەگرن و دوێنی ڕەخنەتان لە زەیدی باوکی دەگرت، بەخوا زەیدیش لایەقی ئەو مەنسەبە بوو، ئوسامەش بۆ ئەوە دەبێ، فەرمووی من زەیدم لە هەمووان خۆشتر دەویست و لە دوای ئەویش ئوسامەی لە هەمووان خۆشتر دەوێ ئینجا فەرمووی: دیاری حەلاڵ و حەرام نیسبەت وەلای من مەدەن، چونکە من ئەوەم بە حەلاڵ داناوە کە قورئان بە حەلاڵی داناوەو ئەوەم حەرام کردووە کە قورئان حەرامی کردووە، لەپاشان ڕووی کردە ئەهل و بەیت بۆ ئەوەی کە نەبادا بەهۆی نزیکی لە ڕوتبەی نوبووەتەوە لە عەمەل دوور کەوەنە فەرمووی: ئەی کچی پێغەمبەر ئەی فاتمە! ئەی پووری پێغەمبەر سفیە! بۆ ڕزگاربوون لە عەزابی دوا ڕۆژ کاربکەن، چونکە من ناتوانم ئێوە لە عەزابی خوا ڕزگار بکەم.

ئەو خوتبەو وتارە ئاخر وتاری حەزرەت ﷺ بوو کە لەبەردەم دانیشتوانی مزگەوتدا فەرمووی: لەدوای وتارەکەی تەشریفی چوە حوجرەی حەزرەتی عایشە (رضی الله عنها) نەخۆشی یەکەی گەیشتە ئەندازەیەك لەبەر ناڕەحەتی قاچێکی موبارەکی ڕادەکێشا و ئەوی دی هەڵدەکێشایەوە، جاری وابوو پشتەماڵەکەی بەسەر سەری خۆیدا دەداو جاری واش بوو لای دەبرد، لەوکات و حاڵەتە ناخۆشەدا حەزرەتی عایشە (رضی الله عنها) ئەو چەند کەلیمەیەی لە زمانی موبارەکی حەزرەت ﷺ بیست، لەعنەت لە جوولەکەو گاور قەبری پێغەمبەرەکانیان کردووە بە عیبادەتگا.

لەپاشان چەند وەسیەتێکی فەرموو: یەکێ لەوانە فەرووی: هیچ کافرێك نابێ لە شیبهە جەزیرەی عەرەبدا وەمێنێ و زۆر ڕێز لە سەفیران و وەفدان بگرن، هەرچەند زۆریش نەخۆش بوو، بەلام تا یازدە ڕۆژ لەسەریەك هەر هات بۆ مزگەوت، ڕۆژی پێنج شەممەلە نوێژی مەغریبدا بوو بە ئیمام سوورەی(مرسلات)ی خوێند، وەختێ نوێژی عیشا چاوی هەڵبڕین و فەرمووی:

نوێژ کرا! عەرزیان کرد موسڵمانان چاوەڕوانی تۆن، لەگەنێکی ئاو داواکردو خۆی پێ شتو ویستی بچێ بۆ نوێژو بێ هۆش بوو.

لەپاشان وەهۆش هاتەوەو فەرمووی: لە نوێژ بووەنەوە؟ عەرزیان کرد ئەی ڕەسولی خوا! موسڵمانان چاوڕوانی تۆن، ئەو جارەش ویستی هەستێ؟ بەلاّم دووبارە بێ هۆش بووەوە، لەپاش ماوەیەك هاتەوە سەر خۆو ئەو پرسیارەی کردەوە، عەرزیان کرد یا ڕەسول الله! هەموو خەڵك چاوەڕوانی تۆیە، جاری سێ یەم دەست نوێژی گرتو ویستی هەستێو بێ حاڵ بوو، کاتێ هاتەوە سەر خۆ فەرمووی: ئەبوو بەکر ﷺ ببێ بە ئیمامی جەماعەت، حەزرەتی عایشە عەرزی کرد لەبەر ئەوەی ئەبوو بەکر زۆر دڵ ناسکە کە لە شوێنی تۆ ڕاوەستێ ئیمامەتی پێ ناکرێ، حەزرەت ﷺ فەرمووی: دەبێ هەر ئەو پێش نوێژ بێ.

مینبەری پێغەمبەر ﷺ کە چەند ڕۆژ بوو خالّی بوو ئەوڕۆ بەرماڵەکەشی خالّی بوو، کاتێ حەزرەتی ئەبوو بەکر ﷺ لە جێگای پێغەمبەر ﷺ بۆ ئیمامەت ڕاوەستا، زۆر بە نا ئومێدی پەردەکانی حوجرەی حەزرەتی عایشە کە ڕووبەڕووی مزگەوت بوون دادرانەوەو دڵی موسڵمانان بێ ئیختیار دەستیان کرد بە ناڵینو دوو قاچی حەزرەتی ئەبوو بەکر دەستیان کرد بە لەرزین، چونکە بە دەستووری پێغەمبەری خوا، تۆفیقی خوا، شامیلی حەزرەتی ئەبوو بەکر بوو، نوێژەکەی بۆ کراو حەزرەتی ئەبوو بەکر ﷺ لە حەیاتی موبارەکی پێغەمبەردا ﷺ حەڤدە جاریش پێش نوێژی کردووە.

## دوو ڕۆژ لە پیش وەفاتیدا

ڕۆژێك لە ڕۆژانەدا کاتێ حەزرەتی ئەبوو بەکر ﷺ پێش نوێژی نیوەڕۆی دەکرد، حەزرەت ﷺ ویستی بچێ بۆ مزگەوت حەزرەتی عەلیو حەزرەتی

عەباس چوونە بن باڵی و تەشریفی هاتە ڕیزی نوێژکەرانەوە، خەڵکەکە زۆر بە بێ قەراری لە حەزرەتیان دەڕوانی، حەزرەتی ئەبوو بەکر ﷺ ویستی بەرماڵەکە بەجێ بیلێ، حەزرەت ﷺ بە دەست ئیشارەی بۆ کرد کە نەیەتە دواوە، ئینجا حەزرەتی ئەبوو بەکرر لە تەنیشت پێغەمبەر ﷺ ڕاوەستاو دەستیان کرد بە نوێژ، حەزرەتی ئەبوو بەکر ﷺ ئیقتیدای بە پێغەمبەر ﷺ کردو خەڵکەکەش بە حەزرەتی ئەبوو بەکر، کە نوێژ تەواو بوو حەزرەت ﷺ چووە حوجرەی حەزرەتی عایشە (رضی الله عنها).

## ڕۆژێك لە پێش وەفاتی

گەورەی نەوعی بەشەر، کاتێ نزیك بوو لە زنجیری دنیا ئازاد بێ، بەیانی کەهەستان یەکەم کارێکی کردیان ئەوەبوو، چل نەفەر غولامی بوو ئازادی کردن، سەروەتی دنیای حەوت دینار بوو، بە حەزرەتی عایشەی گوت، بیاندە بە فەقیران، فەرمووی: خەجاڵەت دەبم پێغەمبەری خوا بچێتە حزور خواو سەروەتی دنیای لە ماڵدا بێ.

فەوری حەزرەتی عایشە (رضی الله عنها) بە دەستووری پێغەمبەر ﷺ حەوت دینارەکەی لە بەینی فەقیراندا دابەش کردو لە ئاخرین شەوی ژیانی حەزرەتدا نەوت نەبوو چرای پێ هەڵکەن و لە ژنێکی دراوسێ قەرزیان کرد، ئەو ئەسلەحەی لە ماڵیاندا بوو بە موسڵمانانی بەخشی، یەکێ لەو ئەسلەحانە زرێکەی بوو کە لای جولەکەیە ڕەهنی سێ (ساع) جۆ بوو، لەبەر ئەوەی لەحزە بە لەحزە بێ تاقەت تر دەبوو داوایان لێ کرد دەرمان بخوا، بەلام حەزرەت ﷺ فەرمووی: دەوا ناخۆم بێ هۆش بوو، دەمی مووبارەکیان لێك کردەوەو

دەرمانیان دایە، کاتێ وەهۆش هاتەوە زانی دەوایان داوەتێ فەرمووی: ئێستا ئەو دەرمانە دەرخواردی دەوا خۆران درا.

## ڕۆژی وەفاتی شەریف

نۆی مانگی (ربیع الاول) ڕۆژی دووشەممە حاڵی حەزرەت ﷺ تۆزێك باش بوو، کاتێ نوێژی بەیانیان دەکرد، ئەو پەردەی لە بەینی مزگەوت و حوجرەی شەریفدا دادرابۆوە کەمێکی وەلاداو تەماشایەکی سەفەکانی جەماعەتی کرد، لە خۆشیان زەردەخەنەیەکی کرد خەڵکەکە وەیان زانی تەشریفی دێ بۆ مزگەوت، خەریك بوون سەفەکانیان تێك دەن، حەزرەتی ئەبوو بەکر ﵁ کە ئیمام بوو و، ویستی جێگای ئیمام بەجێ بێڵێ، بەلام حەزرەت ﷺ بە ئیشارەی دەستی مەنعی کردو پەردەکەی دادایەوە، ئەوە ئاخرین جار بوو کە موسڵمانان لە حاڵی حەیاتیاندا حەزرەت ﷺ ببینن.

ڕەنگە خواستی خوا لەسەر ئەوە بووبێ خۆشەویستەکانی بۆ دواجار جەمالی جیهان ئارای سەروەری دنیاو قیامەت تەماشا بکەن، خولاسە وەختێ هات کە تەنانەت نەك موسڵمانان، بەڵکو تەواوی خەڵکی دنیا بە خەیاڵیاندا نەدەهات.

بەیانی ڕۆژی نۆی مانگی (ربیع الاول) لەماڵی پێغەمبەردا ﷺ حاڵەتێکی زۆر عەجایب حوکم فەرما بوو، خەریك بوو ڕۆژێك هەڵێ و ڕۆژێك ئاوابێ ببێ هەوری بێ هۆشی یەك جیاوازە بێ هۆشی یەك لە دوای یەك دەهاتنە حوجرەی پێغەمبەر ﷺ و لە هەر چوار لاوە دەوریان گرت، تۆزێك وەهۆش دەهاتەوەو بێ هۆش دەبۆوە، لەو حاڵە ناڕەحەتیەدا کچی خۆشەویستی حەزرەتی فاتمەی داوا کرد، کاتێ فاتمە حاڵی باوکی ئاوا دی خۆی بۆ ڕانەگیراو سەری بە سنگەوە ناو دەستی کرد بە گریان کاتێ حەزرەت، فاتمەی ئاوا دی، فەرمووی: کچم! مەگری کاتێ من لە دنیا ڕۆیشتم ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ١٥٦﴾ البقرة:

١٥٦ بخوێنە، چونکە سوودی بۆ ڕەحمەتی هەموو کەس تێدایە، حەزرەتی فاتمە (رضی الله عنها) پرسی ئایا

بۆ تۆش؟ فەرمووی: بەڵێ بۆ منیش ڕەحەتی تێدایە. تا حەزرەت ﷺ ناڕەحەتر دەبوو حەزرەتی فاتمە (رضی الله عنها) دەردی گران تر دەبوو، کاتێ حەزرەتی (رحمة للعالمین) زانی فاتمە زۆر ناڕەحەتە ویستی شتێك بفەرمووێ: حەزرەتی فاتمە بە پەلە هات گوێ بە لێوی موبارەکی پێغەمبەرەوە ﷺ ناو حەزرەت ﷺ فەرمووی: کچم! من خەریکم ئەو دنیایە بەجێ بێڵم، حەزرەتی فاتمە بێ ئیختیار دەستی کرد بە گریان، حەزرەت ﷺ فەرمووی : ئەی فاتمە! لەناو ئەهلو بەیتی مندا تۆ لە هەموو کەس زووتر دێی بۆ لام، حەزرەتی فاتمە زۆری پێ خۆش بوو، چونکە زانی ئەو جوودایییە ماوەی زۆر نابێ، حاڵی حەزرەت ﷺ لەحزە بە لەحزە خەراپتر دەبوو.

حەزرەتی فاتمە (رضی الله عنها) باوکەڕۆی دەکردو حەسەنو حوسەین زۆر غەمگین بوون، پێغەمبەر ﷺ بانگی کردنو ماچی کردنو وەسیەتی کر زۆریان حوڕمەت بگرن، ئینجا حەرەمەکانی بانگ کردو ئامۆژگاری کردن، لەوکاتەشدا دەی فەرموو (مع الذین انعم الله علیهم) جاری واش بوو دەی فەرموو (اللهم بالرفیق الاعلی) ئینجا داوای حەزرەتی عەلی ﵁ کرد، حەزرەتی علی حەزرەتی عەلی ﵁ هاتە پێشەوەو سەری موبارەکی پێغەمبەری ﷺ دەباوەش گرتو پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری ئەویشی کرد، ئینجا یەك دەفعە ڕووی کردە خواو فەرمووی: الصلوه الصلوه وما ملکت ایمانکم) واتە : نوێژو ئەوەی دەستی ڕاستان خاوەنی بێ، وەختی وەفاتی حەزرەت ﷺ هاتبوو

حەزرەتی (رحمە للعالمین) پاڵی دابوەوە بە حەزرەتی عایشەوە، کاسەیەکی پڕ لەئاویان لە تەنیشت دانابوو دەستی موبارەکی تێ دەخستو بەسەرو چاویدا دێناو جاری وابوو ڕووی موبارەکی سوور دەبووو جاری واش بوو زەرد دەبوو، وەردە وردە زمـانی موبـارەکی دەبـزووتو دەی فـەرموو: لا الـه الـه الا الله ، ان للموت سكرات) لەوکاتی گیان کێشانەدا وەختێ (عبدالرحمن) کوڕی حـەزرەتی ئەبووبەکر بە سیواکێکی تازەوە هاتە خزمەتی، حەزرەت چاوی لـە سیواکەکەوە بڕی، حەزرەتی عایشە (رضـی الله عنها)حاڵی بـوو کە پێی خۆشە سیواك بکا، سیواکەکەی بۆ نەرم کردو دایە دەستی، حـەزرەت ﷺ وەك ئینسانێکی ساغ سـیواکی کـردو دەمو دانـی وەك ئاوێنــە دەیــان نوانــد، لەپاشـان دەسـتی بەرزکردەوە وەك بیەوێ بچێتە جێگایەكو خوا حافیزی لە خەڵکەکە بکا وابوو، لەوکاتەدا ئەو کەلیمانەی بەسەر زماندا هات (بلی الرفیق الاعلی، بل الرفیق الاعلی ) لەدوای سێ جار گوتنی: ئەوە دەستی موبارەکی دانەواندەوەو بۆ هەتا هەتایە ڕوحی موبارەکی بۆ عالەمی قودس پەروازی کرد (اللهم صلی علی محمد و علی اله محمد) کاتێ وەفاتی فەرموو، چێشتەنگاو بوو، ڕۆژی دووشـەممەی مـانگی (ربیع الاول)ی ساڵی یازدەی کۆچی بوو، تەمەنی موبارەکی بە تەقویمی کۆچی شێستو سێ ساڵو چوار ڕۆژ بوو، ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ۝١٥٦﴾ البقرة: ١٥٦

بـە بیـستنی وەفـاتی دڵـی موسـڵمانان پـارە پـارە بـوو، ڕەنگیـان سـیس بـوو، فرمێسکیان هەڵدەوەران، لـە چـاوی زەویو ئاسمان خوێن دەباری، ڕەنگـی ڕۆژ تاریك بوو، خەڵك فرمێسکیان دەڕشت، هێنـدێك لـە ئەسحاب ئەوەنـدە ناڕەحـەت بـون نـەیان دەزانـی چـی بکـەن. بـەعزێ ئاوەدانیـان بـەجێ هێـشتو ڕێـان کـردە دەشتو بیابان، ئیوابوو لە جێگای خۆی نەدەجولاو لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ لە پێش ڕۆژی قیامەت ، قیامـەت بەرپا بوو، لـەو حاڵـەدا حـەزرەتی ئـەبوو بـەکر رضي الله عنه بێ دەنگو لەسەر خۆ هاتـە حوجرەی حـەزرەتی عایـشە (رضـی الله عنهـا)

## دیمەنی مەرگ

لەسەر خۆ پشتەماڵەکەی لەسەر ڕووی موبارەکی حەزرەت ﷺ هەڵدایەوەو ناوچەوانی ماچ کردو فرمێسکی هەڵوەراندو دای پۆشیەوەو فەرمووی: دایكو باوکم فیدات بن بە پاکی ژیای‌و بە پاکی مردی، بەخوا تۆ جارێکی دی نامریەوە.

کاتێ حەزرەتی ئەبو بەکر هاتە مزگەوت حەزەرەتی عومەر ئاگای لە خۆ نەمابوو، دەی گوت: بەخوا حەزرەت وەفاتی نەکردووە، بەڵکو وەك حەزرەتی مووسا چل ڕۆژ بانگ کرا بۆ بارەگای خوا، ئاوا بانگ کراوەو دەگەڕێتەوە، بە حەزرەتی مووساشیان دەگوت: وەفاتی کردەوەو هاتیشەوە، حەزرەتی ئەبوو

بەکر ر کە ئەو قسانەی حەزرەتی عومرەی ﷺ بیست فەرمووی: ئەی عومەر! خۆت ڕاگرەو بێ دەنگ بە، ئینجا ڕووی کردە خەڵکەکەو فەرمووی:

خەڵکینە! ئەوەی محمدی دەپەرست بابزانێ کە محمد وەفاتی کردو، ئەوەی خواش دەپەرستێ با بزانێ کە خوا زیندووەو قەت نامرێ، ئەوە شتێکی ڕاستەو خواش لە قورئاندا وای فەرمووەو ڕوونی کردۆتەوە وەك لە سورەی دەفەرمووێ: ﴿ مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ ۚ وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا ۗ وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ ﴾ آل عمران: ١٤٤ بە بیستنی ئەو ئایەتە موسڵمانەکان هاتنەوە سەر خۆ،

(عبدالله) کوڕی حەزرەتی عومەر ﷺ دەفەرمووێ وەالله ی وامان هەست کرد،

وامان زانی، ئەو ئایاتە لە پێشدا نازڵ نەبووە، حەزرەتی عومەر ﷺ

دەفەرمووێ: کە حەزرەتی ئەبوو بەرکر ﷺ ئەو ئایەتەی خوێندەوە باوەڕم کرد وەفاتی فەرمووە. حەزرەتی فاتمە (رضی الله عنها) دەی فەرموو: ئەی باوکی خۆشەویست! دەعوەتی خوات قبوڵ کردو چویتە فیردەوسی بەرین، ئاخ کێ یە ئەو کارەساتە غەمناکە بە جوبرەئیلی ئەمین ڕاگەیێنێ؟ ئەی خوایە!

ڕوحی فاتمـه بەره بۆ لای ڕوحی پێغەمبەر، خوایەخۆشی دیداری پێغەمبەرم پێ مەرحەمەت کە، ئیلاهی! لە سەوابی لەگەڵ پێغەنبەر بەهرەمەندم کەو لە شەفاعەتی بێ بەشم مەکە، حەزرەتی عایشە (رضی الله عنها) کە هەوری غەم دڵو ڕوحی داگرتبوو،

زمانی ئاوای باسی ئەخلاقی حەزرەت دەکرد، ئاخ! ئەی پێغەمبەرێ کە فەقیریت پێ لە دەوڵەمەندی باشتر بوو، پشتت کردبووە دەوڵەمەندیو ڕووت کردبووە فەقیری، وا حەسەرتا! بۆ ئەو پێغەمبەرە دین پەروەرە کە لە بەر غەمی گوناهی ئوممەتی یەك شەو بە ڕەحەتی نەخەوت، وا وەیلا! بۆ خاوەنی خوڵقی عەزیزم کە هەمیشە لەگەڵ نەفسی ئەممارە شەوو ڕۆژ لە شەڕدا بوو.

وای! بۆ ئەو پێغەمبەرە گەورەیە کە قەت تەماشای شتی مەمنوعی نەدەکرد حەیف بۆ ئەو (رحمة للعالمین)ە کە بارەگای فەیزی هەمیشە بۆ فەقیرو داماوان ئاوڵە بوو، دڵی پڕ نووری هەرگیز بە تۆزو غوباری ئەزیەتی لێڵ نەدەبوو، وا وەیلا بۆ ئەو کەسە دوژمنان ددانی وەك مرواری ئەویان شکاندو ئەو هەر خۆی ڕاگرت، وا حەسرتا! بۆ ئەو کەسەی کە ناو چەوانی بە ویقاری ئەویان بریندار کرد، بەڵام دووبارە ئەو عەفوو کەڕەمی لە دەست نەدا.

### غوسلو کفنی حەزرەت

لە ڕۆژی سێ شەممەدا دەست کرا بە غەسڵو کفن کردنی حەزرەت ﷺ ، فەزلی کوڕی عەبباسو ئوسامەی کوڕی زەید پەردەی بەینی خەڵکەکەو جەسەدی حەزرەتیان ﷺ ئاگاداری دەکرد. نوێنەری ئەنساریان هاتە بەر دەرگاو گوتیان: ئێمە ئامادەین تا ئاخرین جار لە ئەمری خزمەت گوزاری پێغەمبەر ﷺ بەشدار بین حەزرەتی عەلی رضي الله عنه ئەوسی کوڕی خەولی ئەنساری بانگ کرد کە گۆزەیەکی پڕ لە ئاوی هێنابوو، حەزرەتی عەلی رضي الله عنه بەدەنی موبارەکی

## دیمەنی مەرگ

حەزرەتی ﷺ بە سینگی خۆیەوە نابوو، حەزرەتی عەبباس و فەزلی کوڕی ئەم دیو ئەو دیویان پیٚ دەکرد، ئوسامەی کوڕی زەید ئاوی پێدا دەکردو حەزرەتی عەلی دەی شت و دەی گوت: دایکم و باوکم فیدای تۆ بن، بە ڕۆیشتنی تۆ سەروەریەتێکمان لە دەست چوو کە لە پیش تۆدا بە ڕۆیشتنی کەس لە دەستمان نەچووە، ئیمرۆ زنجیرەی نبووەت و ئەخباری غەیبی و نزولی وەحی پچڕاوە، کۆچی تۆ بۆ هەموو موسڵمانێك وەك مووسیبەتە، ئەگەر تۆ ئەمرت نەدەکرد بە سەبرو خەڵکت لە گریان زاری مەنع نەدەکرد زۆرمان فرمێسك دەڕشت، بەڵام دووبارە ئەو دەردە بیٚ دەرمانە نابڕێتەوە، ئەی پێغەمبەر! باوك و دایکم فیدات بن کاتیٚ چوویە بارەگای خوا یادی ئێمەش بکەوەو فەرامۆشمان مەکە.

لەبەر ئەوەی کە حەزرەت ﷺ وەسیەتی کردبوو لە جێگایەکی وای نەنێژن کە خۆشەویستەکانی بیکەنە سوجدەگا لەسەر مەشوەرەتی حەزرەتی ئەبوو بەکر لە حوجرەکەی حەزرەتی عایشەدا کە هەر لەوێدا وەفاتی فەرموو بوو گۆڕێکیان هەڵکەند (طلحە)ی ئەسحابە رضي الله عنه گۆڕێکی لەحەدی هەڵکەند، لەبەر ئەوەی خاکەکە شێدار بوو ئەو جێگایەی لەسەر وەفاتی کردبوو لە ناو قەبرەکەدا ڕایان خست و کاتیٚ هەموو شتێك حازر بوو تەواوی ئەهلی ئیمان بەشداری لە نوێژی جەنازەیاندا شالاویان هێنا، لەبەر ئەوەی جەنازەکەی لە حوجرەکەدا بوو خەڵك دەستە بە دەستەو بە نۆبە دەچوونە حوجرەکەو نوێژیان لەسەر دەکرد، بەڵام لەو نوێژەدا کەس نەبوو بە ئیمام، لە پێشدا خانەوادەی و لە دوای ئەوان موهاجرین و لە پاش ئەوان ئەنسار نوێژیان لەسەر کرد، پیاو بە جیاو ئافرەت بە جیاو منداڵ بە جیا، نوێژەکەی شەو ڕۆژێکی خایاند.

مەعنای وایە لە شەوی چوارشەممەداو سی و دوو سەعات لە پاش وەفاتی نێژرا، حەزرەتی عەلی و فازلی کوڕی عەبباس و ئوسامەی کوڕیٚ زەیدو (عبدالرحمن) کوڕیٚ عەوف خستیانە قەبرەوە، خولاسە ئەو مانگی زانیاری یەو

ئەو ڕۆژی دینـەو ئـەو گـوڵزاری پەرهێزکارانـە لـە پـێش چـاوی خـەڵکی دنیـا ئاوابوو.﴿ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴾

### میراتی حەزرەت

پێغەمبەر ﷺ لەحاڵی حەیاتیدا چی بوو تا ببێتە میرات؟ بە بێ ئەوەش خۆی فـەرمووبرووی: (لا نـرث مـا ترکنـاه صـدقة) واتـە ئێمـەی پێغەمبـەر واریـس و میراتمان نیە، ئەوەی لە پاشمان بەجێ دەمێنێ سەدەقەیە.

بینـا لەسـەر ڕیوایـەتی عـەمری کـوڕی حـویرث لـە کـاتی وەفاتیـدا نـە درهـەم، نـە دینار، نە غولام، نە کەنیزەك، نە هیچی تری لە پاش بەجێ نەما.

ئێـستره سـپیەکە ئەسـلەحەو پارچـەیەك زەوی نـەبێ کردبـووی بـە وەقفـی موسـڵمانان، چـەند شـت لـە ئاسـاری شـتی حـەزرەت ﷺ لـە لای ئەسـحابە مابونەوە، بۆ نمونە حەزرەتی (طلحە) ؓ مووی موبارەکی لا بوو، ئەنەسی کوڕی مالیك ؓ موو و نـەعل و کاسە شکاوێکی داری لا بوو ذوالفقار لە لای حـەزرەتی عـەلی ؓ بـوو، حـەزرەتی عایـشە (رضـی الله عنهـا) لیباسـی کـاتی وەفـاتی لا بوو، مۆری نبـووەت و عەساکەی درا بە حـەزرەتی ئـەبوو بەکر ؓ لەوانەش زیاتر گەورەترین نیعمەت و سـەروەتێك کە لە عەڕشـی عـەزیم بەنرختر بـوو، هەدیـەی نـەوعی بەشـەر کرابـوو ئـەو قورئانـە بـوو کـە حـەزرەت ﷺ لـە بارەیدا فەرموویەتی: ئەی خەڵکینە! شتێکتان بۆ بەجێ دیلم: ئەگـەر دەستی پێ بگرن گومڕا نابن، کە قورئانە، لە بەعزە ڕیوایەتێکدا کە لە کاتی وەفاتیـدا حـەزرەت لـە جوبرەئیلی پرسـی لەپاش من کـێ ئاگـای لـە ئوممـەتم دەبـێ؟ خـوا وەحی کرد بۆ جوبرەئیل کە مژدە بدە بە خۆشەویستی من لە بارەی ئوممەتیـدا نیگـەران نـەبێ، کاتێ خـەڵك لە ڕۆژی حەشـردا زینـدوو دەکرێنـەوە، ئەو یەکەم

## دیمەنی مەرگ

کەس دەبیٚ هەمووشیان کۆبوونەوە ئەو ڕەئیسیان دەبیٚو تا ئوممەتی ئەو نەچنە بەهەشت کەس ناچیٚ، بە بیستنی ئەو قسانە حەزرەت ﷺ فەرمووی:
ئێستا چاوم ڕووناكو خەیاڵم ڕەحەت بوو.
جانم فیدای تو کە تۆ راهست بی گومان
ازمــهد تــا بلحد هیمـــــن فکر امتان
******
گیانم فیدات ئەی محمد کە هەتا ڕۆژی وەفاتت،
لە ئەوەڵ هەتا بەئاخر لە خەیاڵی ئێمەدا بوو،
وصل الله علی سیدنا محمد یوم ولد ویوم مات ویوم یبعث حیا
والسلام علیکم ورحمة الله وبرکاتة

سوپاس بۆ خوا لە تەرجەمەو نووسینی ئەو (دیمەنی مەرگە) بوومەوە لە پێش نیوەڕۆی ڕۆژی یەك شەممەی سیێزدەی مانگی شەعبانی هەزارو چوارسەدو دوازدەی کۆچی، بەرامبەر بە شازدەی دووی هەزارو نۆسەدو نەوەدو دووی زاینی، خوای گەورە بیکاتە مایەی ڕزگاریو سەربەرزی دنیاو دواڕۆژمانو بە ئیمانەوە بژینو بە ئیمانەوە بمرینو لە خزمەت حەزرەتدا ﷺ حەشرمان بکریٚ.
لە کۆتایدا ئەگەر ئێوەی خوێنەرو گوێگری ئەو دیمەنی مەرگە دوعای بەخێر بۆ من بکەن، ئەوە منیش هەر لە ئێستاوە دوعاتان بۆ دەکەمو دەڵێم

ازال الله عنکم کل افة، کنون الجمع فی حال الاضافه
براتان محمدی شلماشی

## سەرچاوەکان


١. قورئانی پیرۆز
٢. صحيح البخاری (محمد بن اسماعيل)
٣. صحيح مسلم (ابو الحسين بن الحجاج)
٤. ابن ابی الدنيا
٥. ابن حبان
٦. المسند (الامام احمد)
٧. الحليه (ابو نعيم)
٨. المشكات الشريف
٩. الترغيب والترهيب (حافظ منذری)
١٠. سنن (ابی داود)
١١. شعب الايمان الحليمی)
١٢. دلايل النبوه
١٣. نوادر الاصول (طبرانی)
١٤. روض الرياحين
١٥. الاحيا (الامام محمد الغزالی)
١٦. صحيح الترمذی (محمد بن عيسی)
١٧. سنن ابن الماجة (محمد بن يزيد)
١٨. ا لديباج شرح الصدور
١٩. تأريخ نيشاپور
٢٠. رشقه الساوی
٢١. جواهر التفسير (طنطاوی)
٢٢. الاتحاف
٢٣. حاشيه الكنز (ابراهيم بصيله)
٢٤. الدر المنثور (جلال الدين السيوطی)
٢٥. لمعات
٢٦. ابن كثير
٢٧. مظاهر الحق
٢٨. الاصابه فی تميز الصحابه (ابن حجر الحسقلانی)
٢٩. تفسير فتح العزيز

# پێرست

پێشەکی دانەر ..... ٥
ئاگاداری ..... ٥
دەرسی یەکەم ..... ١٠
دیمەنی مەرگ ..... ١٠
حیکایەتی کوڕی هارونەڕەشید ..... ١١
دەرسی دووەم ..... ١٧
فەرمایشتی پێغەمبەر لەبارەی مەرگەوە ..... ١٧
فەرمانی خوا لەبارەی مەرگی نینساندا ..... ٢١
دەرسی سێهەم ..... ٢٦
بەسەرهاتی پاشایەك ..... ٢٧
حیکایەتی کابرایەکی پارە زۆر ..... ٢٨
حیکایەتی زاڵمێك ..... ٢٩
فەرمایشتی شیخ حەسەنی بەسری لەبارەی مەرگەوە ..... ٣٠
باسی زاڵمێکی بەنی ئیسرائیل ..... ٣٠
باسی مردنی ئەهل الله ..... ٣١
باسی بت پەرستێك ..... ٣٥
دەرسی چوار ..... ٣٨
باسی کەنیزەکێك ..... ٣٨
دەرسی پێنج ..... ٤٨
حیکایەت ..... ٤٨
حیکایەت ..... ٥٠
حیکایەت ..... ٥٣
حیکایەت ..... ٥٥
حیکایەت ..... ٥٦
دەرسی شەش ..... ٥٩
حیکایەت ..... ٥٩
حیکایەت ..... ٦٣
حیکایەت ..... ٦٥
حیکایەت ..... ٦٨
دەرسی حەوت ..... ٦٩
حیکایەت ..... ٦٩
حیکایەت ..... ٦٩

حیکایەت ........ ٧٢
بۆ هەر جێگایەگ بچی مەرگ دەگاتە ئەوێ ........ ٧٣
باسی ئیزرائیل و هاوکارانی ........ ٧٤
باسی گیان کێشان ........ ٧٥
باسی شتنی مردوو ........ ٧٦
باسی کفنی مردوو ........ ٧٨
دەرسی هەشت ........ ٧٩
چۆنیەتی کفن تێوە پێچان ........ ٧٩
جەدوەلی پارچە کفنەکان ........ ٨٠
لەوازمی دفن ........ ٨٠
بردنی مردوو بۆ گۆڕستان ........ ٨١
باسی نوێژی مردوو ........ ٨٢
نوێژی مردوو ئاوا دەخوێندرێ ........ ٨٣
باسی گۆڕو ناشتنی مردوو ........ ٨٤
باسی زیارەتی گۆڕستان ........ ٨٥
باسی چەند مەسئەلەیەك ........ ٨٧
دەرسی نۆ ........ ٨٩
ئەحوالی بەرزەخ ........ ٨٩
پێشەکی ........ ٨٩
باسی بەرزەخ ........ ٩١
ئەووەلی مەرگ ........ ٩٣
ئەحوالی قەبر ........ ٩٣
ترسی قەبر ........ ٩٥
حیکایەتی عومەری کوڕی ((عبدالعزیز)) ........ ٩٦
دەرسی دە ........ ١٠٠
حورمەتی موسڵمان و بێ حورمەتی کافر لەکاتی مەرگ و دوا مەرگدا ........ ١٠٠
دەرسی یازدە ........ ١١٠
ئەنواعی عەزابی ترسێنەری قەبر ........ ١١٠
دەرسی دوازدە ........ ١٢٠
خۆ ئاشکرا کردنی ئافرەتێك بۆ سزای گوناهێك ........ ١٢٠
باسی فائیدەی سەدەقەی جاریە و دۆعای ئەولاد ........ ١٢١
تەواوبوونی کردەوە بەهۆی مەرگەوە ........ ١٢٨
دەرسی سێزدە ........ ١٣١

